# تەصریفی مەلاعەلی

## بە زمانی کوردی

وەرگێڕانی

مەلا فتح الله مەلا رەسوڵ خەلیفانی

التفسير

١٤٢٦ هەولێر ٢٠٠٥

نـــــاوی کتێـــــب: تەصریفی مەلا عەلی
نـــــاوی وەرگـــــێڕ: مەلا فتح اللە مەلا رسول خەلیفانی
بڵاوکــــــردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
تایتـــلی بـــەرگ: نەوزاد کۆیی
نـــۆرە و ســاڵی چـاپ: یەکەم ١٤٢٦ك – ٢٠٠٥ز
تـــــــیراژ: ٢٠٠٠ دانە
چـــــــاپکردن: چاپخانەی العلا - بغداد

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر/ هەولێر
ژمارە (٥٦٥) ساڵی ٢٠٠٤ ی دراوەتێ

التفسير
هەولێر- شەقامی دادگا- ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥- - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢. ٥١ .٦٠ ٤٦٠ -٠٧٥٠- ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين.

قوتابی زێدە ئازیزو خۆشەویست: دەمەوێ لێرەو لە پێشەکیدا چەند ئامۆژگارییەك پێشکەش بە ئێوەی خۆشەویست بکەم، بەو هیوایە کە سوودی لێوەر بگرن:

١-هیوام وایە ئەو تەمەنەی گەنجێتی خۆتان بە فیڕۆ نەدەن، چونکە گەنجێتی ئەو تەمەنە جوانەیە کە وەك خەزێنەیەکی زۆر پڕبەها وایە تاکو لە دەستت نەچێت بۆی پەشیمان نابێتەوە، بۆیە پێویستە هەمیشە هەموو کاتی جوانی خۆت لە خزمەتی پەیداکردنی علم و زانستت بێت، چونکە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلاْنْسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى﴾ (النجم:٣٩). هەروەها پێغەمبەری سەروەریش دەفەرمووێت ( اغتنم خمسا قبل خمس ) جا یەکێك لەو پێنجانەی پێغەمبەر {ﷺ} دەیفەرمووێت (شبابك قبل هرمك). قوتابی خۆشەویست: دەزانی زۆر ناخۆشە تۆ ببێتە مەلاو ئیجازەی مەلایەتی وەربگریت کەچی وەکو پێویست شارەزاییت لە زانستە شەرعیەکان نەبێت.!

٢- دەخوازم تۆی خۆشەویست تەقوات هەبێت و دڵت پڕ بێت لە خواپەرستیو لە خوا ترسان ، تەواوی ئەندامانی لاشەکەت بە تەواوی بپارێزی لە هەرچی تاوانە، چونکە بە دڵنیاییەوە سەرباری شەرمەزاری خوای گەورە ناتوانی وەکو پێویست لە زانستەکان شارەزا ببێت، ئەوەتە مامۆستای پایەدار ئیمامی شافیعی دەفەرمووێت:

**شكوت الى وكيع سوء حفظي**

**فأرشدني الى ترك المعاصي**

٣- لە ژیانی خوێندنت بە دوای مامۆستای باش و بە تەقواو زانا بگەڕێ چونکە ئیمامی غەزالی دەفەرمووێت: داری خوار سێبەری خوارە.

٣- لە ژیانی خوێندنت بە دوای مامۆستای باش و بە تەقواو زانا بگەڕێ چونکە ئیمامی غەزالی دەفەرموویێت: داری خوار سێبەری خوارە.

٤- هەردەمەو تەنها هاوەڵێتیو ڕەفاقەتی ئەو قوتابیانە بکە کە وەکو خۆت شەیدای فێر بوونی زانستن و هەردەم هەوڵ بۆ فێر بوونی علم دەدەن و لە ژیانی ڕۆژانەش کاری پێ دەکەن، نەکەی ڕەفاقەتی قوتابی تەمبەڵو دوور لە ژیانی زانست دۆستی دەژین، قوتابییەك بە تەقواو لە خواترس و کەسێك کە هەوڵی بە جێهێنانی سوونەتە پیرۆزەکانی پێغەمبەرە، چونکە پێغەمبەر {ﷺ} برادەروو هاودڵی باشی وەکو گوڵاو داناوە کەچی خراپی وەکو دوکانی کورەچی داناوە کە پشکی ئاگرینت لێدەدات.

٥- هەروەها هەردەم لەگەڵ مامۆستات بە ئەدەب و ڕەوشت بەرزبە نەکەی بە هیچ شێوەیەك هەڵسوکەوتی ناشیرین لە بەرامبەر مامۆستاو هاوەڵانت بنوێنیت، هەروەها لە بەرامبەر زاناو پیاوە باشەکانی پێشووش زۆر لەگەڵیان بە ئەدەب و ڕەوشت بەرزبەو بە هیچ شێوەو جۆرێك تانەو تەشەرە لەو مامۆستا بەڕێزانە نەدەیت.

٦- قوتابی خۆشەویست شتێك پێم خۆشە هەر لە سەرەتاوە بیزانیت ئەم زانستانە وەسیلەو هۆکارن بۆ شارەزابوون لە نێوەڕۆکی قورئان و فەرموودە، کەواتە هەرچەندە لەو زانستانە شارەزاو تێگەیشتوو بێت بەڵام ئەگەر دوایی لە قورئان و حەدیس و شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام شارەزا نەبوویت ئەوە ماندوو بوونەکەت بە بەلاشی ڕۆیشت. خۆ ئەگەر هەموو عیلمو زانستەکانیش بزانیت ئەگەر تەقواو شارەزایی لە قورئان و حەدیس و شەریعەتی تێدا نەبێت ئەوە بۆت بە هیچ داناندرێت چونکە تۆ مەبەستی سەرەکیت لە دەستداو نەت توانی بیهێنیتە دی، ئەوەتە پێغەمبەری نازدار {ﷺ} پێمان دەفەرموویێت: من دوو شتم بۆ ئێوە بە جێ هێشتووە کە لە دوای من دەستی پێوە بگرن (كتاب الله وسنتي). هەروەها شاعیر دەڵێت:

**لو كان العلم بدون التقى يزيد في الشرف**

**لـــكـــان أشـــرف خلـــق اللـــه ابليس**

ئەگەر دەتەوێت زیاتر لەو بوارە شارەزا ببیت ئەوە کتێبی (احیاء علوم الدین)ی ئیمامی غەزالی و بەرگی یەکەمی مەجموعی ئیمامی نەوەوی بخوێنەوە.

لە کۆتاییدا خۆشەویست و برا بەڕێزەکانم داوای دوعای خێرتان لێ ددکەم و هیوادارم لەو هەڵانەشمان ببورن، چونکە بەندە خۆی بە شیاوی ئەوە نازانێت کە تەنها لاپەڕەیەك لە سەر بچوکترین باس بنووسێت، چونکە ئیمامی سەبوکی لە فەرموودەیەکی دەفەرمووێت: ئەوەی بیەوێت کتێبەك بنوسێت پێویستە (٣) سێ خاڵی تێدا بێنە جێ:

**یەکەم:** کات و شوێنەکی گونجاوی هەبێت.

**دووەم:** دەبێت عیلم و شارەزایی لەو کتێبە یان لەو باسە هەبێت کە دەیەوێت بینوسێت.

**سێیەم:** دەبێت وەرع و تەقوای خوای گەورەی لە دڵو دەروون جێگیر بووبێت.

بەڵام کە تەماشام دەکرد زۆر لەو مامۆستا بەڕێزانەی کە زۆر زاناو خاوەنی زانست بوون لەگەڵ ڕێزمدا خۆیان خەریك دەکرد بە نووسینەوەی نامیلکەیەك هەرچەندە هەر خزمەتەو قەدرو پایەی خۆی هەیە، بەڵام دەبوایە ئەوان خۆیان بە شتی زۆر لەوە بەرزتر خەریك بکردبا، چونکە وامان چاودڕوان دەکرد ئەو بەڕێزانە خۆیان سەرقاڵی ئاسانکردنی یەکێك لەو کتێبانە بوونایە کە ساڵەهای ساڵە قوتابییانی حوجرەو مزگەوتەکان دەیخوێنن و بەرنامەی ڕۆژانەی خوێندنیانە کە لەبەر گرانی هەندێك لەو کتێبانە لەوانەیە زۆریان هەر سوودی لێوەرنەگرن. جاری واش هەبووە لەبەر مامۆستاکە قوتابی سوودی لێ وەرنەگرتووە، ئەگینا من کەسێك نیم ئەو سێ مەرجانەم تێدا بن.

هەروەها لەبەر چەند هۆیەکی دیکەش دەستم دا قەڵەم و ویستم ئەو کاتە جوانەم لێ بە بەلاش نەڕوات ئەو چەند لاپەڕە شڕو هوڕدم نوسین. بۆیە من ناڵێم کە ئەو کتێبەم کردۆتە کوردی ئەگەر پێم نەڵێن تێکی داوە. بۆیە داوا لە قوتابیە

خۆشەویستەکان دەکەم لێم ببورن و بە پێی توانا ئەو هەڵە زۆرانەی کردوومن راستیان بکەنەوە.

لە کۆتایی رووم دەکەمە خوای گەورەو: خوایە بۆ خاتری ناوە جوانەکانت ئەم شەریعەتەی ئیسلام هەر پایەدار بکەیت، مامۆستاو قوتابیان و سەرجەم موسڵمانان سەربەرزو ڕوو سووری دونیاو دوا رۆژ بکەیت لە هەموو جیهان بە تایبەتی گەلی کوردی موسڵمان، خوایە هەموو گوندو شارەکانمان بە دەنگی الله أکبر و ئالی بابەی فەقێیان ئاوەدان کەیتەوەو ئەو دەنگە خۆش و جوانە وەکو پێشان لە هەموو شوێنەك بزرەنگێتەوە... آمین.

## لە بارەی ئەو زانستەوە

**یەکەم:** ئەم زانستەی لەو کتێبە باسی لێوە دەکرێت ناوی عیلمی صەرفە.

**دووەم:** یەکەم کەس کە ئەو زانستەی داناو بناغەی رێکخست هەندێك دەڵێن ئەوە ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە، بەڵام هەندێکی دیکە دەڵێن: یەکەم کەس ناوی (معاذ بن مسلم الهراء)ە.

**سێیەم:** پێناسەی ئەو زانستە وەك لە کتێبیشدا دەگوترێت: تحویل المصدر المجرد.... واتە: وەرگێران ونەقڵ کردنی مەصدەری فیعلی موجەرەد بۆ لای چەند نمونەو میسالی جۆراو جۆر.

**چوارەم:** موضوع ئەو شتانەی لەو کتێبە باس دەکرێن (الألفاظ العربیة من حیث الاعلال والادغام والصحة والأصالة والزیادة.....

واتە ئەم عیلمە باس لە وشەکانی زاراوەی زمانی عەرەبی دەکات لە رووی ئیعلال کردن ودەغم و سالم و غەیرە سالم و ئەصل و زیادە......

**پێنجەم:** فائیدەو سوودی ئەو زانستە بریتیە لە: صون اللسان عن الخطأ فی المفردات. واتە: سوودەکەی بریتییە لە: پاراستنی زمان لە هەڵەی وشەکانی تاك.

**شەشەم:** استمداده من کلام الله تعالی وکلام رسوله {ﷺ} وکلام العرب. ئەم عیلمە هەڵێنجراوە لە فەرموودەکانی قورئان و حەدیسە پیرۆزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وە لە زمان و زاراوەی عەرەبەکانیش.

**(ئاگاداری)**

لە دواوەو کۆتاییدا باسی هەندێك لەو زاراوە کوردیانەمان کردووە کە لێرەوە بەکارهاتون.

(**بسم الله الرحمن الرحيم**) بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان، (**الحمد لله رب العالمين**) هەموو حەمدو سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە دروستکەرو بەخێوکەری هەموو بوونەوەرێکە، (**والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وآله أجمعين**) درووودو سەلام بڕژێ لە لایەن خودا بۆ سەر چاکترین و گەورەترینی دروستکراوانی خوا کە ناوی پیرۆزی موحەمەدە، وە هەروەها درووودو رەحمەتی خوا بڕژێ وەکو بارانی بەهاران بەسەر خزمە موسڵمانەکانیو یارو یاوەرانیو هەموو ئەو کەسانەش کە شوێنکەوتەی ڕێبازە پیرۆزەکەیەی ئەون تاکو ڕۆژی دوایی. (**أما بعد**) لە پاش پێشکەشکردنی سوپاس بۆ خوای میهرەبان و داوای درووودو سەلام بۆ گیانی پاکی پێغومبەری پێشەواو یارو یاوەرانی. (**فيقول الفقير الى الله الغنى على بن الشيخ حامد الأشنوى**) دەڵێت: ئەم هەژارەی کە هەردەم پێویستی بە خوای باڵا دەست و دەوڵەمەند هەیە کە ئەم فەقیرە ناوی عەلی کوڕی شێخ حامیدی ئەشنەوییە،واتە خەڵکی شاری شنۆیە کە شارێکە دەکەوێتە کوردستانی ڕۆژهەڵات {کوردستانی ئێران} (**لما كان تصريف الزنجانى أحسن المختصرات في هذا الفن ترتيباً**) دەفەرمووێت: کاتێك دیتم ئەو کتێبە کە ناوی تەصریفەو دانراوی شێخ ئیبراهیمی زەنجانییە جوانترین کتێب بوو لە کتێبە کورتەکانی عیلمی صەرف لە رووی تەرتیبەوە، واتە: هەر باسێك لە باسەکانی لە شوێنی شایستەی خۆی داندرا بوو، (**وأولاها للمبتدئين تقريبا**) وە ئەم مەتنە تەصریفە لە هەموو کتێبە کورتەکان ئاسانترو شایستەتر بوو بۆ قوتابیانی تازەو سەرەتایی کە زۆر باش لێی تێدەگەیشتن... جا لێرەدا کەسێك لە وانەیە رەخنە بگرێت و بڵێت: مادامە ئەو تەصریفە ئەوەندە جوان و باش و بێ عەیب بوو ئەی ئەو هەموو ماندوو بوون و

دەستکاریەت لە چی بوو؟، ئەویش وەڵام دەداتەوەو دەفەرموویت(**لكن ما كان وافيا بتمام ما لابد لهم منه**) بەڵێ کتێبێکی باشە بەڵام ئەم تەصریفە وەفادارو بەجێهێنەری هەموو قاعیدەکان نەبوو، کە قوتابی پێویستی پێیان هەیە، چونکە قاعیدەکان بناغەی عیلمن، (**ولا كافيا بجميع ما لايستغنون عنه**) وە ئەم تەصریفە کافیو کۆکەرەوە نەبوو بۆ هەموو ئەو باس و مەسئەلە وردانەی کە هەرگیز قوتابی لێیان دەوڵەمەند نابێ، بەڵکو هەموو کات پێویستیان پێی هەیە، (**أردت أن أضم اليه ما يتمم فوائده**) جا لەبەر ئەم دوو شتانە ویستم کە چەند قاعیدەو بنچینەی وەها بلکێنم بەو تەصریفە کە بە سوودەکەیان سوودو قازانجی ئەم تەصریفە تەواو بکەن , کەم و کوڕی تێدا نەمێنن، (**وأزيد عليه ما يعمم فرائده**) وە هەروەها ویستم زیاد بکەم لە سەر تەصریفی زەنجانی چەند وشەیەکی وەها کە هەریەکەی بە وێنەی دوڕ وانە، بەمەش هیچ کەم و کوڕی تێدا نامێنێ و سوودەکی تەواو دەبێت، (**مع نسخ بعض عباراته**) وە ئەم کارەم دەکرد لەگەڵ سڕینەوەو لابردنی هەندێك لە عیبارەت و نوسراوی ئەم تەصریفی زەنجانییە، (**آتيا بخير منها**) جا حاڵم وابوو هەرکە شتێکم لادەبرد شتێکی باشترم لە شوێنی دادەنا، (**وتبديل قواصر كلماته شاغلا بأشمل عنها**) وە خەریك بووم وشە کورتەکانم دەگۆڕین یەکی پڕ مەعناترم لە جێی دادەنا، جا بەو

هەموو دەستکارییە ئەم تەصریفە وای لێهات کە هیچ کەم و کوڕی تێدا نەمێنێت، چونکە ئەگەر وانەبێت ئەم ماندوو بوونە هەمووی بەلاش دەڕوات. لە دوای ئەم هەموو مەدح کردنی کتێبەکەی سەری خۆی بەرز دەکاتەوە بەرەو ژوورو ملی خۆی کەچ دەکات بۆ ئەوەی دان بنێت کە من هیچ نیم و ئەوەی دەیزانم هەمووی لە لای خوای کار بەجێ و باڵا دەستە بۆیە دەڵێت: (**مستعينا بخير من به يستعان**) داوای یارمەتی دەکەم لە کەسێك ﷻباشترین زاتە داوای یارمەتیو پشتگیری لێ بکرێت کە ئەویشیان زاتی خوای گەورەیە، (**ومستفيضا من الحكيم المنان**) وە هەروەها داوای سەرکەوتن و ڕژاندنی ڕەحمەت دەکەم لەم خودایە کە کار بەجێو

خاوەنی نیعمەتی گەورەیە بۆ بەندەکانی (**فانه الولی للافضال والاحسان**) چونکە هەر ئەو خوایە خاوەنی دەسەلاتە بۆ رژاندنی رەحمەت و چاکە کردن لەگەڵ عەبدو بەندەکانی.

ئنجا هاتە سەر ئەوەی بۆ مان باسی وشەی تەصریف بکات لە زاراوەی عەرەبیدا وە هەم لە زاراوەی زانایانی عیلمی صەرف جا فەرمووی (**اعلم أن التصريف في اللغة التغيير**) بزانە ئەی قوتابی وشەی تەصریف کە لە پێنج پیت (حرف) پێك هاتووە لە زاراوەی عەرەبیدا بە واتای گۆڕاندنە، (**وفي اصطلاح أهل هذه الصناعة**) تەصریف لە لای زانایانی ئەو صنعەتە کە عیلمی صەرفە (**لا اسما لها**) بەو مەرجە ناو نەبێت بۆ عیلم و صنعەتەکە (**تحويل المصدر المجرد في المشتقات**) وشەی تەصریف بە مانای وەرگێڕان و نەقڵ کردنی مەصدەری فیعلێکە کە رووت بێت لە حروفی زیاد بۆ پێکهێنانی چەند موشتەقاتێك جا ئەو مەصدەرە وەکو فیعلەکە رووت بێت وەکو (جلس) یان نا وەکو (جلوس) (**الى أمثلة مختلفة هيئاتها**) جا ئەم مەصدەرەش کە وەردەگێڕدرێت بۆ لای چەند میسالێکی جیا جیا، جا کە لێك جیان بەسەرو ژێرو بۆرو زەنئەو زیادو کەمی پیتەکان وەکو (ضرب ويضرب وضارب ومضروب....هتد) (**بلا واسطة كما في الماضى**) وەرگێڕانی مەصدەریش بۆ لای میسالەکان یان راستەوخۆیە وەکو وەرگێڕانی فیعلی -ماضی- واتە راستەوخۆ لە مەصدەری وەردەگیرێت (**أو بها كما في غيره**) یان وەرگێڕانەکە بە واستەیە ، واتە: راستەوخۆ لە مەصدەری وەرناگیرێت بەڵکو شتێك لە نێوانیان هەیە وەکو لە غەیری فیعلی -ماضی- کە فیعلی -مضارع- و اسم الفاعل ...هتد) جا بزانین ئەم گۆڕانە بۆ چییە؟ (**لتحصيل معان مقصودة**) بۆ پەیداکردن و بە دەستهێنانی چەند مانایەکی مەبەست و پێویستە کە (**لا تحصل الا بها**) کە ئەم مانایانە پەیدا نابن تەنها بەم میسالانە نەبن، بۆ وێنە ئەگەر کەسێك لە کەسێك بدات ئەوا دەبێتە -ضارب- واتە لێدەر هەبێت لەگەڵ -مضروب- واتە لێدراو لەگەڵ -مضرب- واتە ئامێری لێدان، خۆ ئەگەر ئەو میسالانە نەبوونایە ئەوە بە تەنها بە

مەصدەری پێك نەدەهاتن، (**فاذاً صار علم هذا التحويل ضروريا**) لە بەر ئەوەی کە مانایەکان نابن بەبێ میسالەکان وە میسالەکانیش نابن بە بێ وەرگێڕان کەواتە وای لێهات زانین و شارەزا بوون بەم گۆڕانە بوو بە ناچاری و پێویست.

(**ثم اعلم**) لە پاش زانینی مانای تەصریف و مەبەست لە وەرگێڕانی مەصدەری بزانە ئەی قوتابی (**أن أصول الأسم تكون ثلاثة لا أقل**) بەڕاستی پیتە ئەصلەکانی —اسم—ی سێ دەبن و نابێت لە سێیان کەمتر بن وەکو -فلس- ، مەبەست لە ئیسم -اسمِ معرب-ە پیتێکیان بۆ دەست پێکردن یەکیش بۆ لەسەر وەستان یەکیش لە نێوان هەردووکیانە.

**تێبینی :**

ئەو جۆرە ئیسمانەی کە دوو حەرفین وەکو —ید، دم، أخ، أب....- ئەمانە سێ پیتی بووینەو بە هۆی ئیعلال کردن یەکیان حەزف کراوە، کەواتە: ئەوانەش دوو حەرفی نەبووینە. وە ئەو ئیسمانەش کە مەبنینە وەکو — مَن، ذا....- لەم کتێبە باسیان ناکەین کەواتە ئەوانیش نابنە هۆی رەخنە چونکە مەبەست لە ئیسم ئیسمی موعرەبە. (**وأربعة وخمسة لا أزيد**) واتە: پیتە ئەصلەکانی ئیسمی چوارو پێنجیش دەبن وەکو —**جعفر**، سفرجل- بەڵام لەوە زیاتر نابێت چونکە ئەگەر ببێتە شەش وا گومان دەبرێت کە دوو ئیسمن لێکدراون. (**والفعل تكون ثلاثة لا أقل**) پیتە ئەصلیەکانی فیعلیش سێ دەبن وەکو —ضرب- لەوەش کەمتر نابن (**لضعف البنية**) چونکە فیعل زۆر گۆڕانکاری دێتە سەر ئەگەر لە سێ کەمتر بێت ئەوا لاواز دەبێت و گۆڕانکاری قبول ناکات.

**تێبینی :**

ئەو فیعلانەی کە وا دیارن لە (٣) سێ پیت کەمترن وەکو -عد، قِ- ئەوانە لە ئەصلدا سێ پیت بووینە بەڵام کە ئیعلال کراون بوونەتە ئەوەندە.

(**وأربعة لا أزيد**) فیعل چوار پیتیش دەبێت وەکو —دحرج- بەڵام لە چواران زیاتر نابێت (**لثقل معناه**) چونکە فیعل ماناکەی گرانە لەبەر دەلالەت کردن لەسەر سێ

شت {-حدث- واتە ڕووداو -نسبة- واتە پاڵدان بۆلای فاعیل -زمان- واتە ئەو کاتەی فیعلەکە دەلالەتی لەسەر دەکات} جا ئەگەر لە چوار پیت زیاتر بێت ئەوە ماناکەشی گران دەبێت لەئەنجام گران دەکەوێتە سەر گران (**ولأن الاسم أصل والفعل فرع**) بەڵگەی دووەم ئەوەیە کە ئیسم ئەصلە وە فیعل فەرعە نابێت بگاتە پلەی ئەو، بەمەش هیچ جیاوازی لە نێوان ئەصل و فەرعی نابێت. بۆیەش ئیسم بە ئەصل داندراوە چونکە ئیسم بە تەنها کەلامی پێ تەواو دەبێت چونکە دەتوانێت ببێتە - المسند والمسند الیه- کەچی فیعل بەبێ ئیسم کەلامی پێ تەواو نابێت، وە فیعلیش لە ئیسم وەردەگیرێت. جا ئەوەی گوتمان لە بارەی پیتە ئەصلیەکان بوو بەڵام پیتە زیاد کراوەکان لە ئیسمدا لەگەڵ پیتە ئەصلیەکان دەگەنە حەوت و هەشت پیتیش وەکو -استخراجا، قرعبلانة- وە فیعلیش بە پیتە زیادەکانی دەگاتە شەش پیت وەکو -استخرج، احرنجم- (**وكل واحد منهما اما مجرد أو مزيد فيه**) وە هەریەك لە ئیسم و لە فیعل یان -مجرد-ە ؛ واتە: ڕووت دەبێت لە پیتەکانی زیاد- مزید فیه- واتە: حروفی زیادی پێوە لکاون، کەواتە لێرەدا بوون بە چوار بەشەوە:

١- ئیسمی موجەرەد وەکو: ضَرب. ٢- ئیسمی مەزید وەکو: اکرام. ٣- فیعلی موجەرەد وەکو: ضَرَبَ. ٤- فیعلی مەزید وەکو: أكْرَمَ. (**وكل واحد منهما اما سالم أو غير سالم**) هەریەکێك لەم چوارانە یان -سالم-ە یان -غیر سالم-ە، جا لێرەدا بەشەکانی فیعل دەبن بە هەشت بەش و ئیسمیش بە دوانزە بەش، (**ونعني بالسالم ما سلمت حروفه الاصلية**) ئێمە زانایانی عیلمی صەرف مەبەستمان بە سالمی وشەیەکە حروفە ئەصلیەکانی خاڵی بن لە پیتەکانی -علة-و -همزة-و - تضعیف- واتە دووبارە بوونەوەی پیتێك کە لەمەودوا باسیان دەکەین -ان شآءالله- (**التی تثبت في جميع تصاريف الكلمة**) پیتی ئەصلی ئەوانەن کە لە هەموو گۆڕانکارییەکانی کەلیمە هەر مەوجود بن و بمیننەوە، (**لفظا أو تقديرا**) جا کە مەوجودن (یان دیارن) وەکو -نَصر- ئێستا ئەم سێ پیتە -ن، ص، ر- لەم فیعلە ئەصلن چونکە لە هەموو گۆڕانکارییەکاندا -لفظا- دیارو مەوجودن، یان -تقدیرا-

واتە: بە فەرز کردن مەوجودن وەکو: -قَوْلاً- ئێستا ئەم سێ پیتە -ق، و، ل- لە هەموو گۆڕانکارییەکاندا هەنە بەڵام بە تەقدیری چونکە هەندێك جارە واوەکە دەکرێتە ئەلف وەکو -قال-، وە هەندێك جار دەکرێتە یاء وەکو -قیل- وە هەندێك جار لا دەبرێو حەزف دەکرێت و -ضمة- دەلالەتی لەسەر دەکات وەکو -قُلْتُ- وە هەندێك جاریش خۆی مەوجودە وەکو -يَقُولُ- کەواتە واو لێرەدا بە پیتەکی ئەسلی دەژمێردرێت. جا ئەوەی گوتمان پێناسەی یەکەم بوو بۆ پیتە ئەصلییەکان، پێناسەیەکی دیکەش ئەوەیە کە دەفەرموویت (**وتقابل بالفاء والعين واللام**)پیتە ئەصلیەکان ئەوانەن کە بەرامبەر دەکرێن بە {فێو عەین و لام} لە -فَعَلَ-ەی بۆ نمونە دەڵێن: -نَصَرَ- لەسەر وەزنی -فَعَلَ-ەیە، نون فاء الفعلە وە صاد عين الفعلە وە راء لام الفعلە چونکە بەرامبەری -لام-ە، ئەو -فَعَلَ-ەیە پێی دەگوترێ میزان واتە پێ هەڵکێشراو وە ئەو صیغانەش کە بەرامبەری دەکرێن وەکو - نَصَرَ، وعلِم- ...... پێیان دەگوترێ مەوزون واتە هەڵکێشراو، (**مكررا بحسب زيادة الاصول على على الثلاثة**) حالی لام وایە دووبارە دەبێتەوە بە ئەندازەی زیاد بوونی پیتە ئەسلیەکان لە سەر سێ.واتە ئەگەر پیتە ئەسلیەکان بوون بە چوار پیت ئەوا جارەکیان لام دووبارە دەبێتەوە، وەکو: -دَحرَجَ- یان -جَعفَرَ- میزانەکەی لەسەر وەزنی - فَعلَلَ-، وە ئەگەر پیتەکان بوون بە پێنج لام سێ بارە دەکرێتەوە وەکو: -سَفَرجَلَ- میزانەکەی دەبێتە -فَعَلَلَل- وە پیتەکانی ئەسلی لەمە زیاتر نابن. جا با بگەڕێینەوە سەر باسی سالمی (**من حروف العلة والهمزة والتضعيف**) واتە: سالم ئەوەیە کە پیتەکانی سالم و خاڵی بن لە پیتەکانی عیللە کە بریتین لە {ا ، و، ی} ئەلف و واوو یاء وە هەروەها هەمزەو دووبارە بوونەوە {الهمزة والتضعيف} کەواتە هەر وشەیەك یەك لەو پێنجانەی تێدا بێت بە غەیرە سالم دەژمێر درێت، بۆ نمونە: {وعد، يسر، سئل ،مدد، زلزل} ئەمانە بە سالم ناژمێر درێن بە یارمەتی خوا لە دوایی باسیان دەکەین. لێرەدا مصنف رەحمەتی خوای لەسەر بێت ویستی لە یەك کاتدا سالم و

غەیرە سالم لە یەکتر جودا بکاتەوەو وە دوو پێناسەشی بۆ پیتە ئەسلیەکان کردتاکو بکرێ پیتە ئەسل و زیادەکان لێك جیا بکرێنەوەو بناسرێن.

**روونکردنەوە:**

لەوەی رابردوو بۆمان دەرکەوت هەر وشەیەك ئەم شتانەی تێدا بێت کە کە دەبنە هۆی غەیرە سالم بەڵام ئەگەر ئەوانە ئەسلی نەبوون ئەوە هەر بە سالم دەژمێردرێت وەکو: {اجلوز، وأكرم} وە ئەگەر هاتوو وشەیەك ئەوانەی تێدا بن بەڵام بە هۆی ئیعلال لاچوو بن ئەوا هەر بە غەیرە سالم دادەندرێن وەکو: { قُلْتُ} کە ئەسلەکەی {قولت} بووە یان وەکو {ظلت} کە ئەسلەکەی {ظللت} بووە.

جا مصنف رەحمەتی خوای لێ بێت باسی پیتە ئەسلیەکانی کرد کە چۆن پێناسە دەکرێن و بەرامبەری فێ‌و عەین و لامی {فَعَلَ} یان پێدەکرێ. ئێستاش دەیەوێت باسی پیتە زیادەکان بکات کە چۆن هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەکرێت. جا فەرمووی **(ويعبر عن الزائد بلفظه)** واتە:-تلفظ- بە زوبان دەردەبڕی لە میزانی لە جیاتی ئەو پیتەی کە زیاد کراوە لە مەوزونی بە لەفزی پیتە زیادەکەی واتە: چ پیتەك لە مەوزونی زیاد کراوە هەمان پیت لە میزانی زیاد دەکرێت،÷ بۆ نمونە —أنصر- لەسەر وەزنی —أفعل- چۆن لە —أنصر- هەمزە زیاد کراوە بە هەمان شێوە لە —أفعل- هەمزە زیاد دەکرێت هەروەها —-استنصر-وەکو -استفعل- یان —ضارب- وەکو —فاعل-.......هتد ئەمە خاڵێکی گرینگە بۆ لێك جیاکردنەوەی پیتە ئەسلی‌و پیتە زیادەکان جا ئەم بنەمایەیە {قاعدة} لە هەموو شوێنەك بەم شێوەیەیە مەگەر لە دوو شوێن نەبێت ئەویش بابی —افتعال- و هاو وێنەکانیەتی جا بۆ جیاکردنەوەی ئەوانیش فەرمووی **(إلا المبدل من تاء الأفتعال ونحوه)** تەنها لە تائی بابی —افتعال- و هاو شێوەکانی نەبێت واتە لە هەموو شوێنەك —تلفظ- دەکرێ لە میزانی بە هەمان ئەو لەفظەی لە مەوزونی زیاد کراوە تەنها ئەو پیتە نەبێت کە لە جیاتی (ت)ی بابی {افتعال، تفعل، تفاعل} نەبێ هەم لە نونی بابی {انفعال}یش نەبێت لە هەندێك شوێن لەم بابانە پیتێك لە مەوزونی زیاد کراوە لە میزانی ئەم پیتە نییە بۆ

نمونه —اصتلح- لەسەر وەزنی —افتعل-ەیه، زیادکراوەکان هەمزەو تائە پاشان تائەکە لە —اصتلح- دەکرێتە —طاء- دەبێتە {اصطلح} بەڵام لە میزانی هەر وەکو خۆیەتی، ئەوە لێرەدا {ویعبر عن الزائد بلفظه....} نەهاتە جێ، ئەمە لەمەودوا باس دەکرێت —ان شآء الله، (**فانه بالمبدل منه**) لەم شوێنانە تلفظ و تەعبیر بە بەدەلی نییە کە ئەم پیتەی تازە هاتووە کە طاء بوو، بەڵکو بە {مبدل منه}وەکەیە، کە دەکاتە ئەو پیتە لە پێش ئیعلال کردن هەبوو دە دەکاتە —ت- واتە بە —ط- لێنادرێتەوە بەڵکو بە —ت- لێدەدرێتەوە، دووەم شوێن کە لەم بنچینەیەیان جیا دەکاتەوە (**والا المكرر للالحاق أو غيره**) مەگەر لەم شوێنانە نەبێت کە دووبارەیە جا ئەم دووبارەیەش چ بۆ الحاق بێت ،واتە: پیتێك لەسەر وشەیەك زیاد بکرێت تا بچێتە سەر وەزنی وشەیەکی دیکە، وەکو —جَلبَبَ- لێرەدا بائی دووەم زیاد کراوە تا الحاقی بکەیت بە —دَحرَجَ-ەی، یان وا دەبێت دووبارەی دەکەیتەوە بۆ بۆ غەیری الحاق وەکو —فَرَّحَ- کە ڕێی دووەم زیاد کراوە بۆ تکثیر، (**فانه بما تقدمه**) لەم دوو شوێنە واتە کە بۆ الحاق و غەیری الحاق زید دەکرێت تەعبیری پیتە زێدەکەی بە گوێرەی پیتی پێش خۆیەتی کە پیتە ئەسلەکەیە جا ئەم پیتەی پێشەوە {لام الفعل} بێت یان {عین الفعل} بێت نمونەی {لام الفعل} وەکو —جَلبَبَ- لێرەدا بائی یەکەم {لام الفعل}ە لە میزانەکەی تەعبیری بە لام لێدراوەتەوە وە بێی دووەمیش هەر بە لام لێدەدرێتەوە، واتە لە -جَلبَبَ-ەی دەگوترێ لەسەر وەزنی —فَعلَلَ-ەیە نەك لەسەر وەزنی —فَعلَبَ-ە واتە بە هەمان لەفظی خۆی نییە بەڵکو بە لەفظی پێشە خۆیەتی. وەنمونەی {عین الفعل} وەکو —فَرَّحَ- لێرەدا -ر-ێی دووەم زیادە بەڵام تەعبیری وەکو ڕێی ئەسلەکەیە {عین الفعل}ە، جا دەڵێین: -فَرَّحَ-لەسەر وەزنی —فَعَّلَ-یەبە شدەی گرانکردنی عەینەکەیە نەك لەسەر وەزنی —فَعرَلَ- بێت. جا لەم دوو شوێنەدا تلفظ بە لەفظی پیتە زیادەکە نەبوو بەڵکو بە وێنەی پیتە پێش خۆی بوو. یەکێك پرسیار دەکات : ئایا مکرر هەموو کات بەو شێوە بە پیتی پێش خۆی لێدەدرێتەوە؟ ئەویش وەڵام دەداتەوەو دەفەرمووێت (**الا اذا عدم ذالك الوزن أو ندر**) مەگەر لە دوو شوێن

وانەبێت، یەکەم: {مکرر} دووبارەیەك کە لە زمانی عەرەبی هیچ وشەیەك لەسەر ئەو وەزنە نەبێت. دووەم: وشە لەسەر ئەو وەزنە هەبێت بەڵام بە کەمی، لەم دوو شوێنە کە گوتمان {مکرر} دووبارە بە لەفظی خۆی تەعبیر دەدرێت نەك بە پیتی پێشە خۆی، نمونەی یەکەم وەکو -بُطْنان- لێرەدا نونی دووەم مکررەو زیادە ئەگەر بە گوێرەی ئەم یاسایە بێت وەزنەکەی دەبێتە -فُعلال- چونکە نونی یەکەم چۆن تەعبیر دەدەرێ دەبوایە نونی دووەمیش وا تەعبیر درابا، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ وشەیەك نییە لەسەر وەزنی -فُعلال- واتە چوار پیتی ئەسلی هەبێت و دووبارەش نەبێت، جا لەبەر ئەوە ناچار بووین ئەم دووبارە {مکرر}ە زیادە بە لەفظی خۆی تەعبیر بدەینەوە نەك بە پیتی پێش خۆی واتە دەڵێین: میزانەکەی -بُطْنان- -فُعلان-ە نەك -فُعلال- بێت. نمونەی دووەمیش ئەوەیە کە باسی دەکەین (**کسحنون بفتح السين فانه فَعلون لندور فَعلول**) وەکو -سَحنون- بە فەتحی سینی بخوێنەوە، ئێستا -سَحنون- نوونی دووەمی دووبارەیەو زیادیشە قاعیدە وا بوو تەعبیر بە پیتی پێشە خۆی بی واتە میزانەکەی -فَعلول- بێت، بەڵام لەبەر ئەوەی - اِسم- ناو لەسەر وەزنی -فَعلول- واتە: چوار پیتی بیەو هەر چواریان ئەسلی بن کەمە، جا ناچار بووین کە تەعبیرەکەی بە لەفظی خۆی بێت نەك بە پیتی پێشە خۆی بێت، جا دەڵێین: میزانی - سَحْنُون- -فَعلون-ە نەك -فَعلول- بێت، چونکە إسم لەسەر ئەو وەزنەی کەمە. (**وهو صَعْفوق وخرنوب**) ئەو دوو ئیسمە چوار پیتینەو هەر چواریشیان ئەسلن، بێگومان میزانی ئەو دووانە {فَعْلول}ە چونکە لە پێشان گوتمان ئەگەر پیتی ئەسلی بوون بە چوار لام دووبارە دەبێتەوە، بەڵام چونکە کەمە حیسابی نەبوونی بۆ دەکرێت، کەواتە: {سَحْنون} بە لەفظی خۆی لێدەدرێتەوە نەك بە پێشە خۆی.

(**ويتبع الميزان الموزون في القلب المكاني وفي الحذف**) واتە: میزان تابیع و شوێنکەوتەی مەوزونە لە دوو شوێن: **یەکەم:** لە {قلب المكان} واتە: هەر پیتەك پاش و پێشی پێ بکرێ لە مەوزونی ئەوا یەکسەر بە تەبەعیەتی ئەو لە میزانیش دەکرێت، بۆ نمونە {يَئِسَ} لەسەر وەزنی {فَعِلَ}دیە ئەگەر هەمزەکەی بێنینە پێش

دەبێتە {أَيِسَ} وە میزانەکەشی دەبێتە {عَفِلَ} چونکە هەمزەکەی {عين الفعل} بوو ئێستا هاتۆتە شوێنی {فاء الفعل} وە میزانەکەشی بە هەمان شێوە. **دووەم:** لە {حذف}دا واتە: هەر پیتەك لە مەوزونی لابدرێ دەبێ لە میزانیش لابدرێ وەکو: {قاضٍ} ئەسلەکەی {قاضِيٌّ} لەسەر وەزنی {فاعِلٌ} بوو، پاشان –یاء-ەکە لادرا بوو بە {قاضٍ} میزانەکەش بووە {فاعٍ} -لام الفعل- لە هەردووکیان لادرا وەهەروەها {قُلْ} لە {قول} میزانەکەی {فُلْ } چونکە {عين الفعل- نەماوە {عِدْ} لە وە {وِعْدَة} میزانەکەی میزانەکەی {عِلْ} چونکە {فاء الفعل}ی نەماوە **(إلا أن يقصد بيان الأصل فيهما)** واتە: میزان شوێنکەوتەی مەوزون دەبێت لەم دوو شتانە مەگەر مەبەست بەم مەوزونە دەرخستن و روونکردنەوەی ئەسلەکەیان بێت جا لەم دوو کاتە میزان وەکو مەوزون نابێت، بۆ نمونە: دەڵێین: وەزنی {أَيِسَ}ەی {فَعِلَ}ەیە نەك {عَفِلَ}ە چونکە مەبەستمان ئەسلەکەیە بۆ میزانەکەی، یان دەڵێین: وەزنی {قاضٍ} {فاعِلٌ} چونکە مەبەستمان میزانەکەی ئاسلەکەیەتی.

## باسی ئەو بابانەی سێ پیتی رووتن

لە پێشان زانیمان کە فیعل ثلاثیو رباعیو مزیدو مجردی هەیە کە هەمووی دەبن بە چوار بەش کە لە {ثلاثی مجرد} دەست پێدەکات و دەفەرموویت **(أما الثلاثي المجرد فأبنية ماضيه فَعَلَ وفَعِلَ وفَعُلَ)** واتە: ئەو بەشە فیعلەی کە سێ پیتە –ثلاثي- وە رووتە –مجرد- لە پیتی زیاد سێ میزانی هەیە، یەکەم: {فَعَلَ} بە فەتحی {عين الفعل}ەکەی و دووەم {فَعِلَ} واتە بە -کسرة- لە ژێری {عين الفعل} وە سێیەم {فَعُلَ} بە {ضمة}ەی {عين الفعل}ەکەی. دوای ئەوە دێتە سەر بیناکانی {مصدر} چاوگی ثلاثی مجرد جا فەرمووی **(وأبنية مصادره)** واتە: بینایەکانی {مصدر} چاوگی ثلاثی مجرد ئەوانەن کە باسیان دەکات :

| ژ | شێوەی چاوگەکان | میزان | مەوزون | بابەکان | واتاکەی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | فەتحی (فاء الفعل) و سکونی (عين الفعل) | فَعْل | قَتْلٍ | یەکەم | کوشتن |
| ٢ | (کسرة) لە ژێری (فاء الفعل) سکونی (عين الفعل) | فِعْل | فِسْقٍ | یەکەم | لە ئەمر دەرچوون |
| ٣ | (ضمة) بۆری (فاء الفعل) سکونی (عين الفعل) | فُعْل | شُغْلٍ | سێیەم | کارکردن |
| ٤ | ئەم سێیانەی دواییش بەم شێوەیەن بەڵام (ت)ی بۆ زیاد کراوە | فَعْلَةٍ | رَحْمَةٍ | چوارەم | بەزەیی |
| ٥ | | فِعْلَةٍ | نِشْدَةٍ | یەکەم | داواکردنی‌شتی‌بزر |
| ٦ | | فُعْلَةٍ | کُدْرَةٍ | چوارەم | شێلو -لێڵ- |
| ٧ | ئەم سێیانەش بە هەمان شێوەی سەرەوەن بەڵام ئەلفی کورت (مقصورة)ی بۆ زیاد کراوە | فَعْلَى | دَعْوَى | یەکەم | داواکردن |
| ٨ | | فِعْلَى | ذِکْرَى | یەکەم | بیرەوەری |
| ٩ | | فُعْلَى | بُشْرَى | یەکەم و چوارەم | موژدە |
| ١٠ | ئەم سێیەش هەر بەمان شێوەیە (ان) ئەلف و نونی بۆ زیاد دەکرێت | فَعْلان | لَيَّانٍ | دووەم | قەرز نەدان |
| ١١ | | فِعْلان | حِرْمانٍ | شەشەم | بێ بەش کردن |
| ١٢ | | فُعْلان | غُفرانٍ | دووەم | لێبوردن |
| ١٣ | (فاء الفعل و عين الفعل)ی (مفتوح) لەسەرن (ان) ئەلف و نونی لەگەڵدایە | فَعَلان | نَزَوانٍ | یەکەم | پەڕینی نێرە بۆ مێیە |
| ١٤ | (فاء الفعل وعين الفعل)ی (مفتوح) لەسەرن | فَعَلٍ | طَلَبٍ | یەکەم | داواکردن |

| ژ | شێوەی چاوگەکان | میزان | مەوزون | بابەکان | واتاکەی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٥ | (فاء الفعل) (مفتوح) لەسەرە (عين الفعل) (مكسور) لەژێرە | فَعِلْ | خَنِقٍ | یەکەم | خنکاندن |
| ١٦ | (فاء) لەژێرو (عین)ی (مفتوح) لەسەرە | فِعَلٍ | صِغَرٍ | شەشەم | بچوکی |
| ١٧ | (فاء) (مضموم) بۆرە (عین) (مفتوح) لەسەرە | فُعَلْ | هُدَىً | دووەم | رێنمونی |
| ١٨ | (فاء وعين و لام) هەر سێکیان (مفتوح) لەسەرن | فَعَلَةٍ | غَلَبَةٍ | دووەم | سەرکەوتن |
| ١٩ | (فاء و لام) مفتوح (عين) لە ژێرە | فَعِلَةٍ | سَرِقَةٍ | دووەم | دزی |
| ٢٠ | (فاء) (مفتوح) لەسەرەو لامیش زیادە | فَعالٍ | ذَهابٍ | سێیەم | رۆیشتن |
| ٢١ | (فاء) (مكسور) ئەلف زیادە | فِعالٍ | صِرافٍ | دووەم | حەزی مێیەسەگ بۆ نێرەسەگ |
| ٢٢ | (فاء) (مضموم) بۆرەو ئەلف زیادە | فُعالٍ | سُؤالٍ | سێیەم | پرسیار |
| ٢٣ | (فاء) (مفتوح) لەسەرەو ئەلف و تاء زیادە | فَعالَةٍ | زَهادَةٍ | سێیەم چوارەم | دونیا نەویستن |
| ٢٤ | (فاء) (مكسور) لەژێرەو ئەلف و تاء زیادە | فِعالَةٍ | دِرايَةٍ | دووەم | زانین |
| ٢٥ | (فاء) (مضموم)ەو بۆرەو واو زیادە | فُعولٍ | دُخولٍ | یەکەم | چوونە ژوورەوە |

| ژ | شێوەی چاوگەکان | میزان | مەوزون | بابەکان | واتاکەی |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٦ | (فاء) (مفتوح) واو زیادە | فَعولٍ | قَبُولٍ | چوارەم | رازی بوون (پەسەند کردن) |
| ٢٧ | (فاء) (مفتوح) لەسەرە یاء زیادە | فَعيلٍ | وَجيفٍ | دووەم | جۆرەڕۆیشتنەکی وشترە |
| ٢٨ | (فاء) (مضموم) بۆرەو واوو تێ زیادن | فُعولَةٍ | صهوبَةٍ | شەشەم چوارەم | سۆری |
| ٢٩ | میم زیادەو فاء سکونەو عین مفتوح | مَفْعَلٍ | مَدْخَلٍ | یەکەم | چوونە ژوورەو (ناوەوە) |
| ٣٠ | میم زیاد، فاء سکون، عین مکسور | مَفْعِلٍ | مَرْجِعٍ | دووەم | گەڕانەوە |
| ٣١ | میم و تێ زیاد، فاء سکون، عین مفتوح | مَفْعَلَةٍ | مَسعَاةٍ | سێیەم | کۆشش کردن |
| ٣٢ | میم و تێ زیاد، فاء سکون/ عین مکسور | مَفْعِلَةٍ | مَحْمِدَةٍ | چوارەم | مەدح کردن |
| ٣٣ | فاء مضموم بۆرە، ئەلف و تێ زیادە | فُعَالَةٍ | بُغَايَةٍ | دووەم | داوا |
| ٣٤ | فاء مفتوح لەسەرە، ئەلف و یاءو تێ زیاد | فَعَالِيَةٍ | كَرَاهِيَةٍ | چوارەم شەشەم | رق لێبوونەوە |

**تێبینی :**

مامۆستای بەڕێز لە کتێبەکەی باسی وەزنەکانی إسم ی نەکرد جا بۆ شارەزابوونی فەقێیەکان بە کورتی دەڵێین: ئیسمی ثلاثی مجرد (١٠) دە وەزنێ هەیە کە ئەمانەن {فَلْسٌ، فَرَسٌ، كَتِفٌ، عَضُدٌ، حِبْرٌ، عِنَبٌ، إبِلٌ، قُفْلٌ، صُرَدٌ، عُنُقٌ} وە رباعی مجرد (٥)

پێنج وەزنی هەیە کە ئەمانەن {جَعْفَرٌ، زِبْرِجٌ، بُرْثُنٌ، دِرْهَمٌ، قِمَطْرٌ} وە خماسيِ مجرد(٤) چوار بابی هەیە کە ئەمانەن {سَفَرْجَل، قِرْطَعْب، جَحْمَرِش، قُذَعْمِل} وە لێرەدا باسی مەزیدەکانیش ناکرێت.

(**والكل سماعى إلا ما كان على مَفْعَلٍ**) واتە لە {ق}ی {قَتْل}ی تا دەگاتە {ك}ی {كَراهِيَة} هەموویان سەماعین، واتە: بیستراون وە ناتوانین بە خۆمان دروستیان بکەین، تەنها ئەو {مصدر}ە چاوگە نەبێت کە لەسەر وەزنی {مَفْعَل}ە، (**فإنه قياسي من جميع الأبواب**) ئەویان قیاسیە دەتوانین لە هەموو بابەکانی ثلاثی مجرد دروستیان بکەین وەکو {مَنْصَب، مضرب، مسئل، مطعم.....} ئەو جۆرە چاوگ –مصدر– ە پێی دەڵێن: چاوگی میمی. یەکێك پرسیار دەکات کە ئەوە قیاسیە ئەی بۆچی لەگەڵ سەماعیەکان نوسراوە؟، لە وەڵامدا دەڵێین: بۆیە باسکراوە تاکو بزانرێت ئەوەش یەکە لە بینایەکانی مصدری ثلاثی مجرد جا سەماعی بێت یان قیاسی. جا گوتمان فعلی –ماضی– کاری رابردوو لە ثلاثی مجرد سێ بینای هەیە، لێرەدا بە درێژی باسیان دەکات (**فإن كان ماضيه على وزن فَعَلَ مفتوح العين فمضارعه يَفْعُلُ بضم العين أو كسرها**) واتە: ئەگەر فیعل –ماضی– کاری رابردوو لە ثلاثی مجرد لەسەر وەزنی ئەو {فَعَلَ}ەی بوو بە فەتحی {عين الفعل}ی ئەوا –مضارع– رانەبردووەکەی لەسەر وەزنی {يَفْعُلُ} بە {ضمة}ی {عين الفعل}ی یان {يَفْعِلُ} بە کەسرەی {عين الفعل}ی دێت، نمونەکان (**نحو**) وەکو (**نَصَرَ يَنْصُرُ**) ئێستا {نَصَرَ} فیعلی –ماضی– رابردووە {عين الفعل}ەکەی کە –ص–ە {مفتوح} لەسەرە، وە {يَنْصُرُ} –مضارع– رانەبردووە {عين الفعل}ەکەي کە –ص–ە {مضموم}ە ئەمە لە بابی یەکەمە نیشانەکەی ئەوەیە کە {عين الفعل}ەکەی لە –ماضی– {مفتوح}ەو لە –مضارع– {مضموم}ە، وە لەهەر شوێنەك بەم شێوەیە بوو ئەوە لە بابی یەکەمە، (**وضَرَبَ يَضْرِبُ**) –ضرب– {ماضی} رابردووە {عين الفعل}ەکەی کە رێیە لە –ماضی– {مفتوح}ە وە لە –مضارع– {مكسور}ە. ئەمەش نیشانەی بابی دووەمە.

جا لە پێشان باسی {مصدر} چاوگەکانی ثلاثی مجردی کرد، لێرەدا دەیەوێت جۆرە تایبەتیەکی باس بکات تاوەکو بزاندرێت {مصدر} چاوگی هەر بابێك لەم شەش بابە بە زۆری لەسەر چ وەزنەکی دەبێت؟ جا فەرمووی (**والغالب من مصدر فَعَلَ اللازم نحو رَكَعَ على رُكوعٍ**) واتە: {مصدر} چاوگی ئەو فیعلەی کە لەسەر وەزنی —فَعَلَ-ەیە وە لازمیشە بەزۆری لەسەر وەزنی {فُعول} دەبێت، وەکو —رَكَعَ- مەصدەرەکەی —رُكوع-ە ، یان —سَجَدَ- مەصدەرەکەی —سُجود-ە......هتد (**والمتعدي نحو ضَرَبَ على ضَرْبٍ**) بە زۆری {مصدر} چاوگی —فَعَلَ-ەی کە موتەعەدی بێت وەکو —ضَرَبَ- ئەوا لەسەر وەزنی —فَعْل-ی دەبێت، وەکو —ضَرْبٍ- وە —نَصْرٍ-......هتد (**وفي الصنائع نحو كَتَبَ على كِتابَةٍ**) بەزۆری مەصدەری —فَعَلَ-ەی کە بە مانا پیشە بێت وەکو: - {كَتَبَ} لەسەر وەزنی {فِعالَةٍ} دەبێ، وەکو {كِتابَة، تِجارَةٍ......هتد} . (**والإضطراب نحو خَفَقَ على خَفَقانٍ**) مەصدەری — فَعْلَ- کە بە واتای جولانەوەو هاتووچوون دەبێت وەکو: -خَفَقَ- لەسەر وەزنی — فَعَلان- دەبێت، وەکو: -خَفَقان، جَوَلان، دَوَران، طَيَرَانٍ، فَيَضَان......هتد- (**والأصوات نحو صَرَخَ على صُراخٍ**) مەصدەری —فَعَلَ-ەی کە بە واتا دەنگ بێت وەکو —صَرَخَ- لەسەر وەزنی —فُعال- دەبێ، وەکو: -صُراخ، بُكَاء، نُباح، خُوَار......-. {فِعالة} وەکو {كِتابَة وتِجَارَة..} دێت (**والإضطراب نحو خَفَقَ على خَفَقانٍ**) ئەگەر بە مانای هاتووچون و جولان بێت وەکو {خَفَقان و دَوَران....} دەبێت (**والأصوات نحو صَرَخَ على صُراخٍ**) ئەگەر بە مانای دەنگ بێت ئەوە وەکو {صرخ} لەسەر وەزنی —فُعال- وەکو {صُراخ، بُكاء...} دێت.

**تێبینی :**

وە هەر ئەم فیعلە واتە: -فَعَلَ- ئەگەر بۆ نەخۆشیو دەرد بەکار هات ئەوە مەصدەرەکەی بەزۆری لەسەر وەزنی —فُعَال- دێت، وەکو: -سُعَال، زُكَام، سُدَاح، خُنَاق، رُعَاف......هتد.

گوتمان ئەگەر —ماضی فَعَلَ- بوو بە فەتحی عین —مضارع-ەکەی بە —ضمة-و —کسرة-ەی {عین الفعل} دەبێت، بەڵام هەندێك جاریش بە فەتحی —عین الفعل- دەبێت جا دەفەرمووێت (**ویجئ مضارعه بفتح العین في بعض ما کان عینه أو لامه حرف حلق**) واتە: کەم جار {مضارع}ی —فَعَلَ-ەی مەفتوح لەسەر وەزنی {یَفْعَلُ}ی دەبێت بە فەتحی {عین الفعل} لە هەندێك شوێن کە {عین الفعل یان لام الفعل}ی پیتی حەلقیّ بێت. یەکێك پرسیار دەکات باشە لەبەرچی لە فەتحەی حەرفی حەلق بە شەرت گیراوە؟ لە وەڵامدا دەڵێت (**أشترط هذا لأن الأصل تغایر حرکة عین الماضی والمضارع کمعناهما**) واتە: ئەمە بە مەرج گیراوە چونکە ئەسل لە هەموو فیعلێك وایە کە حەرەکەی {عین الفعل}ی لە —ماضی-و لە —مضارع-ی لێك جیاواز بێت هەروەکو واتاکەیان لێك جیاوازە، (**فلا یعدل عنه الا لمقتض**) لەم ئەسلە لانادریّ مەگەر هۆیەك پاڵمان بدات بۆ لادان لەم ئەسڵە، جا بە ناچاری {عین الفعل} لە —ماضی-و لە —مضارع-ی یەکسان دەبێت (**وهو ثقل حرف الحلق**) وە ئەم هۆیەش کە لێرە وامان لێدەکات لەو ئەسلە لابدەین گرانی پیتی حەلقە، ئەوە بوو ناچاری کردین کە {عین الفعل} لە —ماضی-و —مضارع-ی مەفتوح بکەین، چونکە حەرف حەلق هەرچەندە گرانە بەڵام فەتحەش حەرەکەیەکی سووکە بۆ یەکتر دەگونجێن. جا یەکێك پرسیار دەکات: بۆچی {فاء الفعل}یش بە مەرج نەگیرا؟ لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**ولا یؤثر الفاء لسکونه في المضارع دائما**) واتە: {فاء الفعل} هەرچەندە یەکێکە لە پیتەکانی حەلق کەچی کار ناکاتە سەر گرانی وشە، چونکە ئەم {فاء الفعل}ە لە —مضارع-دا هەردەم ساکینە، وە ساکینیش زۆر سووکە. هەروەها ئەوەش بزانە ئەگەر هاتوو {عین الفعل و لام الفعل} هەردووکیان حەرفی حەلق بوون لەو کاتی مەفتوح ناکرێت وەکو {صَحَّ یَصِحُّ} (**وهی: الهمزة والهاء والعین والحاء والغین والخاء**) پیتەکانی حەلق ئەم شەشانەن {أ، ه، ع، ح، غ، خ} ئەوانەش لەبەر ئەوە پێیان دەڵێن پیتی حەلق چونکە حەلق بە مانای گەروو دێت ئەوانەش لە گەروو —قورِگ- دێنە دەرەوە، نمونەکان (**نحو**

**سَئَلَ یَسْئَلُ ومَنَعَ یَمْنَعُ)** {سَئَلَ} {عین الفعل}ی یەکێکە لە پیتەکانی حەلق کە هەمزەیە، وە {مَنَعَ} {لام الفعل}ی یەکێکە لە پیتەکانی حەلق کە عەینە. جا لەبەر ئەوە {عین الفعل} لەم دووانە لە –ماضی–و لە –مضارع–ی مەفتوحە، ئەم بابە بابی سێیەمە هەوەها بابی بە مەرج{شَرْط} یشی پێ دەڵێن چونکە حەرفی بۆ بە شەرت گیرا بوو. نیشانەی ئەو بابە کە {عین العفل}ی لە –ماضی–و لە –مضارع–دا مەفتوحە بەو شەرتەی گوتمان. ئەوەش بزانە مصنف بۆیە وشەی {بعض}ی بەکارهێنا چونکە زۆرجار وا دەبێت {عین الفعل یان لام الفعل} یەکێکە لە پیتەکانی حەلق کەچی مەفتوحیش نابێت وەکو: {دَخَلَ یَدْخُلُ}. جا هەر لەو باسەوە لە وانەیە یەکێك رەخنە بگرێت و بڵێت: تۆ گوتت ئەو کاتە {عین الفعل} لە –ماضی–و لە –مضارع– مەفتوح دەبێت کە {عین الفعل یان لام الفعل}ی یەکێك بێت لە پیتەکانی حەلق، کەچی {أَبَی یَأْبَی} {عین الفعل}ی مەفتوحە کە –ب– ە وە نە عەین و نە لامیشی حەرف حەلق نییە، ئەویش لە وەڵامدا دەفەرمووێت **(وأَبَی یَأْبَی شاذ)**[1] واتە: {أَبَی یَأْبَی} کە {عین الفعل}ەکەی لە –ماضی–و لە –مضارع–دا مەفتوحە ئەوە شازەو کەمە یاسای پێ هەڵناوەشێتەوە **(وقیل نصبهما فیها لمناسبة مَنَعَ یَمْنَعُ في المعنی)** واتە: گوتراوە لە وەڵامدا فەتحەی ئەم دوو {عین الفعل}ە لە مادەی {أَبَی یَأْبَی} لەبەر ئەوەیە کە لەگەڵ {مَنَعَ یَمْنَعُ} لە واتادا پێك دەچن و لە یەکتر نزیکن، وە {مَنَعَ یَمْنَعُ} مەرجەکەی تێدا هاتۆتە جێ فەتحەکەی بە گوێرەی یاسایە، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین ئەو وەڵامەش {أَبَی یَأْبَی} لە شاز رزگار ناکات. جا لێرەدا رەخنەگر دەڵێت: خۆت بەو وەڵامە لە {أَبَی یَأْبَی}ی رزگار کرد ئەی چی دەڵێی لە بارەی {رَکَنَ یَرْکَنُ} ئێستا {عین الفعل}ی کە کافە لە –ماضی–و لە –مضارع–دا مەفتوحە وە هیچ پیتی حەلقیشی تێدا نییە ئەویش لە وەڵامدا دەفەرمووێت **(ورَکَنَ یَرْکَنُ من التداخل)** واتە: ئەو مادەیە لە دوو باب هاتووە لە بابی یەکەم وەکو {رَکَنَ یَرْکُنُ}وە لە بابی چوارەم وەکو {رَکِنَ یَرْکَنُ} جا –ماضی– بابی یەکەم لەگەڵ –مضارع–ی بابی چوارەم بە یەك گەیشتوون بوو بە

{رَکَنَ یَرْکَنُ} ئەمەش لە تێکەڵاوی دوو باب دروست بووەو لە ئەسلدا وا نەبووە، کەواتە حیسابی بۆ ناکرێت. جارێکی دیکە پرسیار دەکات ئەی چی دەکەی لە {قَلَی یَقْلَی}ی ئێستا پیتی لام مەفتوحە لە -ماضی-و لە -مضارع- وە هیچ پیتی حەلقیشی تێدا نییە؟ لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**وقَلَى يَقْلَى عامرية**) ئەمەش کە {عين الفعل} لە -ماضی-و -مضارع- مەفتوحە ئەمەش زاراوەی هۆزی {بنی عامرية} کە هۆزێکن لە عەرەبەکان زاراوەکەیان فەسیح نییە ئێمەش باسی فەسیح دەکەین نەك کەسانێك کە زاراوەیان فەسیح نەبێت. جارێکی دیکە پرسیار دەکات و دەڵێت: ئەی چی دەکەی لە{بَقَی یَبْقَی} عەین الفعل ەکەی مەفتوحە لە -ماضی-و لە -مضارع-دا وە هیچ پیتی حەلقیشی تێدا نییە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**وبَقَى يَبْقَى لغة طي**) ئەمەش زاراوەی {بنی طی}یانە کە هۆزێکن لە عەرەبان ئەمانەش بە هەمان شێوە فەسیح نین (**والفصيح كسر عين مضارع الأول وماضي الثاني**)[٢] زاراوەی فەسیح و ڕاست ئەوەیە کە لە نمونەی یەکەم {عين الفعل} لە -مضارع-ی یەکەم لەژێر -مکسور- بکرێ واتە: بیخوێنیتەوە {قَلَی یَقْلِی} بە کەسرەی پیتی لام لە -مضارع-دا. وە لە نمونەی دووەمدا {عين الفعل} لە -ماضی- {مکسور} لە ژێر بکرێت واتە: بیخوێنیتەوە {بَقِیَ یَبْقَی} بە کەسرەی -ق- لە فیعلی -ماضی-دا. گوتمان ئەگەر -ماضی- لەسەر وەزنی {فَعَلَ}ەی بە فەتحی {عين الفعل} بێت سێ بابی لێ دروست بوون، دوای ئەوە دێتە سەر باسی {فَعِلَ}ەی مەکسورو دەفەرمووێت (**وإن كان ماضيه على فَعِلَ بكسر العين فمضارعه يَفْعَلُ بفتح العين**) واتە ئەگەر -ماضی ثلاثی مجرد- لەسەر وەزنی {فَعِلَ}ەی بوو بە کەسرەی {عين الفعل} ئەوا -مضارع-ەکەی {یَفْعَلُ} بە فەتحەی {عين الفعل} دەبێت (**كعَلِمَ يَعْلَمُ**) ئێستا لێرەدا عين الفعل کە لامە لە - ماضی- مەکسورە بەڵام لە -مضارع- مەفتوحە، ئەمەش پێی دەڵێن بابی چوارەم (**إلاّ ما شذّ من نحو حَسِبَ يَحْسِبُ**) گوتمان هەر کاتەك -ماضی- مەکسور بێت ئەوە -مضارع- مەفتوح دەبێت مەگەر ثلاثی مجردێك کە شاز بێت وەکو {حَسِبَ یَحْسِبُ} و

هاوشێوەکانی وەکو {نَعِمَ يَنْعَمُ، وَرِثَ يَرِثُ......} یاسا وابوو هەر کاتەك —ماضی- مەکسور بێت دەبێ —مضارع- مەفتوح بێت بەڵام ئەوانە مضارع ەکەشیان هەر مەکسورە جا لەبەر ئەوە بە شاز حیساب کران واتە ریز پەڕن. یەکێك پرسیار دەکات کە شاز بن بۆچی بە بابی پێنجەم دانراون؟ ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە ئەو بابە لە {معتل الفاء} یەکجار زۆرن بۆیە بە بابی پێنجەم و بە بابێکی سەربەخۆ داندران **(وكثر في المثال)** واتە بابی پێنجەم کە نیشانەکەی ئەوەیە کە {عين الفعل} ەکەی مەکسورە لە هەردوو فیعلی —ماضی ومضارع- لە {معتل الفاء}ی زۆرن **(ويجئ الألوان والعيوب والحلى كلها من عَلِمَ يَعْلَمُ)** واتە: ئەو فیعلانەی بە واتای رەنگن وەك {سَوِدَ} یان بە واتای عیب و کەموکوڕی بێت وەکو {عَوِرَ، عَرِجَ} یان بە واتای جوانیو رێك و پێکین وەکو {بَلِجَ} ئەمانە هەموویان لە بابی چوارەم دێن. واتە: ئەگەر لە بابێکی دیکەش دروست بکرێن لە بابی چوارەم هەر دروست دەکرێن وەکو {أَدِمَ و رَعِنَ} ئێستا ئەم دوو بابانە هەر چەندە لە بابی شەشەمیش هاتوون بەڵام لە بابی چوارەمیش دێن. جا یەکێك پرسیار دەکات و دەڵێت: تۆ گوتت هەر کاتەك —ماضی- مەکسور بوو ئەوا —مضارع- مەفتوح دەبێت مەگەر بە شاز بێت، وە ئێستا لەم فیعلانە —ماضی- مەکسورە کەچی —مضارع-ەکەیان —مضموم-ە وەکو {فَضِلَ يَفْضُلُ.......} لە وەڵامدا دەفەرمووێت **(ونحو فَضِلَ يَفْضُلُ ونَعِمَ يَنْعُمُ وماتَ يَمُوتُ بكسر الماضى وضم المضارع من التداخل)** واتە: ئەم فیعلانە کە —ماضی-ەکەیان مەکسورە —مضارع-ەکەیان —مضموم-ە ئەوە لە {التداخل} تێکەڵاوی دوو باب دروست بووە، -ماضی-ەکەیان لە بابی چوارەمە وە —مضارع-ەکەیان لە بابی یەکەمە، کەواتە لە ئەسلدا وا نەبوو، ئەوەش بزانە {ماتَ يَموتُ} ئەسلەکەی {ماتَ يَمْوُتُ} بووە بە ئیعلال بۆتە {ماتَ يَموتُ}. **(وجاز فيما ماضيه مكسور العين وكان عينه حرف حلق كشَهِدَ أربع لغات)** دروستە لە فیعلەکی کە {ماضي}ەکەی {مكسور العين} بێت وە هەروەها {عين الفعل} ەکەشی یەك بێت لە حەرفی حەلق وەکو {شَهِدَ} ئەوا چوار زاراوەی لێ

دروست دەبێت کە بەم شێوەیە {شَهِدَ} بە کەسرەی {عین الفعل} ی، {شَهْدَ} بە سکونی عین الفعل ی، {شِهِدَ} بە کەسرەی {فاء الفعل و عین الفعل} ی، {شِهْدَ} بە کەسرەی {فاء الفعل} و سکونی {عین الفعل} **(وإلا كعَلِمَ فثلاث)** ئەگەر ئەو فیعلە لەسەر وەزنی {فَعِلَ}ەی بوو بەڵام {عین الفعل}ی یەك نەبوو لە پیتەکانی حەلق ئەوە تەنها سێ {لغة} زاراوەی تێدا دروستن، نمونەکان {عَلِمَ، عَلْمَ، عِلْمَ} ئەوەی ئێمە گوتمان لە بارەی فیعلەوە بوو ، ئەی ئەگەر ئیسمەك بەو شێوەیە بوو **(وكذا الإسم)** واتە: ناویش {إسم}یش بە هەمان شێوە ئەگەر ناوەك لەسەر وەزنی {فَعِلَ}ەی بوو {عین الفعل}یشی مەکسورو یەك بوو لە پیتەکانی حەلق چوار {لغة} زاراوەی تێدا دروستن وەکو {فَخِذَ} ئەوە چوار شێوەکانی بەم شێوەیەن {فَخِذَ، فَخْذَ، فِخْذَ، فِخِذَ} بەڵام ئەگەر {عین الفعل}ی یەك نەبوو لە پیتەکانی حەلق وەکو {كَتِفَ} ئەوە تەنها سێ زاراوەی تێدا دروستن، نمونەکان وەکو {كَتِفَ، كَتْفَ، كِتْفَ} **(والغالب من مصدر فَعِلَ اللازم كفَرِحَ على فَرَحٍ بفتح أوليه)** واتە بەزۆری مەصدەری ئەو {فَعِلَ}ەی کە لازمە وەکو { فَرِحَ} لەسەر وەزنی {فَعَلْ} دێت دەگوترێت {فَرَحاً}بە فەتحەی هەردوو پیتەکانی یەکەمی واتە فاء الفعل وعین الفعل. **(ولا يجئ هذا البناء مما ماضيه مفتوح العين إلّا فيما عين المضارع فيه مضموم)** ئەم جۆرە مەصدەرە واتە {فَعَلاً} بە فەتحەی دوو پیتەکانی یەکەم دروست نابێت لە فیعلەکی کە ماضيەکەی مەفتوح العین ە، مەگەر بە مەرجێك عین الفعل لە مضارع ی مضموم بێت **(كطَلَبَ يطْلُبُ طَلَبا)** ئەوە هەر چەندە ماضيەکەشی مەفتوحە بەڵام چونکە مضارع ەکەی مضمومە ئەم مەصدەرەی لێ هاتووە وەکو {طَلَباً} بە فەتحەی دوو پیتەکانی یەکەمی **(غير الجَلَب والغَلَب)** مەگەر ئەم دوو مەصدەرە کە {جَلَب وغَلَب}ن، **(فإنهما من جَلَبَ يَجْلِبُ وغَلَبَ يَغْلِبُ بفتح الماضي وكسر المضارع فيهما)** ئەم دوو مەصدەرانە ماضيەکەیان {جَلَبَ و غَلَبَ } بە فەتحەی عین الفعل ەکەیان وە مضارعەکەیان {يَجْلِبُ ويَغْلِبُ} بە کەسرەی عین الفعل ەکەیانە، لەگەڵ ئەمەشدا مەصدەرەکەیان لەسەر وەزنی {فَعَلاً} هاتووە بە

فەتحەی دوو پیتەکانی یەکەمی، لێرەدا وا بە دیار کەوت کە ئەم مەصدەرە تەنها لە بابی سێیەم نایەت، چونکە ئەو بابانەی دیکە کە دەکاتە بابەکانی {حَسُنَ یَحْسُنُ} لەسەر ئەم وەزنە دێت وەك {کَرُمَ یَکْرُمُ کَرَماً} کەواتە ئەوەی ماوە تەنها بابی سێیەمە. (**والمتعدي نحو جَهِلَ على جَهْلٍ**) واتە: مەصدەری {فَعِلَ}ەی کە عین الفعل ی مەکسور بێت ئەگەر ئەو فیعلە موتەعەدی بوو ئەوە لەسەر وەزنی {فَعِل} دێت وەکو {جَهِلَ} لە مەصدەرەکەی دەگوترێت {جَهْل} (**ومن الألوان والعیوب والحلَی على فُعْلَةٍ بضم الفاء وسکون العین**) بە زۆری مەصدەری {فَعِلَ}ەی مەکسور لەو فیعلانەی کە بە واتای عەیب و رەنگ و نیشانەو جوانین لەسەر وەزنی {فُعْلَة} دەبێت بە ضمةی فاء الفعل وە سکونی عین الفعل وە تاوەکی زیاد لە کۆتایی (**کحُمْرَةٍ وأُدْمَةٍ وسُمْرَةٍ وبُلْجَةٍ**) {حُمْرَةٍ}سۆر {أُدْمَةٍ} سۆرو سپی گەنم رەنگ {سُمْرَةٍ} کەمێك رەش، ئەم سێیانە نمونەی رەنگن {بُلْجَةٍ} واتە هەندێك سپی لە نێو چەوانی یان پەلەکانی ولاخ، ئەمەش نمونەی جوانکارییە، نمونەی عەیب و کەمو کوڕی وەکو {عُجْفَة} خۆزگە لە جیاتی ئەوەی کە سێ نمونەی بە رەنگ هێنانەوە یەکێکی لەوانە هێنابایەوە.

(**وإن کان ماضیه على فَعُلَ بضم العین فمضارعه على یَفْعُلُ بضمه**) ئەگەر ماضی ثلاثی مجرد لەسەر وەزنی {فَعُلَ}ەی بە ضمةی عین الفعل ی هات ئەوا مضارعەکەی لەسەر وەزنی {یَفْعُلُ} بە ضمةی عین الفعل ی لە مضارع ی دێت (**کحَسُنَ یَحْسُنُ**) ئێستا {حَسُنَ یَحْسُنُ} عین الفعل دکەی کە سینە لە هەر دووکیان مضموم، هەر ئەمەش نیشانەی بابی شەشەمە وەکو {صَغُرَ یَصْغُرُ، کَبُرَ یَکْبُرُ......هتد} (**ویکون للطبایع التی لا تفارق الفاعل**) واتە: ئەم بابە بۆ ئەو جۆرە فیعلانەیە کە سروشتی بن و هەرگیز لە فاعیلەکەیان جیا نەبنەوە یان ئەگەر جیاش ببنەوە بە تەدریج بێت (**کالحسن والقبح**) ئێستا ئەم دووانە کە جوانیو ناشیرینیە لە خاوەنەکەیان جیا نابنەوە، چونکە مەبەست سروشتیەکانن نەك دەستکردەکان (**ونحوهما کالصغر والکبر**) یان وەکو هاوشێوەکانی {حسن وقبح}

وەکو {صِغَر و کِبَر} واتە: بچوکیو گەورەیی ئەمانە هەرچەندە جیا دەبنەوە لە فاعیلەکەیان بەلاّم بە تەدریج، واتە لەسەرخۆو قۆناغ بە قۆناغ هەر لەبەر ئەوەش کردنیە هاوشێوەی {حسن وقبح} چونکە ئەم جیاوازییەیان هەیە(**والغالب من مصدره على فَعَالَةٍ نحو كَرامَةٍ**) واتە: مەصدەری ئەم بابە کە هەردەم لازمە زۆرتر لەسەر وەزنی {فَعَالَة} دەبێت، وەکو: {كَرُمَ، يَكْرُمُ، كَرَامَةً} (**وعلى صِغَرٍ وُكَرَمٍ كثيرا**) مەصدەری ئەم بابەش لەسەر وەزنی {صِغَرٍ وكَرَمٍ}یش بەزۆری دێت.

لەوەی رابردوو بۆمان دەرکەوت کە {فَعَلَ}ەی مەفتوح سێ بابی دروستکرد کە بریتین لە: يَفْعُلُ بە ضمةی عين الفعل ی لە مضارع دا کە دەکاتە بابی یەکەم، يَفْعِلُ بە کەسرەی عين الفعل ی کە دەکاتە بابی دووەم، يَفْعَلُ بە فەتحەی عين الفعل کە دەکاتە بابی سێیەم. وە لە فَعِلَ ەی مەکسور دوو باب دروستکران کە ئەمانەن: يَفْعَلُ بە فەتحەی عين الفعل ی لە مضارع دا کە دەکاتە بابی چوارەم، يَفْعِلُ بە کەسرەی عين الفعل کە دەکاتە بابی پێنجەم. بەلاّم فَعِلَ يَفْعُلُ بە کەسرەی ماضیو ضمةی مضارع ی ئەوە نییە مەگەر بە تەداخول نەبێت وەکو: فَضِلَ يَفْضُلُ ئەمەش حیسابی بۆ ناکرێت. وە فَعُلَ ەی مضموم تەنها یەك بابی دروستکرد ئەویش فَعُلَ يَفْعُلُ بە ضمةی هەر دووکیان ئەمەش بابی شەشەمە، بەلاّم فَعُلَ يَفْعِلُ لەگەلّ يَفْعَلُ بە کەسرەی مضارع و بە فەتحەی ئەمانە نینە.

## باسی ئەو بابەی چوار پیتی روتن

جا باسی ثلاثی مجرد کۆتایی پێهات ئێستا باسی رباعی مجرد دەکات بۆیە فەرمووی (**وأمّا الرباعي المجرد فهو فَعْلَلَ**) واتە: کە رباعی مجرد بێت واتە چوار پیتی رووت لە پیتە زیادەکان و ئەسلی بن ئەم جۆرە فیعلە تەنها یەك بابی هەیە ئەویش لەسەر وەزنی {فَعْلَلَ}یە بە فەتحەی فاء الفعل و سکونی عين الفعل ی وە بە فەتحەی هەردوو لامەکان (**نحو دَحْرَجَ يُدَحْرِجُ دَحْرَجَةً و دِحْرَاجا**) ئێستا {دَحْرَجَ} لەسەر وەزنی {فَعْلَلَ}یە هەر چوار پیتەکانی ئەسلین هەر پیتەك بەم

شێوەیە بێت ئەوە پێی دەڵێن رباعی مجرد (**وهما قياسيان**) ئەم دوو مەصدەرە {دَحْرَجَةً و دِحْرَاجاً} قیاسین دەتوانین لە هەموو نمونەکانی ئەم بابەی رباعی مجرد دەتوانین ئەم دوو مەصدەرە دروست بکەین. جا یەکێك پرسیار دەکات: بۆچی رباعی مجرد تەنها یەك بابی هەیە؟ لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**وانحصر في هذا**) رباعی مجرد کورتکراوەتەو لە یەك باب کە {فَعْلَلَ}یە (**لأن أول الماضى وآخره لايكونان إلاّ مفتوحين**) چونکە دەبێت پیتی یەکەم و کۆتایی لە فعلی —ماضی- هەر مەفتوح بن مەگەر بە هۆی ضمیرەکان بێت، کەواتە ئەم دوو پیتە یەکەم و کۆتایی هیچ بەرهەمیان نەبوو بۆ دروستکردنی بابێکی دیکە هەر بابێکیش کە بمانەوێت دروستی بکەین ئەوە بە حەرەکەو سکونی پیتەکان دەبێت، کەواتە با بچین بۆ لای دوو پیتەکانی دیکە کە عين الفعل و لام الفعل ی یەکەمە (**ولو أسكن اللام الأولى يلزم التقاء الساكنين**) واتە: ئەگەر لام الفعل ی یەکەم ساکن بکرێت {إلتقاء الساكنين} دەبێت واتە دوو پیتی ساکن بەیەك دەگەن، ئەمەش بەلای زانایانی سەرف قەدەغەیە مەگەر بە یاسای خۆی نەبێت کە لەمەو دوا باسی دەکەین {إنشآء الله} جا لێرەدا کەی دوو ساکن بەیەك دەگەن (**إذا اتصلت الضمائر المتحركة بالفعل**) لە کاتێك دەبێت کە ضمیری مرفوعی حەرەکەدار بەو فیعلانەوە بلکێندرێت وەکو: {دَحْرَجْتُ} ئێستا پیتی —ت- تێ پیتی پێشەخۆی ساکن کردووە جا ئەگەر پیتی پێشتریش ساکن بکرێت ئەوە دەبێتە بە یەکگەیشتنی دوو ساکنان لەبەر ئەوە بە ناچاری نەمان توانی دەستکاری ئەو پیتە بکەین، با بێینە سەر عين الفعل بزانین دەتوانین حەرەکەداری بکەین (**فسكن العين لئلاّ يلزم توالى أربع حركات**) نەمان توانی عين الفعل حەرەکەدار بکەین بەڵکو هەر ساکنمان کرد تاکو چوار حەرەکە لە دوای یەك لە یەك وشە ریز نەبن چونکە گرانە کەواتە هیچ رێگا نەما بۆ دروستکردنی بابێکی دیکە. یەکێك پرسیار دەکات تۆ گوتت بۆیە رێمان نەدا چونکە با نەبێتە مایەی لە دوای یەك هاتنی چوار حەرەکە ئەی بۆچی لە {جَنَدِل، عُلَبِطَ} چوار حەرەکە لە یەك وشە لە دوای یەك هاتوون؟ ئەویش وەڵام دەداتەوە دەفەرمووێت

(**وأما جَنَدِل لأرض ذات حجارة وعُلَبِط لقطيع الغنم**) واتە جَنَدِل کە بە زەوییەکی بە بەرد دەڵێن، وە عُلَبِط کە بە پارچە -مێگەل-ە مەڕێك دەڵێن، لەم دووانە راستە ئێستا وا دیارە کە چوار حەرەکە لە دوای یەك بن بەڵام لە ئەسڵدا وا نەبووە (**فالأصل جَنَادِل وعُلابِط**) ئەسڵی {جَنَدِل} {جَنادِل} بووەو وە ئەسڵی {عُلَبِط} {عُلابِط} بووە، کەواتە ئەلفێکی ساکن لە نێوان ئەم حەرەکانە هەبووە (**فحذف الألف وتركا على حالهما**) واتە حەزفی ئەلفەکە کراوە پاشات بەم شێوەیە جێ هێشتراوە وە هیچ دەستکاری دیکەیان بۆ نەکردووە (**فليس التوالى أصلاً**) ریزبوونی چور حەرەکە کە لێرە هەیە لە ئەسلدا نەبووە، بەڵکو بە هۆی لادانی ئەلفەکە دروست بووە (**ويلحق به نحو جَوْرَبَ وجَلْبَبَ وبَيْقَرَ وهَرْوَلَ وشَرْيَفَ ومَنْدَلَ**) بەڵێ ئێمە گووتمان رباعی مجرد تەنها یەك بابی هەیە ئەوشەشانە {ثلاثی مزید فیە}ن بەڵام پێیان دەگوترێت {ملحق بە رباعی مجرد} ئەمانە:

یەکەم: جَوْرَبَ ئەسلەکەی {جَرَبَ} بووە واو زیاد کراوە. دووەم: {جَلْبَبَ} ئەسلەکەی {جَلَبَ} بووە بێی دووەم زیاد کراوە. سێیەم: {بَيْقَرَ} ئەسلەکەی {بَقَرَ} بووە یاء زیاد کراوە. چوارەم: {هَرْوَلَ} ئەسلەکەی {هَرَلَ} بووە واو زیاد کراوە. پێنجەم: {شَرْيَفَ} ئەسلەکەی {شَرُفَ} بووە یاء زیاد کراوە. شەشەم: {مَنْدَلَ} ئەسلەکەی {مَدَلَ} بووە نون زیاد کراوە.

جا یەکێك پرسیار دەکات بەڵگەت چییە کە ئەوانە ملحقن بە رباعی مجرد ئەویش لە وەڵامدا دوو بەڵگەی هێناونەتەوە: کە یەکەمیان بریتییە لە (**ودليله إتحاد المصدرين**) واتە: بەڵگەی یەکەم ئەوەیە کە لەم شەش بابە ملحقە دوو مەصدەری هەیە وەکو مەصدەرەکانی رباعی مجرد. وە بەڵگەی دووەم لەسەر ئەوەی کە ئەوانە ملحقن بە رباعی مجرد (**وكونها على زنته**) واتە: ئەم شەشە لەسەر وەزنی رباعی مجردن (**مع زيادة لا فائدة لها غير جعلها على مثاله**) لەگەڵ پیتێکی زیادکراو وەکو لە پێشدا باسی هەموو ئەو پیتە زیادانەمان کرد، ئەم پیتە زیادەش هیچ سوودی نییە تەنها ئەوە نەبێت کە ئەوانەی هێناوەتە سەر وەزنی رباعی مجرد، بۆ نموونە

ئێستا {جَلْبَبَ} ئەگەر بێی دووەمی لێ نەبێت ثلاثی مجردة بە هۆی ئەو بێیە بۆتە ملحق بە رباعی مجرد، چونکە مانای ئیلحاق ئەوەیە کە ئەو وشەیە پیتێکی لێ زیاد بکرێت بە هۆی ئەو پیتەوە بێتە سەر وەزنی وشەیەکی دیکە. جا لێرەدا یەکێك رەخنە دەگرێت و دەڵێت: ئێستا {جَلْبَبَ} دوو پیتی وەکو یەکی لێنە بۆچی لەیەکت دەغم نەکردوون؟ یان بۆچی لە {هَرْوَلَ، وشَرْیَفَ} واوو یێ نەکراونەتە ئەلف ئەویش لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**ولم یدغم في جَلْبَبَ ولم یقلب في هَرْوَلَ وشَرْیَفَ مع موجبهما**) واتە: بۆیە لە {جَلْبَبَ} بێ لە بێی دەغم نەکراوە، وە لە {هَرْوَلَ وشَرْیَفَ} بۆیە واوو یێ قەلب نەکراون بە ئەلف لەگەڵ ئەوەشدا هۆی قەلب لە هی یەکەم و دەغم لە هەردووکی دووەمدا هاتۆتە جێ (**لئلاّ یخرجا عن زنة الملحق به**) لەبەر ئەوە ئیلحاق نەکراون مەبادا لەسەر وەزنی {ملحق به} لا بچن کە رباعی مجردە، بۆ نمونە {جَلْبَبَ} لەسەر وەزنی {دَحْرَجَ}یە حەرەکەو سکونی وەك ئەو وانە ئەگەر دەستکاری بکرێت و بگوترێت {جَلَبَّ} ئەوە لەسەر وەزنی ئەو دەر دەچێت: کەواتە لەبەر ئەوەیە دەستکاری نەکراون. ئەگەر دەستکاری بکرابا بەو شێوەیە دەکرا: لە هی یەکەم حەزفی حەرەکەی بێی یەکەمان دەکرد ئنجا لە بێی دووەم دەغم دەکرا، لە هی دووەم و سێەم نەقلی حەرەکەی واوو یێمان دەکرد ئنجا دەمان گووت: واو یان یێ ئێستا ساکن لە ئەسلدا حەرەکەدار {ما قبل مفتوح} دەمان کردە ئەلف دەبوون بە {شَرافَ و هَرَالَ}.

## باسی ئەو بابانەی لەسەر بتبە سێ پیتیەکان زیاد کراون

(**وأما الثلاثی المزید فیه فهو علی ثلاثة أقسام**) لە کاتێکدا کە باسی ثلاثی مجرد تەواو بوو هاتینە سەر باسی ثلاثی مزید فیە، جا فەرمووی: ئەو فیعلەی کە ثلاثيەو مجردە واتە سێ پیتی ئەسلی هەیە وە هەندێك پیتیشی لێ زیاد کراون سێ بەشە چونکە حەرفە زیادەکان یان یەکە یان دووانن یان سێنە. جا مامۆستای بەرێز پێش ئەوەی بێتە سەر باسی بابەکان ویستی ئاگادارمان بکاتەوە لەو پیتانەی زیاد

دەکرێن داخۆ چەندن و وە کامانەن، بۆیە فەرمووی (**واعلم أن الزيادة لا تكون إلاّ من حروف سألتمونيها**) بزانە ئەی قوتابی ئەو پیتانەی زیاد دەکرێن نابێت لەو پیتانە تێبپەڕن کە لەم رستەیە کۆکراونەتەوە، کە ئەمانەن {س، ء، ل، ت، م، و، ن،ی، ه، آ} (**إلاّ في التضعيف للالحاق وغيره**) واتە: حروفی زیاد لەم دەیانە دەرناچن، مەگەر ئەم زێدەییە بۆ {تضعيف} چەندانە بێت، جا ئەم دوو چەندانەیەش بۆ الحاق بێت یان بۆ غەیری الحاق بێت لەو کاتی دەتوانی پیتێك زیاد بکەیت ئەگەر لەو دە پیتانەش نەبێت وەکو {جَلْبَبَ} ئێستا بێی دووەم زیادەو یەکیش نییە لەو دە پیتانەی رابردوو بەڵام لەبەر ئەوەی بۆ ئیلحاقە دروستە، لە هەمان کاتدا {هَرْوَلَ} واو زیادەو بۆ ئیلحاقە وە یەکیشە لەو دە پیتانە. وە هەروەها {فَرَّحَ}و {طَوَّفَ} کە رێ و واو زیادن بەڵام بۆ ئیلحاق زیاد نەکراون بەڵکو بۆ ئەوە زیادکراون کە {فَرَّحَ} بۆ {تعدية} زیاد کراوە هەروەها {طَوَّفَ} بۆ {تكثير} زیاد کراوە، رێ لە یەکەمیان یەکە لەو دە پیتانە بەڵام واو لە دووەمیان یەك نییە لەو دە پیتانە.

(**فالأول ما كان ماضيه على أربعة أحرف بزيادة واحدة**) واتە بەشی یەکەم لەو سێ بەشانەی بۆ ثلاثی مزيد فيه هەیە ئەو فیعلەیە کە ماضیەکەی لەسەر چوار پیت بێت سێ‌ی ئەسل و یەکی زیاد، ئەم بەشەش بە خۆی سێ بابی هەیە: یەکەم (**كأَفْعَلَ نحو أَكْرَمَ يُكْرِمُ إِكْرَاماً**) ئێستا {أفْعَلَ} میزانە وە {أكْرَمَ} مەوزونە هەمزەی یەکەمی زیادە کە پێی دەڵێن همزەی {قطع}، ئەم بابەش پێە دەگوترێت: بابی {إفْعَال} نیشانەشی ئەوەیە کە همزەیەکی مەفتوحی لە سەرەتاوە هەیە، جا هەر فیعلەکی ثلاثی مجرد بتەوێت بیکەیتە مزيد ئەوە ئەم همزەیەی بۆ زیاد بکە ئەوە دەبێتە ئەو بابە وەکو {أنصر، أعلم،....} بۆ ئیعلال کردنی گشت بابەکان ئەوە بروانە بۆ تەصریفی زەنجانی شەرحی مامۆستا مەلا عبد الكريم مدرس خودا پلەی بەرز کات، ئەوەش بزانە تاکو ئێستا ئێمە لە ثلاثی مجرد بابەکانمان بە یەکەم و دووەم... لێك جودا دەکردنەوە بەڵام لێرە بەدواوە بە مصدەرەکان لێکتری جودا دەکرێنەوە. (**وهو قياسي**) واتە ئەم مصدەرە بۆ بابی ئیفعال قیاسیە، هەر فیعلێك

بکرێتە ئەو بابە ئەو مصدەرەری لێ دروست دەکرێت (**ویجوز أن یزاد بین الهمزة والفاء سین أو هاء علی خلاف القیاس**) دروستە زیاد بکرێت لە نێوان همزة زیادەکەو فاء الفعل پیتی {سین} یان {هاء} زیاد بکەیت، بەڵام ئەو زیادکردنە وەنەبێت بە گوێرەی یاسای سەرفی بێت بەڵکو لادانە لە یاسای سەرفی بۆ ئەم بابە، چونکە یاسای ئەم بابە تەنها زیادکردنی همزة مەفتوحەکەی سەرەتایەتی نەك شتێکی دیکە. وە هەندێك لە زانایان دەفەرموون ئەو کاتە دەتوانیت ئەو دوو پیتە لەو بابە زیاد بکەیت کە {أجوف} بێت وەکو نمونەکان وا نیشان دەدەن (**نحو أسطاع یُسْطِیعُ إِسْطَاعاً**) ئەسلی {أَسْطَاعَ} {أَطْوَعَ} بوو وەکو {أکرم} واو قەلب کراوە بە ئەلف و سینیش زیاد کراوە بوو بە {أسطاع}، {یسطیع} ئەسلەکەی {یُطْوِعُ} بووە وەکو {یکرم} واو کراوە بە یێ پاشان سین زیاد کراوە، {إسطاعا} ئەسلەکەی {إطواعا} بوو وەکو {إکراما} واو کراوە بە ئەلف جا دوو ئەلف کۆبوونەوە جا یەکمان لابرد {تێ}مان لە جیاتی هێناو سینەکیشمان زیاد کرد پاشان تێ یەکمان حەزف کرد بووە {إسطاعا} ئەم باسە لە شوێنی خۆی باس دەکەین {إنشآءالله} (**وأهْرَاقَ یُهْرِیقُ إهْرَاقاً**) ئەمەش ئەسلەکەی بە کورتی {أراق یریق إراقة} بوو ئیعلالی وەکو پێشەخۆی وایە کە هاء لە مصدەرەکەی زیاد کراوە وە هەروەها لە مصدەرەکەی تێ لادراوە (**وهو للتعدیة غالبا نحو أکرمته**) ئەم بابە زیاتر بۆ تەعدیە هاتووە وەکو {أکرمته} ئەسلەکەی {کَرُمَ} بوو کە لازم بوو کە نەقلێ کرا بۆ بابی ئیفعال بوو بە متعدی، واتە: مەفعولی بۆ زیاد بوو —پشت بە خوا لە داهاتوو زیاتر ئەو باسە روون دەکەینەوە- (**وفَعَّلَ نحو فَرَّحَ یُفَرِّحُ تَفْرِیحاً**) ئەمە عەتفە بەسەر {أکرم}ی واتە بابی دووەم لەو سێ بابانەی پیتێکی لێ زیاد کراوە لەسەر سێ پیتە ئەسلەکەی {فَعَّلَ}یە ئەوە میزانە مەوزونەکەی دەبێتە {فَرَّحَ یُفَرِّحُ تَفْرِیحاً} ئەو {فَرَّحَ}یە پێشتر {فَرِحَ} بووە ثلاثی مجرد بوو لە بابی چوارەم عین الفعل دووبارە کراوە، واتە رێی لێ زیادکرا بوو بە بابی {تفعیل} وە هەر ثلاثی مجردێك ئەوها عین الفعل ی دووبارە ببێتەوە دەبێتە ئەم بابە (**وهو الأکثر**) واتە مصدری بابی تەفعیل

بە زۆری لەسەر وەزنی {تَفْعیلاً} دەبێت وەکو {تَفْريحاً} (**وتفعِلة**) هەروەها مصدەری ئەو بابە لەسەر وەزنی {تَفْعِلَةً} هاتووە، وا دیارە {ی} لادرا بێت {ت}ی لە جیاتی داندرا بێت (**وعن ناس فِعال**) بیستراوە لە خەڵكی عەرەب كە ئەم بابە مصدرەكەی لەسەر وەزنی {فِعال}یش هاتبێت، ئەمەش بە شەددەی عین دكەو هەروەها بە سووكی {عین}دكەش (**وهی قیاسیة**) ئەم سێ وەزنەی مەصدەرە بۆ ئەم بابە قیاسینە، واتە دەتوانی لە هەموو نمونەیەك دروستی بكەیت (**ویكون للتكثیر في الفعل أو الفاعل أو المفعول**) ئەم بابە بۆ {تكثیر} زۆركردن و زۆربوون هاتووە، جا ئەم زۆریە لە فیعلدا بێت وەكو {طَوَّفْتُ الكعبة} واتە زۆر تەوافی كەعبەم كرد. یان لە فاعیل دەبێت وەكو {مَوَّتَ الإبل} واتە زۆر وشتر مردن، جای واش هەیە لە مەفعولی دەبێت وەكو {غَلَّقْتُ الأَبْوابَ}، جاری واش دەبیّ لە هەر سێكیان —فعل، فاعل، مفعول- دەبێت وەكو {قَطَّعْنا الأَثْوابَ} (**ولإخرَى**) واتە ئەم بابە بۆ هەندێك مانای دیكەش هاتووە وەكو تەعدیە {فَرَّحْتُ زیداً}، وە بۆ تەوەجووھ واتە روو تێكردن وەكو {غَرَّبْتُ} واتە رووم كردە رۆژئاوا، وە بۆ سەلبیش هاتووە واتە شتێك لە شتێكی دیكە دابڕنی وەكو {قَسَّرْتُ الفكهة} واتە توێكڵم لەم میوەیە كردەوە. (**وفاعَلَ نحو قاتَلَ يُقاتِلُ مُقَاتَلَةً وقِتالاً**) واتە بابی سێیەم لەم سێ بابەی كە پیتێكیان لەسەر زیاد كراوە {فاعَلَ}دیە، ئەوە میزانە مەوزونەكەشی {قاتَلَ يُقاتِلُ....} {قاتل} پێشان {قتل} بوو، واتە ثلاثی مجرد لە بابی یەكەم ویستمان بیكەینە بابی {مفاعلة} ئەلفێكمان لە نێوان فاء الفعل و عين الفعل زیاد كرد بوو بە {قاتل} وە هەر فیعلەك ویستت لە ثلاثی مجرد بیكەیتە ئەم بابە ئەوە بەم شێوەیە دەبێت وەكو {ناصر يناصر مناصرة ونصاراً} (**وهما كثیران**) ئەم دوو مصدرە زۆرن لە بابی {مفاعلة} (**وقال بعضهم قیتالاً**) هەندێك لە زانایانی عیلمی صەرف دەڵێن {قیتالاً}یشی هاتووە بە زیادەیی {ی}، وە هەندێكی دیكە {ی}ی دەكەن بە {ت} و دەغمی دەكەن دەڵێن {قِتَّالاً} (**والكل قیاسی علی الإختلاف**) ئەم سێ مەصدەرە بۆ ئەم بابە قیاسین واتە لە هەموو نمونەیەكی بابی

{مفاعلة} ئەم سێ مەصدەرە دروست دەبن، بەڵام خیلافەك لە هەردووەکانی دوایە هەیە کە هەندێك دەڵێن ئەوان سەماعین **(وهو للمشاركة)** واتە: ئەم بابە بۆ مشارکە هاتووە، واتە دوو کەس لە کارێکدا هاوبەش بن وەکو {ضارب زيد عمراً} واتە زەیدو عەمر لە یەکتریان دەدا **(ولإخرى)** واتە: ئەم بابە بۆ چەند واتای دیکەش هاتووە، یەکەم: {تكثير} وەکو {ضاعفته} واتە چەندانەو زۆرم کرد. دووەم **مجرد** واتە ئەو بابە بە مانای **مجردی** خۆی دێتەوە وەکو {سافر} بە مانای {سفر} دێتەوە.

سێیەم: بە مانای {موالات}دێت، واتە: لە دوای یەك هاتن وەکو {واليت الصوم} واتە رۆژ لە دوای رۆژ بە رۆژو بووم. وە بۆ چەند مانای دیکەش. **(والثاني ما كان ماضيه على خمسة أحرف بزيادة حرفين)** بەشی دووەم لەو سێ بەشەی کە هەیە بۆ ثلاثی مزید فیە ئەو فیعلەیە کە ماضیەکەی لەسەر پێنج پیت بێت بە زێدەکرنی دوو پیت، جا ئەوەش دەبێتە دوو بەش، بەشی یەکەم: ئەوەیە کە تێی لە یەکەمی بێت. بەشی دووەم: ئەوەیە کە {و} همزەی لە یەکەمی بێت. وەکو دەفەرمووێ **(فإما أوله التاء)** واتە یان پیتی یەکەمی تێ دەبێت **(مثل تَفعَّلَ)** ئەوە میزانە مەوزونەکەشی **(نحو تَكَسَّرَ يَتَكَسَّرُ تكسُّراً)** ئەمە بابی {تَفعُّل}ی پێ دەڵێن، نیشانەکەی ئەوەیە کە لەسەرەتای تێیەکی مەفتوح هەبێت وە عین الفعل ەکەشی دووبارە بکرێتەوە وەکو {تَكَسَّرَ} ئەسلەکەی {كسر}بوو وەکو {نصر}.

**(وهذا هو الكثير)** واتە مصدری ئەم بابەی بە زۆری لەسەر ئەم وەزنە دەبی کە {تَفَعَّلا} وەکو {تَكَسُّراً} **(وقد جاء تِفِعَّالٌ)** کەم جاریش مصدەری ئەم بابە لەسەر وەزنی تِفِعَّال دەبێت وەکو {تِمِلّاق و تِكِسَّار} **(وهما قياسان على الخلاف)** ئەم دوو وەزنەی مەصدەر بۆ ئەو بابەی قیاسین و لە هەموو مادەیەکی دروست دەبن، بەڵام خیلافێك لە هی دووەمیان هەیە هەندێکیان دەڵێن سەماعیە ناتوانی لە هەموو شوێنێك دروستی بکەیت **(وهذا الباب لمطاوعة فَعَّلَ)** ئەم بابە بۆ موتاوەعەی بابی {تفعيل} هاتووە، موتاوەعە لە زمانی عەرەبی بە واتای گێڕایەڵیو ملکەچی هاتووە، بەڵام لە لای زانایانی صەرف بەو مانایە دێت کە فاعیلی فیعلی یەکەم

کارێك بکات وە فاعیلی فعلی دووەم قبولی بکات، وە هەردوو فعلەکانیش لە پیتەکانی ئەسلیان وەکو یەك وابن (**نحو كَسَّرْتُهُ فتَكَسَّرَ**) واتە من شوشەم شکاند ئەویش قبولی ئەو شکاندنەی کرد، لێرەدا {كَسَّرَ} بابی {تفعیل}ە وە {تَكَسَّرَ}ەش بابی {تَفَعُّل}ە فاعیلەکەی قبولی فعلی فاعیلی یەکەمی کردووە کە شکاندنی شوشەیە لە پیتە ئەسلەکانیش یەکن (**وللتكلف اى يتكلف الفاعل ان يجد فيه الفعل**) ئەم بابە بۆ تکلف هاتووە واتە فاعل خۆی ماندوو بکات و هەول بدات کە ئەم صیفەتە لە خۆی بێنێتە دی چونکە پێی خۆشە ئەم صیفەتەی تێدا هەبێت (**نحو تحلم اى تكلف الحلم**) واتە خۆی ماندوو کردو هەوڵی دا صیفەتی حلم و نەرم و نیانی لە خۆی بێنێتە دی (**ولمعان اخر**) ئەم بابە بۆ چەند واتای دیکەش هاتووە: یەکەم: بۆ پاراستن لە ئەسلی فعلەکە وەکو {تَأَثَّمَ} واتە خۆی پاراست لە إثم و گوناه، ئێستا إثم ئەسلی تَأَثَّمَ یە. دووەم: بۆ طلب هاتووە وەکو {تَعَظَّمَ} واتە داوای گەورەیی کردو خۆی بە گەورە زانی. سێیەم: بۆ تەدریج هاتووە وەکو {تعلمت الحساب بابًا بابًا} خۆم فێری حساب کرد باب لە دوای باب. (**وتفاعل نحو تباعد يتباعد تباعداً**) بابی دووەم لەو فعلەی کە مەزیدە بە دوو پیت وە تێی لە یەکەمە {تفاعل}یە، ئەمە میزانە مەوزونەکەی {تباعد يتباعد تباعدا} تباعد ئەسلەکەی {بَعُدَ} بوو وەکو {حَسُنَ} تێیەکی مەفتوحمان لە سەرەتای زیاد کرد، هەروەها ئەلفێك لە نێوان فاء الفعل و عين الفعل بوو بە {تباعد} وە هەر فعلەك لە ثلاثی مجرد بتەوێت بیکەی بەم بابە ئەمەی گوتمان نیشانەکەیەتی (**وهذا للمشاركة**) ئەم بابە بۆ مشارکە هاتووە، واتە: چەند کەسانێك بەشداربن لە ئەنجامدانی کارێك (**بجعل المشاركين أو الشركاء فاعلا معا**) وە ئەم هاوبەشیە بەم جۆرەیە ئەگەر دوو بن ئەوا هەردووکیان پێکەوە دەبنە فاعل، وە ئەگەر لە دووانیش زیاتر بن ئەوا هەموویان پێکەوە دەبنە فاعل وەکو {تضارب زيد وعمر وبكر} (**بخلاف المشاركة المفاعلة**) واتە: مشارکەی ئەم بابە وەکو مشارکەی بابی مفاعلە نییە (**فإنها بجعل أحدهما أو أحدهم فاعلا والباقى مفعولا**) واتە: بابی مفاعلە

یەکی لە دووان یان یەکی لە زۆران ئەگەر زۆر بن دەکاتە فاعل ئەوانی دیکە دەکاتە مفعول بۆ نمونە {ضارب زید عمرا} (**والعكس ضمني**) بەلاّم پێچەوانەی ئەمە لە ژێرەوە هەیە، واتە: ئەوەی لەبەر چاو فاعلە خۆی مفعولیشە وە ئەوەی لەبەر چاوان مفعولە خۆی فاعلیشە چونکە هەردووکیان لە ئەنجامدانی کارەکە هاوبەشن (**وللتكلف بإظهار الفاعل الفعل من نفسه**) ئەم بابە بۆ —تكلف- هاتووە، واتە: کە فاعل خۆی ماندوو بکات و هەوڵ بدات کە ئەم فعلە لە خۆی بێنێتە دی لەبەر مەبەستێك (**وهو منتف عنه ولا يريد إيجاده فيه**) وە ئەم فعلەش کە لە خۆی پەیدا دەکات لەم فاعلە مەوجود نییە لە هەمان کاتدا ناشیەوێت کە هەقیقەتەن لێیدا بێتە جێ چونکە کارێکی ناپەسەندە. لێرەدا دەرکەوت کە تكلف ی ئەم بابە جیاوازە لەگەڵ تكلف ی بابی {تَفَعُّلْ} (**نحو تَجاهل**) واتە خۆی بە نەزان و گێل پیشاندا وە لە راستیدا نەزانیش نییە وەناشیەوێت نەزان بێت، بەلاّم لەبەر مەبەستێك خۆی وا پیشان دەدات. هەر لەسەر ئەوە پارچە شعرێك هەیە کە کاتێك شاعیر دەچێتە شوێنێك خەڵکەکە هەمووی نەزانن هەوڵ دەدات خۆی وەکو ئەوان بە نەزان و گێل پیشان بدات بۆیە دەڵێت:

**فلما رأيت الجهل في الناس شائعا**

**تجاهلت حتى ظن أني جاهل**

(**ولمطاوعة فاعل نحو باعدته فتباعد**) بابی تفاعل بۆ متاوعەی بابی مفاعلەش هاتووە وەکو {باعدت زیدا فتباعد زید} من زەیدم دوور خستەوە ئەویش قبولی دوور خستنەوەی کرد.

جا لە پێشدا ثلاثی مزید فیە کە بە دوو پیت زیاد کرابێت یات تێی لە سەرەتاوە هەیە کە دوو بابی هەبوو، یان بە همزەی دەست پێدەکات ئەمەش سێ بابی هەیە جا فەرمووی (**وإمّا أوله همزة**) واتە: ثلاثی مزید فیە بە دوو پیت یان سەرەتاکەی بە همزەی دەست پێدەکات وەکو (**مثل إنقطع ينقطع إنقطاعا**) ئەمەش بابی إنفعال پێ دەڵێن، نیشانەی ئەم بابە نونێکی ساکنە لەگەڵ همزەی مەکسور لە پێش نونەکەی

(**إنقطاعا وهو لمطاوعة فَعَلَ**) ئەم بابە بۆ متاوعەی {فَعَلَ}ی هاتووە کە دەکاتە ثلاثی مجردی متعدی وە لای یەك مفعول (**نحو كَسَرْتُهُ فانْكَسَرَ**) واتە: من ئەو شتەم شکاند ئەویش قبولی کرد (**وقد جاء لمطاوعة أفعل**) هەندێك جار بابی {إنفعال} بۆ متاوعەی بابی {إفْعال}یش هاتووە (**نحو أسفقت الباب وأزعجته فانفسق وانزعج**) ئێستا ئەم دوو فعلە {أسفق} وە {أزعج} هەردووکیان بابی {إفعال}ن، وە {انفسق}و {انزعج} بابی {إنفعال}ن، هەردوکیان بۆ متاوعەی {أفعل} وە {أزعج}ی هاتوون. (**ولا يبنى إلا مما فيه علاج وتأثير**) بابی إنفعال دروست ناکرێت مەگەر لەو جۆرە فعلانە نەبێت کە بە ئەندامەکانی {ظاهر}ی واتە: لەبەر چاو دیار بێت وەکو —إنکسر، إنقطع- ......(**ولذا قيل إنعدم خطأ**) واتە: لەبەر ئەوەی کە گوتمان مەرجە بۆ بینای ئەم بابە دەبێ بە ئەندامانی زاهیری بێت گوتراوە {إنعدم} کە بابی {إنفعال}ە و ئەسلەکەی {عَدَمَ} بووە هەڵەیە چونکە نەبوون شتێکی دیارو بەرچاو نییە ئێمەش گوتمان دەبێت زاهیری بێت (**وإذا فاء إنفعل حرفا من حروف يرملون**) هەرکاتێك فاء الفعل ی بابی إنفعال پیتێك بوو لە پیتەکانی بابی یرملون کە دەکاتە {ي، ر، م، ل، و، ن} (**قلبت النون به أدغم فيه**) لەو کاتە قەلبی نونە زیادەکە دەکرێت بە وێنەی ئەم فاء الفعل ە پاشان لە فاء الفعل ەکەی دەغم دەکرێت، بۆ نمونە {إنرحم} بابی {إنفعال}ە قەلبی نونەکەی دەکرێ بە رێ کە فاء الفعل ە دەغمی دەکەین دەبێتە {إرَّحَمَ} وە لە —مضارع- و مصدەر و....هتد بەم شێوەیە دەبێت. یەکێك پرسیار دەکات و دەڵێت بۆ لە {إنوتر}ی نون نەکراوە بە واو کە تەواوی یاسای رابردووی لێ هاتۆتە جێ؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت (**وفي ناتر أصله إنوتر قدم الإعلال على الإدغام**) لە {ناتر}ی کە ئەسلەکەی {إنوتر} بووە، هەقی إعلال و إدغامی هەیە، بەڵام إعلال بە پێش إدغام خستراوە، چونکە ئەگەر نون قەلب بکرێت بە واو و ئنجا دەغم بکرێت بە گوێرەی ئەم یاسایە دەبێتە {إوَّتر} بەڵام إعلال بە پێش خستراو واو قەلب کرا بە ئەلف وە حەزفی همزەمان کرد بوو بە {ناتر} (**وافتعل نحو إجتمع يجتمع**

**إجتِماعاً** ) ئەمەش عەتفە بەسەر {إنفعل}ەی، واتە: یەکی دیکەش لە بابەکانی ثلاثی مزید فیە بە دوو پیت و همزەی لە سەرەتاوە هەبێت {إفتعل}یە ئەمە میزانە مەوزونەکەی بریتیە لە {إجتمع يجتمع إجتِماعاً} ئەمە بابی إفتعال ی پێ دەڵێن، نیشانەی ئەم بابە ئەوەیە هەر فعلێکی –ماضی- لە ثلاثی مجرد بتەوێ بیکەی بە بابی إفتعال همزەیەکی مەکسوری لە یەکەمی دابنێ لەگەڵ تێیەکی مەفتوح لە نێوان فاء الفعل و عين الفعل وەکو {إنتصر و إكتتب...} (**وهو لمطاوعة فَعَلَ نحو جمعته فاجتمع**) ئەم بابە بۆ متاوعەی {فَعَلَ} واتە: ثلاثی مجرد هاتووە وەکو {جَمَعْتُ الإبل} وشترم کۆکردنەوە {فاجتمع الإبل} ئەوانیش قبولی کۆکردنەوەیان کرد (**وبمعنى تفاعل للمشاركة**) ئەم بابە هەندێك جار بە مانای بابی {تفاعل} هاتووە لە کاتێکدا کە بۆ مشارکة بێت، نەك بە مانای تكلف یان ماناکانی دیکە بێت (**نحو إختصموا**) ئێستا ئەم فعلە بابی إفتعالە بەڵام بە مانای {تخاصموا} هاتووە (**ولإخرى**) واتە: ئەم بابە بە چەند واتای دیکەش هاتووە، یەکەم: لإتخاذ واتە وەرگرتنی شتێك لە مانای فعلەکە وەکو: إختدم زيد، واتە: زيد خزمەتکارەکی گرت. دووەم: إجتهاد واتە: خۆ ماندووکردن و کۆشش وەکو: إكتسب. وە بۆ غەیری ئەو مانایانەش. جا لێرەوە قاعیدەیەکی ئەو بابە باس دەکات و دەفەرمووێ (**واذا كان فاء افتعل حرفا من حروف أتثدذز سشص ضطظوىّ**) واتە: هەر کاتێك فاء الفعلی بابی إفتعال یەك بێت لەو چواردە حەرفانە کە پێیان دەڵێن پیتەکانی بەیت، کە بریتین لە {أ، ت، ث، د، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، و، ی} (**جاز الإدغام بقلب التاء إليه**) دروستە قەلبی تێی زیادەکە بکرێ بە وێنەی فاء الفعل پاشان فاء الفعلەکەی لە ناو دەغم دەکرێت وەکو {إسَّمَعَ} ئەسلەکەی {إسْتَمَعَ} بوو {تێ}مان کرد بە {س} جا سین مان لە سینی دووەم دەغم کرد بوو بە {إسَّمَعَ} (**لكنه خلاف القياس**) بەڵام ئەم ئیعلالە خیلاف و پێچەوانەی یاسایە، چونکە قاعیدە وایە کە قەلبی یەکەمیان بکرێت بە دووەم، لێرەدا بە پێچەوانەوە قەلبی دووەم کراوە بە هی یەکەم، بەڵام ئیدیغامەکە تەواوە چونکە سینی یەکەم دەغم کراوە لە سینی دووەم

**(وأیضاً)** هەروەها بۆ ئەم بابە یاسایەکی دیکە هەیە بەڵام ئەم یاسایە تایبەت نییە بەم بابە، بەڵکو ئەم جارە بابەکانی {تفعل و تفاعل} یش دەگرێتەوە، جا دەفەرمووێ **(إذا وقع بعد تاء إفتعل وتفاعل وتَفَعَّلَ من تلك الحروف)** هەر کاتێك واقع بوو لە دوای تێی {إفتعل وتفاعل وتفعل}ی پیتەك لەم چواردە پیتە **(یجوز الإدغام بقلب التاء بما بعده علی القیاس)** دروستە قەلبی ئەم تێیە زیادە بکرێت بەو پیتەی لە دوای خۆیەتی، جا لە {إفتعل}ی عین الفعلی دەگرێتەوە وە لە دووەکانی دیکە فاء الفعل دەگرێتەوە. وە ئەم ئیعلالە لە هەر سێ بابەکان بە گوێرەی یاسایە چونکە قەلبی یەکەمی دەکرێت بە دووەم وەك لە نمونەکان دەردەکەوێت **(وزیادة الهمزة في الأخیرین)** جا لە دوای ئەنجامدانی قەلب و دەغم هەمزەیەکی وەصل زیاد دەکرێت بۆ دووەکانی دوایێ تاکو تووشی ئەوە نەبین کە ئیبتیدا بە ساکنی بێت کە ئەوەش قەدەغەیە **(نحو إِطَّهَّرَ إِثَّاقَلَ)** {إطَّهَّرَ} ئەصلەکەی {طَهُرَ} بوو کردمان بە بابی {تَفَعُّلْ} بە زیادکردنی تێ یەکو دوو قات کردنەوەی عین الفعلی بوو بە {تَطَّهَرَ} پاشان تێی بچوکمان کرد بە {ط}ی گەورە پاشان {ط} یەکەم ساکن کراو لە {ط}ی دووەم دەغم کرا پێویستمان بە هەمزەی وەصل بوو بۆمان زیاد کرد بوو بە {إطَّهَّرَ}، وە {إثَّاقَلَ} ئەصلەکەی {ثقل} بوو تێ و ئەلف زیاد کران بوو بە {تثاقل} پاشان تێ کرا بە {ثا} ئنجا هەردوو ثێی یەکەم لەهی دووەم دەغم کرا پاشان همزەی وەصلمان بۆ زیاد کرد بوو بە {إثّاقل} **(وحذف همزة الأول للإستغناء)** دروستە همزەی وەصل لە هی یەکەم لا ببرێت کە {إفتعل}یە چونکە لە دوای ئیعلال کردنی پێویست بە همزە ناکات، جا لەم بابەدا زۆر شێوە دروستن یەکە بە یەکەیان باس دەکات و دەفەرمووێ **(فیجوز في ماضیه فتح الفاء بنقل حرکة التاء إلیها)** دروستە لە —ماضی- ئەم بابە فاء الفعل مفتوح بکرێت بە هۆی نەقل کردنی تێی زیادەکە بۆ لای فاء الفعل وەکو {خَصَّمَ} **(وکسرها بتحریکها بالکسر)** وە دروستیشە فاء الفعل مکسور بکرێت **(لأنه الأصل في تحریك الساکن)** چونکە ئەم فاء الفعلە پێشان ساکن بوو، وە ئەصلیش وایە هەر کاتێك

ساکن حەرەکەدار بکرێت بە کسرەی حەرەکەدار بکرێت، بۆ نمونە {إِخْتَصَمَ} کە بابی افتعالە تێ کرا بە {ص} وە فەتحەکەمان دا بە فاء الفعل کە {خ}یە پاشان صاد لە صادی دەغم کرا بوو بە {إِخَصَّمَ} پاشان همزەمان لادا، جا دروستە بلێی {خَصَّمَ} بە فتحەو کسرەی خائەکەی (**ویجوز الإثبات نظراً إلى أصل السکون**) وە دروستە ئەم همزە لە شوێنی خۆی بمێنێت، چونکە تەماشای ئەوە دەکرێ کە ئەو فاء الفعلە لە ئەصلدا ساکن بووەو پێویستی بەو همزەیە هەیە، وە ئێستا هەرچەندە ساکن نییە بەڵام بە هۆی ئەوەی کە حەرەکەی ئەصلی نییەو لەلا را هاتووە {عارضی}یە هیچ نرخەکی وای بۆ نییە کە حساب بۆ حەرەکەی بکرێت (**مع فتح الفاء وکسره**) جا لەو کاتەی همزە هەیە فاء الفعلەکە فتحەو کسرەی تێدا دروستن وەکو {إِخَصَمَ} لێرەوە بۆمان بە دیار کەوت کە ماضیەکەی چوار شێوەی تێدا دروستن کە ئەمانەن: ١- خَصَّمَ ٢- خِصَّمَ ٣- إِخَصَّمَ ٤- إِخِصَّمَ دوانیان بە همزەو دوانیشیان بە بێ همزە. پاشان دێتە سەر باسی -مضارع- ەکەی بزانین چەند شێوەی تێدا دروستن (**وفي مضارعه فتح الفاء وکسره**) دروستە لە -مضارع- ەکەش فاء الفعل مکسور و مفتوح بکرێت (**مع فتح حرف المضارعة أوکسرها**) واتە: کە دروستە فاء الفعل بەم دوو شێوەیە بە فەتحەو کەسرەی بێت لەگەڵ فەتحەو کەسرەی حەرفی -مضارع-ی دروستن کە هەمووی دەکاتە چوار شێوە، کە ئەمانەن: یەکەم: يَخَصِّمُ دووەم: يَخِصِّمُ سێیەم: يِخَصِّمُ چوارەم: يِخِصِّمُ (**اتباعا لکسرة الفاء**) یانی لە کاتێکدا حەرفی -مضارع-ەتی مەکسور دەبێت کە فاء الفعل مکسور بێت. ئەم عیبارەتە وا دەگەیەنیت کە تەنها ئەو کاتە حەرفی -مضارع-ەتی مەکسور نابێت مەگەر فاء الفعل مکسور بێت. کەچی واقیع وا نییە چونکە دروستە حەرفی -مضارع-ەتی مکسور بێت ئەگەرچی با فاء الفعل مکسور نەبێت وەکو {يِخَصِّمُ} بۆیەش چوار شێوەی تێدا دروست بوون، کەواتە لێرەدا دەتوانین بڵێین بۆیە مەکسور دەبێت کە فاء الفعل مەکسور بێت لەو کاتەش کە مفتوحە بۆیە مەکسوری دەکەین بە حمل وە سەر حالەتی کسرەی (**وفي مصدره ثبوت الهمزة وحذفها کما في**

**الماضي)**لە مصدەرەکەشی هەموو شێوازەکانی فعلی —ماضی- دروستن، کە چوار شێوەی تێدا دروستن، دووانیان بە فەتحەو کسرەی فاء الفعلی و بەبی همزە، دوانیشیان بە فەتحەو کسرەی بەڵام لەگەل هەبوونی همزەی کە ئەم شێوازەن: یەکەم: إخِصَّاماً دووەم: إِخَصَّاماً سێیەم: خَصَّاماً چوارەم: خِصَّاماً (**وفي اسم الفاعل كسر الميم اتباعا لكسرة الفاء**) دروستە لە ئیسم فاعل میمی نیشانەی ئیسم فاعلی مەکسور بکرێت لەبەر تەبەعیەتی فاء الفعل، بەڵام ئەوەندە هەیە وەکو فیعلی —مضارع-ی ئەگەر فاء الفعل مکسوریش نەبێت ئەوا میمەکە هەر مکسور دەبێت. لێرەشدا بە هەمان شێوەکانی رابردوو چوار شێوازی تێدا دروستن جارێکیان میمی ئیسم فاعل —مضموم- بێت خائیش فەتحەو کسرەی تێدا دروستن، جارێکیشیان میم مکسور بێت خائەکەش فتحەو کسرەی تێدا دروست بێت، کە ئەمانەن: مُخَصِّم دووەم: مُخِصِّم سێیەم: مِخَصِّم چوارەم: مِخِصِّم (**وقيل لا يجوز حذف الهمزة في ماضي الإفتعال لئلاّ يلتبس بالتفعيل**) گوتراوە دروست نییە همزەی بابی ئیفتیعال لاببرێت تاکە ئیلتیباسی بە —ماضی- بابی تەفعیل نەبێت، چونکە هەر کاتێك همزە لە {اخَصَّمَ} لابرێتەوە دەبێتە {خَصَّمَ} وەکو {فَرَّحَ}، ئەو ئیلتیباسەش تەنها لە فیعلی —ماضی- هەیە وە لە صیغەکانی دیکە نییە، چونکە لە —مضارع-ی حەرفی هەردووکیان لێك جیاوازن، واتە: لە بابی تفعیل حەرفی —مضارع-ەتی —مضموم-ە بەڵام لە بابی ئیفتیعال مفتوحە کەواتە بە فەتحەو ضمەی لێك جیا دەکرێنەوە (**وإفعلَّ نحو إحْمَرَّ يَحْمَرُّ إحْمِراراً**) ئەمەش عەتفە بەسەر {افتعل}ەی یانی بابێکی دیکە لە ثلاثی مزید بە دوو حرف و همزەی لە ئەوەلی بێت {افعلّ}یە، ئەمە میزانە مەوزونەکەی {احمر يحمر احمرارا} ئەمەش بابی {افعلال}ی پێ دەڵێن، نیشانەکەشی ئەوەیە کە همزەیەکی لە ئەوەلی زیاد کرابێت و لام الفعلی دووبارە بکرێتەوە (**وهو للمبالغة**) ئەم بابە بۆ مبالغە هاتووە، چونکە {حمر} واتە سۆر بوو، بەڵام {احمرّ} واتە: زۆر سۆر بوو (**ويختص بالألوان والعيوب**) وە ئەم بابە تایبەتە بەو جۆرە فعلانە کە بە مانای رەنگ و عەیب بن، وەکو {احمر، اسود} ئەمە

نمونەی رەنگ وە مبالغەشی تێدا هەیە، نمونەی عەیبیش وەکو {اعور} وە مبالغە لێرەدا مەرج نییە چونکە بە مانای کوێرە بوونە ئەگەر کابرا کوێرە بوو تەواو. گوتمان ثلاثی مزید سێ بەشی هەیە، مزید بە یەك پیت کە سێ بابی هەبوو، مزید بە دوو پیت کە پێنج بابی هەبوو. ئنجا دێتە سەر باسی مزید بە سێ پیت بۆیە فەرمووی (**والقسم الثالث ما كان ماضيه على ستة أحرف**) بەشی سێیەم لەو سێ بەشانەی بۆ ثلاثی مزید هەیە ئەوەیە کە —ماضی-ەکەی لەسەر شەش پیتانە سێیان ئەصل وسێشیان زیادن (**مثل إستفعل**) ئەمە میزانە مەوزونەکەی (**إسْتَخْرَجَ يَسْتَخْرِجُ إسْتِخْراجاً**) {استخرج} ئەصلەکەی {خرج} بوو لە بابی یەکەم وەکو نصر ویستمان لە ثلاثی مجرد بیکەین بە ثلاثی مزید لە بابی استفعال، همزەیەك لەگەڵ سینەکی ساکن و تێیەکی مفتوح لە ئەوەڵی زیاد کران بوو بە {استخرج} وە نیشانەی ئەم بابە زێدەکردنی ئەو سێ پیتەیە لە سەرەتای (**وهو لطلب الفعل تحقيقا**) ئەم بابە بۆ داواکردنی فعل هاتووە، یانی فاعل داوای ئەصلە فعلی لە مفعولی دەکات جا ئەم داوایەش حەقیقی هەیە لە کاتێکدا مفعول شایستەی ئەوە بێت داوای فعلەکەی لێ بکرێت و ئەویش بتوانێت ئەنجامی بدات (**نحو إستخرجت زيدا**) واتە: داوام لە زید کرد بێتە دەرەوە، بێگومان ئەمە نمونەی حەقیقیە چونکە مفعول کە زەیدە شیاوی ئەوەیە کە حەقیقەتەن داوای هاتنە دەری لێ بکرێت (**او تقديرا**) یان داواکردنەکە تەقدیریە، لە کاتێکدا مفعول شیاوی ئەوە نەبێت کارەکە ئەنجام بدات بەڵکو تۆ وای دادەنێی کە شیاوی ئەوەیە داوای لێ بکرێت لە حەقیقەتیش شیاو نییە (**نحو استخرجت الوتد من الحائط**) واتە: داوام لە سنگی کرد بێتە دەرەوە، بێگومان ئەم داوایە تەقدیریو فەرزییە چونکە سنگ لە وانە نییە کە بە خۆی بتوانیت ئەو کارە بکات، بەڵام کە تۆ سنگ دەگریورای دەکێشیە دەرەوە ئەوە بە داوا لێکردن دەژمێردرێت (**ولوجوده على صفة**) ئەم بابە هاتووە بۆ ئەوەی فاعل مفعولی لەسەر صیفەتەکی دەبینیت کە ئەصلی فعلەکەیە (**نحو إستعظمته**) واتە: فلان کەس هاتە بەرچاوم بە گەورەو {عظیم}

ئێستا {استعظم} بابی {استفعال}ە، فاعلەکە کە تائە فاعلە مفعولەکەی خۆی کە مەرجەعی هائەکەیە دیوە لەسەر صیفەتەکی کە {عظمة}و گەورەییە، چونکە {عظمة} ئەصلە مصدەری {استعظم}یە (**وللتحول**) ئەم بابە هاتووە بۆ وەر گێڕانی فاعلەکەی بۆ ئەصلی فعلەکەی، کە مصدرە، واتە: فاعل لە صیفەتەکدا وەردەگێرێت دەبێتە ئەصلی فعلەکە کە مصدەرەکەیە (**کإستحجر الطين**) واتە: قوڕ بوو بە بەرد، ئێستا ئەو فعلە کە {استحجر} فاعلەکەی خۆی کە {الطين}ە وەرگێڕاوەو گۆڕیوە بۆ ئەصلی فعلەکەی کە {حجر}ە چونکە {حجر} مجردی {استحجر}یە (**وبمعنى المجرد**) ئەم بابە بە مانای ثلاثی مجردیش هاتووە (**کإستقرّ بمعنى قرّ**) ئێستا {استقر، بە ماعنای مجردی هاتووە کە {قرّ}یە، تەنها ئەوەندە هەیە مزیدەکە مبالغەی زیاترە ئەگینا هیچ گۆڕانی دیکەی بەسەر دانەهیناوە (**ویجوز حذف تائە**) دروستە لەم بابە تێ زیادەکە لاببرێت بەڵام لابردنەکە پێچەوانەی یاسایە (**نحو إسطاع**) ئەصلەکەی {استطاع} بووە حەزفی {ت}ەکە کرا بوو بە {اسطاع}. لە پێشەوە باسمان کرد کە بابی ئیفعال هەندێك جار سین یان هائی بۆ زیاد دەکرێت، وە لەم بابەش ئەوەمان زانی کە هەندێك جار سینی لێ لا دەبرێت، لێرەدا ئێرەو بابی ئیفعال —ماضی-ەکەیان لە شێوە وەکو یەك لێ هاتن چونکە هەردووکیان {اسطاع}یە، جا زانایان بە همزە جیاوازیان لە نێوان دەکەن، واتە: ئەگەر هاتوو همزە مفتوح بێت وەکو {أسطاع} ئەوە بابی ئیفعالە، کەچی ئەگەر همزە مکسور بێت ئەوە بابی {استفعال}ە وەکو {إسطاع} (**وافعالّ نحو احمارّ يحمارُّ احميرارا**) ئەمەش بابی إفعلال ە لە ثلاثی مزید بە سێ حەرفانە، نیشانەکەی ئەوەیە کە همزەکی مکسور لە ئەوەلی بێت وە ئەلفێك لە نێوان عين الفعل و لام الفعل زیاد بکرێت، لەگەڵ دوو قات کردنەوەی لام الفعل چونکە ئەصلەکەی {حمر} بووە وەکو {حسن} (**ويمتاز عن احمر بزيادة المبالغة**) ئەم بابە جیا دەبێتەوە لە بابی {احمرّ} بەوەی کە زیاتر مبالغەی تێدایە، چونکە {احمرّ} واتە سۆر بوو بەڵام {احمارّ} واتە زۆر زۆر سۆر بوو (**وافعوعل نحو اعشوشب**

**یعشوشب اعشیشابا**) بابێکی دیکە لە ثلاثی مزید بە سێ پیتان {افعوعل}یە ئەمە میزانە مەوزونەکەی {اعشوشب یعشوشب اعشیشابا} ئەمەش پێی دەگوترێت بابی {افعیعال}نیشانەی ئەم بابە ئەوەیە کە همزەیەکی مکسور لە سەرەتای دا بندرێت و عین الفعل دووبارە بکرێتەوە، وە واوێکی ساکن لە نێوان هەردوو عین الفعلەکان زیاد بکرێت چونکە ئەصلەکەی {عشب} بوو (**وهو للمبالغة**) ئەم بابە بۆ مبالغە هاتووە چونکە {عشب} واتە: کەمێك گیا شین بوو، بەلاّم {اعشوشب} واتە: زۆر گیا شین بوو (**وإفعوّل نحو إجلوّز یجلوّز إجلوّازا**) ئەمەش هەر لە ثلاثی مزیدە بە سێ حەرفان وە بابی {افعول}ی پێ دەڵێن، نیشانەشی ئەوەیە کە همزەیەکی مکسور لەگەڵ واوێکی {مشدّد} لە نێوان عین الفعل و لام الفعل، ئەمەش ئەصلەکەی {جلز} بوو وەکو {ضرب} ئەمەش هەر بۆ مبالغە هاتووە، چونکە {جلز} واتە رۆیشت بەلاّم {اجلوز} واتە: زۆر رۆیشت (**وإفعنلل نحو إقعنسس یقعنسس إقعنساساً**) ئەمەش بابی {افعنلال}ە نیشانەکەشی ئەوەیە همزەیەکی مکسور لە سەرەتاو وە نونێکی ساکن لە نێوان عین الفعل و لام الفعل لەگەڵ دووبارە کردنەوەی لام الفعل، چونکە ئەصلەکەی {قعس} بوو، ئەمەش وەك ئەوانی دیکە بۆ مبالغە هاتووە (**وإفعنلی نحو إسلنقی یسلنقی إسلنقاءاً**) ئەمەش وەك ئەوانی پێشەخۆی عەتفە بۆ ئەوی پێشە خۆی، پێشی دەگوترێت بابی {افعنلاء} نیشانەکەشی ئەوەیە همزەیەکی مکسور لە سەرەتاو وە نونێکی ساکن لە نێوان عین الفعل ولام الفعل لەگەڵ یائەکی مفتوح لە کۆتایی، بەلاّم ئەم یائە دواتر لە —ماضی- کراوە بە ئەلف، وە لە مصدریش کراوە بە همزە (**وهذان الأخیران ملحقان بإحرنجم**) ئەم دوو بابەی دوایی کە دەکاتە {افعنلل وافعنلی} هەر دوکیان مولحەقن بە {احرنجم}ی کە روباعی مزیدە بە دوو حەرفان، لێرەدا نامانەوێت دووبارە باسی ئیلحاق بکەین چونکە لە پێشەوە باسمان کرد، جا ئەم دوو بابەش لەسەر وەزنی {احرنجم}ەینە هەم لە ژمارەی حەرفەکان و هەم لە حەرەکەکان، وە مصدرەکەشیان رێکە وەکو مصدەری ئەوانە، بۆیە ئەم دوو بابە ملحقن بە رباعی

مزید بە دوو حەرفان (**وقال ابن الحاجب تَفَعَّلَ وتَفاعل أيضاً ملحقان يتدحرج**) ئیبن ولحاجب رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت لە کتیٚبی شافیەدا فەرموویەتی هەروەها ئەو دوو بابەش واتە {تفعل و تفاعل} کە هەر دووکیان ثلاثی مزیدن بە دوو حەرفان ملحقن بە {تدحرج}ی کە رباعی مزیدە بە یەك حەرف، هەروەك چۆن هەردووکەکانی پیٚشتر ملحق بوون بە {إحرنجم}ی چونکە ئەم دووانەش وەکو {تدحرج}ی وانە لە ژمارەی پیتەکان و لە حەرەکەکانیش کە دەکاتە ژیٚرو لەسەرو بۆرو سکون، چونکە لە هەموویان پیٚنج حەرف هەیە وە سکونەك لە نیٚوان چوار فەتحە هەیە دووانیان لە پیٚش و دووانیان لە پاش،کەواتە ئەمانە ملحقن بە رباعی مزید بە پیتەکی. بەلاّم مامۆستا مەلا عەلی بەو قسەیە رازی نییە بۆیە دەفەرموویٚت (**وليس بوجيه**) فەرموودەی ئیبنولحاجب بە هیٚزو ریٚك نییە، چونکە بۆ پالّپشتی ئەم فەرموودەیەی هیچ بەلّگەی پیٚ نییە (**لأن الزيادة للإلحاق لا تفيد إلاّ الزنة**) چونکە هەر پیتەك بۆ ئیلحاق زیاد بکریٚت مەرجە کە هیچ فائیدەو سوودەکی نەبیٚت تەنها ئەوە نەبیٚت کە فعلیٚك بیٚنیٚتە سەر وەزنی فعلیٚکی دیکە (**وفيهما إفادة المعانى أيضاً**) وە حال وایە کە زیٚدەکردن لەم دوو بابە سوودی ماناشی هەیە هەروەك سوودی هیٚنانە سەر وەزنی {دحرج}ەشیان هەیە. ماناکەش ئەوەیە کە لە پیٚشەوە زانیمان ئەمانە بۆ موتاوەعەو موشارەکەو مانای دیکەش هاتبوون، کەواتە: ناکریٚ ئەمانە بکریٚنە ملحەق.

ئەمەش پوختەی هەر چواردە بابەکانی ثلاثی مزیدە لەم نەخشەیەدا:

| ژمارە | جۆری زێدەیی پیتەکانی | مەوزونەکەی | نیشانەکەی | ماناکەی |
|---|---|---|---|---|
| 1 | مزید بە یەك حەرف | أكرم إكراما | همزەیەكی مفتوح لە سەرەتای | تعدية |
| ٢ | مزید بە یەك حەرف | فرّح تفريحا | دووقاتکرنەوەی عين الفعل | تكثير |
| ٣ | مزید بە یەك حەرف | قاتل مقاتلة | ئەلفێك لە نێوان فاء الفعل وعين الفعل | مشاركة |
| ٤ | مزید بە دوو حەرف | تَكَسّر تكسُّرا | تێ لە سەرەتاو دوو قات کردنەوەی عين | مطاوعة وتكلف |
| ٥ | مزید بە دوو حەرف | تباعد تباعدا | تێ لە ئەوەڵیو ئەلف لە نێوان فاء و عين | مشاركة وتكلف |
| ٦ | مزید بە دوو حەرف | انقطع انقطاعا | همزەی مكسورو نونی ساكن لە ئەوەڵی | مطاوعة |
| ٧ | مزید بە دوو حەرف | اجتمع اجتماعا | همزەی مكسور لە سەرەتاو تێ لە نێوان فاء و عين | مطاوعة |
| ٨ | مزید بە دوو حەرف | احمر احمرارا | همزە لە ئەوەڵیو دوو قات کردنەوەی عين | مبالغة |
| ٩ | مزید بە سێ حەرف | استخرج استخراجا | زیادکردنی همزەو سين و تێ لە سەرەتای | طلب |
| ١٠ | مزید بە سێ حەرف | احمار احميرارا | همزە لە ئەوەڵیو ئەلف لە نێوان عين ولام لەگەڵ دوو قات کردنەوەی لام | زيادة ومبالغة |
| ١١ | مزید بە سێ حەرف | اعشوشب اعشيشابا | همزە لە سەرەتاو واوی ساكن لە نێوان هەردوو عين و دووقات کردنەوەی عين | مبالغة |

| ژمارە | جۆری زێدەیی پیتەکانی | مەوزونەکەی | نیشانەکەی | ماناکەی |
|---|---|---|---|---|
| ١٢ | مزید بە سێ حەرف | اجلوز اجلوازا | زیاد کردنی همزەو وە واوەکی بە شەددە | مبالغة |
| ١٣ | مزید بە سێ حەرف | اقعنسس اقعنساسا | همزە لە سەرەتاو نونی ساکن لە نێوان عین ولام وە دوو قات کردنەوەی لام | ملحق |
| ١٤ | مزید بە سێ حەرف | اسلنقی اسلنقاءً | همزە لە سەرەتاو نونی ساکن لە نێوان عین ولام لەگەڵ یائەکی لە کۆتایی | ملحق |

## باسی ئەو بابانەی لەسەر چوار پیتان زیاد کراون

(**وأما الرباعي المزيد فيه فأمثلته تفعلل كتَدَحْرَجَ**) کاتێك مصنف رەحمەتی خوای لیٚ بێت بە تەواوی باسی ثلاثی مزیدی کرد، هاتە سەر باسی رباعی مزید فەرمووی: ئەو فعلەی کە رباعیە واتە چوار پیتەو هەر چوار پیتەکانی ئەسلین وە لەسەر ئەو چوار پیتە ئەسلیە پیتی بۆ زیاد کراون سێ بابی هەیە: {تفعلل}یە ئەمە میزانە مەوزونەکەی {تدحرج یتدحرج تدحرجا} ئەمە بابی رباعی مزیدە بە یەك پیتەو کە {ت} لە ئەوْدلیەتی، وە هەر بابەك رباعی مجرد بێت بتەوێت بیکەیتە ئەم بابە ئەوە تێیەکی لە سەرەتاوە بۆ زیاد دەکەیت وەکو {تزلزل} (**وهو لمطاوعة فعلل**) ئەم بابە بۆ موتاوەعەی رباعی مجرد هاتووە کە دەکاتە {فعلل} وەکو دەگوترێت {دحرجت الحجر فتدحرج الحجر} یانی بەردەکەم گلۆز کرد ئەویش قبولی گلۆز کردنی کرد (**وافعنلل نحو احرنجم يحرنجم احرنجاما**) دووەم باب لەو سێ بابەی بۆ رباعی مزید هەبوون {افعنلل}یە ئەمە میزانە مەوزونەکەی {احرنجم} ئەسلەکەی {حرجم} بوو وەکو {دحرج} رباعی مجرد بوو ویستمان بیکەین بە رباعی

مزید بە دوو حەرفان، همزەیەکمان لە سەرەتای زیاد کرد لەگەڵ نونێکی ساکن لە نێوان عین الفعل و لام الفعلی یەکەم بوو بە {احرنجم}ە وە ئەمەی گوتمان هەر ئەوەش نیشانەکەیەتی (**وهو لمطاوعته ایضا**) ئەمەش وەکو {تدحرج} بۆ متاوەعەی {فعلل} هاتووە وەکو دەگووترێت {حرجمت الإبل فاحرنجم ذلك الإبل} واتە: وشترەکانم کۆکردنەوە ئەوانیش قبولی کۆکردنەوەیان کرد (**وافعللّ نحو اقشعرّ یقشعرّ اقشعرارا**) ئەمەش بابی سێیەمە لەو سێ بابەی گوتمان بۆ رباعی مزید هەن. جا {افعللّ}ە میزانە مەوزونەکەی {اقشعرّ}ەیە ئەسلەکەی {قشعر} بوو وەکو {دحرج} نیشانەکەی ئەوەیە کە همزەیەکی مکسور لە ئەوەلی زید دەکرێت لەگەڵ دووبارە کردنەوەی لام الفعل، وەکو {اطمئنّ یطمئنُّ اطمئنانا} کەواتە ئەمەشیا مزیدە بە سێ پیتان. وە ئەم بابە بۆ مبالغە هاتووە چونکە دەگوترێت {قشعر جلد الرجل} واتە:کەمێك مووی پیستی گرژ بوو، بەڵام {اقشعرّ} واتە: زۆر گرژ بوو. لەوەی رابردوو بۆمان دەرکەوت کە رباعی مزید سێ بابی هەیە مزید بە حەرفێك وە مزید بە دوو حەرفان وە مزید بە سێ حەرفان. بۆ زانینی ئیعلالەکانیش ئەوە بگەڕێوە بۆ شەرحی مامۆستا مەلا عەبدول کەریمی مدرس.

لە پێشان گوتمان مصدەرەکانی ثلاثی مجرد هەموویان سەماعینە تەنها {مفعل} نەبێت، وە مصدەرەکانی ثلاثی مزید و رباعی مجرد وە رباعی مزید هەموویان قیاسی بوون. هەروەها باسی ئەوەشمان کرد کە مصدەرەکانی میمی لە ثلاثی مجرد لەسەر وەزنی {مفعل} دێت، بەڵام باسی ئەوەمان نەکرد ئاخۆ لە غەیری ثلاثی مجرد لەسەر چ وەزنەکی دێت، بۆیە ویستی لێرەوە باسیان بکات و فەرمووی (**ویجئ المصدر من غیر الثلاثی المجرد علی زنة اسم مفعوله قیاسا**) واتە: مصدەری میمی لە غەیری ثلاثی مجرد کە دەکاتە {ثلاثی بتەوێت بزانیت مصدەری میمی چییە؟ ئەوە برۆ سەیری ئیسم مفعولی بکە مصدەرەکە لەسەر هەمان وەزنی ئیسم مفعولی دێت بۆ نمونە {أکرم} مصدەری میمی لەسەر وەزنی ئیسم مفعولی دێت کە دەکاتە {مُکْرَم} وە {دحرج} مصدەری میمی لەسەر وەزنی {مُدَحْرَج} دێت، ئێستا

ئەم صیغانە دەتوانی بڵێی ئیسم مفعولن وە دەتوانی بڵێی مصدەری میمین بۆ لێك جیاکردنەوەشیا ئەوە دەبێن بە قەرینە لێکیان جودا بکەیتەوە. پوختەی باسەکە ئەوەیە کە مصدەری میمی بەو مصدەرە دەگوترێت کە میمیان لە سەرەتاوە هەبێت، جا لە ثلاثی مجرد لەسەر وەزنی {مَفْعل} دێت وە لە غەیری ثلاثی مزید لەسەر وەزنی ئیسمی مفعولی خۆی دێت. بۆ زانین مصدەرێکی دیکەش هەیە کە پێی دەڵێن: مصدەری {صناعی} دەستکرد، کە تەنها بۆ ئەو وشانەیە کە مصدەریان نییە کە پیتی {ی} پێوە دەلکێنیت، کەواتە هەر وشەیەك ئەگەر مصدەری نەبوو ئەگەر ویستت مصدەری بۆ دروست بکەیت ئەوە پیتی {ی} بە کۆتاییەکەی وە بلکێنە، بۆ نمونە کە بتەوێت مصدەر بۆ {إنسان} بێنیت ئەوە خۆی هیچ مصدەری نییە ئەوە پیتەکە بە کۆتایی دەلکێنیت و دەڵێی {إنسانيّة} وە لە {فاعل} دەگوندریت {فاعليّة}..

**تنبیه :**

ئەمە ئاگاداری مامۆستایانە بۆ قوتابیان کە ئاگاداری پێشوو بن و خۆشیان بۆ ئەوە ئامادە بکەن بۆ ئەوەی دێت چونکە زۆر گرنگە (**الفعل إما متعد وهو الذى يتجاوز مدلوله من الفاعل إلى المفعول به**) واتە: فعل ئەو جارە دابەش دەکرێت بۆ دوو بەش، چونکە یان متعدی واتە تێپەڕە یان لازم واتە تێنەپەڕە. جا متعدی ئەو فعلەیە کە ماناکەی تەجاوز بکات و تێبپەڕێت لە فاعلەوە بۆ لای {مفعول به} فاعلیش بەو ناوە دەڵێن کە فعلەکەی کردووە، مفعولیش جێگاو شوێنی فعلەکەیە، واتە: ئەو ناوەی کە فعلەکە بەسەر ئەودا هاتۆتە جێ وەکو (**کقولك ضربت زيدا**) ئێستا مانای {ضرب} واتە لێدان دەرچووە لە فاعلەوە کە {ت} بۆ لای {مفعول بە} کە زیدە (**ویسمی واقعا ومجاوزا**) ئەم جۆرە فعلە چۆن پێی دەگوترێت بە هەمان شێوە پێی دەگوترێت واقع چونکە لە فاعلەکەوە دەرچووەو واقیعی سەر مفعولی دەبی، وە هەروەها پێشی دەگوترێ مجاوز چونکە لە فاعلی تەجاوز دەکات و تێ دەپەڕی بۆ مفعولی (**وإما غير متعد**) ئەمە عەتفە بۆ سەر متعدی، یانی فعل

یان متعدی دەبێت وەکو گوتمان، یان غەیرە متعدی دەبێت (**وهو الذی لا یتجاوز مدلوله من الفاعل الی المفعول به**) فعلی غەیرە متعدی ئەوەیە کە تجاوز نەکات و تێبەپەڕی لە فاعلەوە بۆ لای مفعول بە (**وإن جاوز غیره**) فعلی متعدی ئەوەیە کە لە فاعلی تجاوز نەکات بۆ مفعول بە، ئەگەرچی بۆ چوار مفعولەکانی دیکەش تجاوز بکات. لێرەدا بۆمان دەرکەوت کە جیاوازی لە نێوان فعلی لازم و متعدی تەنها بە مفعول بە یە، چونکە فعلە متعدی کار لە هەموویان دەکات، بەڵام فعلی لازم ناتوانی کار لە مفعول بە بکات، کەواتە: فعلی لازم ئەو فعلەیە کە مفعول بە نەبێت و نەتوانیت منصوبی بکات ئەگەرچی هەموو مفعولەکانی دیکەی هەبن (**کقولك حسن زید**) ئێستا مانای {حَسُنَ} کە {حُسْن} واتە: جوانی لە فاعلەوە دەرنەچووە لە زەیدی بۆ لای هیچ کەس (**ویسمی لازما**) ئەم جۆرە فعلە هەروەك پێی دەڵێن غەیرە متعدی هەروەها پێشی دەڵێن لازم (**للزوم الحدث في الفاعل**) چونکە ئەم {حدث} واتە: ئەم فعلەی کە پەیدا بووە لازم و پێوە نوسی ئەم فاعلەیە وە لەوی دەرناچی بۆ هیچ کەسی دیکە (**بمعنی عدم التجاوز**) جا بزانە لازم دوو مانای هەیە، یەکەم: لازم مانای وایە ئەم فعلە لە فاعیلی جیا نەبێتەوە. دووەم: ئەوەیە کە جیا دەبێتەوە بەڵام بۆ کەس ناچیت. جا لێرەدا لازم مانای وایە کە لە فاعل بۆ کەسی دیکە ناچیت، نەك مانای وا بێت بڵێین ئەم فعلە هیچ کات لە فاعیلی جیا نەبێتەوە، چونکە دەبینین {قام، قعد} دوو فعلی لازمن وە لە فاعیلەکەشیان جیا دەبنەوە بەڵام بۆ کەسی دبیکە ناچن، هەر لەبەر ئەوە فەرمووی (**بمعنی عدم التجاوز**) یانی ئەم فعلە کە لازمە مانای وایە لەم فاعلەی نەچیت بۆ هیچ کەس، نەك مانای وابێت لە فاعیلی جودا نەبێتەوە (**وغیر واقع**) هەروەها ئەم فعلە ناوبراوە بە غەیرە واقیعیش، چونکە فعلەکە واقعی سەر {مفعول بە} نابێت. لەوەی رابردوو گووتمان فعل لازم و متعدی هەیە، ئنجا دێتە سەر ئەوە چۆن فعلی لازم دەکرێتە متعدی. دەفەرموو (**وتعدیه**) واتە: دەتوانی فعلی لازم بکەیتە متعدی لە ثلاثی مجرد بەم شێوەیە (**بجعل فاعل اللازم مفعول التعدیة**) تۆ دەگێڕی فاعیلی فعلە لازمەکەی بە

مفعول بۆ ئەو فعلەی دەیکەتە متعدی **(وشئ آخر فاعله)** وە شتێکی دیکە بکە بە فاعل بۆ ئەو فعلە متعدیەی، وە مانای فعلەکە هەر بۆ ئەو فاعلەیە جا چ فاعل بێت یان مفعول **(في الثلاثي المجرد)** حالی ئەم فعلە وابێت ثلاثی مجرد بێت جا دەیکەیتە متعدی **(بنقله إلى باب التفعيل والإفعال)** ئەم کردنە متعدیەش بە هۆی ئەوەیە کە ئەم فعلە لازمەی دەگوازیەوە بۆ لای یەك لە بابەکانی {الإفعال، والتفعيل} **(كفَرَّحْتُهُ وأَجْلَسْتُهُ)** واتە زیدم دڵخۆش کرد وە زەیدم دانیشاند. ئەم دوو فعلە پێشان لازم بوون تەنها فاعیلیان هەبوون بەڵام کە نەقڵ کران وەلای ئەم دوو بابە بوون بە متعدی. جا {فَرَّحَ} ئەصلەکەی {فَرِحَ} بوو وەکو {علم} عين الفعلی دووبارە کراوە بوو بە بابی تەفعیل. وە {أجلس} ئەصلەکەی {جلس} بوو وەکو {ضرب} همزەی مفتوحمان لە سەرەتای زیاد کرد بوو بە بابی إفعال. لەگەڵ ئەو نەقڵ کردنەی بوون بە متعدی فاعیلەکەیان بوون بە مفعول چونکە زەید لە کاتی لازمیدا فاعیل بوو کەچی لە کاتی متعدی بوون بە مفعول، وە فاعیلەکی دیکەمان بۆ هێنان کە {ت}ی ضمیرە. لێرەدا فعلەکە لە هەردوو حالەتی لازم و متعدی هەر هەمان فاعیل ئەنجامی داوە بەڵام جارێك بە خۆی کردووە، وە جارێك پێیان کردووە، چونکە {جلس} واتە زەید دانیشت بەڵام {أجلس} واتە زەیدیان دانیشاند، دانیشتنەکە هەر زەیدە. **(وقد يتعدى بالمفاعلة والإستفعال)** هەندێك جار لازم دەبێتە متعدی بە هۆی نەقل کردن وەلای بابەکانی {مفاعله، وإستفعال} وەکو {إستخرجت زيداً} وە {باعدت زيداً} ئێستا هەر دوو فعلەکانی {خرج و بعد} لازمن، بە نەقل کردنیان بۆلای ئەم دوو بابە بوون بە متعدی، واتە: فاعیلەکەیان بووبە مفعول وە فاعیلەکی دیکەمان بۆ هێناون، بەڵام لە کاتی لازم و متعدی هەر زید خاوەنی فعلەکەیە، تەنها ئەوەندە هەیە جارێك خۆی کردوویە جارێك پێیان کردووە، وەکو دەرچوونەکە جارێك خۆی کردوویە جارێك پێیان کردووە، ئەمە پێی دەڵێن: {تصيير} **(وتعديه بتغير معناه كالنقل إلى الأبواب)** ئەوجارەش فعلی لازم دەکەیتە متعدی بە هۆی گۆڕاندنی مانایەکەی، هەر وەکو نەقل کردنی بۆ چوار بابەکان دەبووە متعدیو

ماناکەی دەگۆڕا (**بالباء خاصّة في مواضع**) وە ئەم جۆرە تەعدیە تایبەتە بە حەرفی {ب} لە نێو هەموو حەرفە جەرەکان، ئەمەش لە هەموو شوێنەك نییە، بەڵکو تەنها لە هەندێك شوێنە (**وبجر معناه إلى الإسم**) واتە: ئەم جارەش فیعلی لازم دەکەیتە متعدی بەهۆی راکێشانی مانای فیعل بۆ لای ئیسم بەبێ گۆڕاندن (**بحروف الجر في الكل**) ئەم جۆرە تەعدیە کە گۆڕاندنی تێدا نییە تایبەت نییە بە پیتی {ب} بەڵکو بۆ هەموو حەرفە جەرەکانە، وە لە هەموو بابەکان دەبێت چ رباعی یان ثلاثی مجرد یان مزید بێت (**نحو ذهبتُ بزيد أى أذهبته**) ئێستا ئەم فیعلە کە {ذهب}یە لازمە بە هاتنی پیتی {ب} بوو بە متعدی، مانای لازم و متعدی هەر بۆ یەك فاعلە، تەنها ئەوەندە هەبە جارێك بە خۆی رۆیشتووە، جارێکیان رۆیاشتوویاندوە، ئەمەیە مانای {تصيير} کە لەگەڵ مانای {أذهبته} وەکو یەك وایە بەڵام هەندێك لە زانایان دەڵێن: جیاوازی لە نێوان ئەم دوو تەعدیە هەیە، چونکە {ذهبت بە ودخلت بە على الأمير} مانای مصاحبە دەگەیەنێت، بەڵام {أذهبته وأدخلته على الأمير} مصاحبەی تێدا نییە، ئەمە میسالی ثلاثی مجرد بوو لە {تغيير} وە میسالی ثلاثی مزیدیش ئەمەیە کە دەفەرمووێت (**وانطلقت به اى أطلقته**) ئێستا {إنطلق} بابی إنفعالە لازمە، پێشتر {إنطلق زيد} بوو تەنها فاعیلی هەبوو کە پیتی {ب}ی بۆ هات ئەوەی پێشتر فاعیل بوو بە مفعول شتێکی دیکەمان کردە فاعیل کە {ضمير}ە وە هەردووك جار مانای فعلەکە کە بەرهەربوونە هەر بۆ ئەم فاعیلەیە بەڵام جارێك خۆی بەر بووە جارێك بەردراوە کە ئەمە مانای {تصيير}ە وە مانای ئەم موتەعەدییەی بە حەرفە جەر وەکو ئەو موتەعەدیە وایە کە بە نەقل وەلای بابەکان وایە وەك {أطلقته} کە متعدییە بە هەمزەی قەتع واتە بابی افعال، ئەم دوو نمونەیە بۆ تصيير بوون یەم مەزیدەو یەك مجردە وە هەردووکیان تایبەتن بە پیتی {ب}. (**ونحو مررت بزيد وانطلقت اليه للجر**) ئەم دوو نمونەیەش بۆ جەڕ مەعنان کە یەکیان ثلاثی مجردە و یەکیان مزیدە، ئەم دوو فعلە پێشان لازم بوون بەڵام بە هۆی {ب}و {الی} بوون بە متعدی، وە ئەم دووانە هیچ

{تغییر وتصییر}یان تێدا نییە، واتە: گۆڕان و گۆڕاندن لەم دوو نمونەیەدا نییە، چونکە {مَرَّ زید} واتە زید ڕۆیشت بەڵام {مررت بزید} یانی من ڕۆیشتنم بەلای زەیدی کرد نەك من زەیدم ڕۆیندبی. وە مانای {انطلق زید} زەید بە خۆی بەرەڵا بوو، وە مانای {انطلقت الیه} واتە: من بەرەڵا بووم بەرەو لای زیدی نەوەك من ئەوم بەرەڵا کردبێت، یانی ئەمانە {تصییر}یان تێدا نییە. ئەمانە پێیان دەگوترێت جەڕ، واتە: مانای ئەم فعلەی ڕاکێشاوە بۆ لای ئەو ئیسمە، بۆیە فەرمووی ئەم دوو نمونەش بۆ جەڕن کە یەکێکیان بە پیتی {ب}ە وە ئەوەی دیکەش بە پیتی {الی} وە هەروەها یەکیان مەزیدە وە یەکیان مجردە.

## باسی ئەو میسالانەی لە گۆڕاندنی ئەم فعلانە دروست دەبن

(**فصل في بيان أمثلة حصلت من تصريف هذه الأفعال**) ئەم فەصلە داندراوە بۆ باسکردن و ڕونکردنەوەی ئەو میسالانە کە پەیدا دەبن لە گۆڕاندنی ئەم فعلانە کە لە پێشان باسکران (**أی مصادر المجرد**) واتە: ئەو میسالانەی کە دروست دەکرێن لە خودی فعلەکان دروست ناکرێن، بەڵکو لە مصدری مجردی فعلەکە دروست دەکرێن، جا لەبەر ئەمە فەرمووی {أی مصادر المجرد} چونکە ئەگەر وا نەڵێ وا دەگەیەنێت کە فعل لە فعل دروست دەکرێت، وە لە ڕاستیدا فعلی —مضارع- ئەگەرچی لە —ماضی- دروستکراوە بەڵام وا بزانە هەر لە مصدری وەرگیراوە، تەنها ئەوەندە هەیە ڕاستەوخۆ لە مصدەری وەرنەگیراوە بەڵکو بە واستەی فعلی —ماضی- وەرگیراوە. ئنجا مصنف باسی فعلی —ماضی- بە پێش هەموویان خست چونکە زەمانی ئەو لە پێش زەمانەکانی دیکەیە، جا فەرمووی (**أما الماضي فهو بحسب أصل الوضع على حدث**) واتە: فعلی —ماضی- کە یەکەم میسالە ئەو فعلەیە کە دەلالەت بکات بە دانانی یەکەم جار لەسەر ڕوداوێك و کردارێك (**من حيث وجوده في الزمان السابق**) بە شێوەیەکی وا کە ئەم ڕوداوە لە زەمانی ڕابردوو بێ وە کاتەکەی پێش کاتی ئێستاکە بێت، بۆ نمونە {خرج} کە فعلی —ماضی-یە مانای

وایە کە ئەم دەرچوونە پێش زەمانی ئێستاکە بووە. جا کە لەم پێناسەدا فەرمووی دەبێت دەلالەت بکات بە گوێرەی دانانی یەکەم جار ئەوا بە دیار دەکەوێت کە {لم یکتب} هەرچەندە ماناکەشی رابردووە بەڵام بە فعلی -ماضی- داناندرێت، چونکە ماناکەی لە بنەرەتدا رابردوو نەبوو بەڵکو بە هۆی {لم} وای لێهات. وە هەروەها {ان ضربتَ ضربتُ} بە پێچەوانەوە هەرچەندە ماناکەی داهاتووەو رابردوو نییە بەڵام هەر بە -ماضی- دادەندرێت چونکە لە بنەرەتدا ماناکەی رابردوو بووە وە بەهۆی {إن} بۆتە داهاتوو ئێمەش تەنها کار بە گوێرەی دانانی یەکەم دەکەین. جا -ماضی- دوو بەشی هەیە: یان فاعلەکەی باسکراوە یان باس نەکراوە، ئەوەی کە فاعلەکەی باسکراوە پێی دەگوترێت بین فاعیل، وە ئەوەی فاعیلەکەی باس نەکراوە پێی دەگوترێت بینا مەفعول، جا یەکەم جار باسی بینا فاعیلی دەکات دەفەرمووێت (**فالمبنی للفاعل منه**) ئەو فعلەی کە دروستکراوە کە پاڵ بدا بە فاعیلی لە فعلی -ماضی- (**ما کان اوله او اول متحرك یعتد به مفتوحا**) بینا فاعیلی -ماضی- ئەو فعلەیە کە حەرفی ئەوەلی مەفتوح بێت وەکو: {نَصَرَ وضَرَبَ...} یان ئەوەلی ئەو حەرفەی مفتوح بێت کە باوەڕپێکراوی حەرەکەدارە وەکو: { انقَطع...} ئێستا لەم جۆرە فعلانە متحرکی یەکەم هەمزەیە بەڵام ئیعتیباری پێناکرێت چونکە ئەگەر کەوتە نێوان دوو شت ئەوە هەمزەکە دەڕوات کە لەمەودوا باسی دەکات، وە حەرفی دووەمیشی ساکنە، کەواتە: تەماشای حەرفی سێیەمی بکە ئەگەر مەفتوح بێت ئەوە بینا فاعیلە وە ئەگەر -مضموم- بێت ئەوە بینا مەفعولە وەکو لەمەودوا باسی دەکات (**مثاله**) واتە میسالەکانی ئەو فعلە -ماضی-ەی کە بینا فاعیلە وە حەرفی یەکەمی مفتوح بێت، جا ئەمەش بزانە هەموو فعلێك چواردە میسالی لێ دروست دەبن سێیان بۆ {مفرد وتثنیة وجمعی مذکری غائب} وە سێیان بۆ {مفرد وتثنیة وجمعی مؤنثی غائبة} وە سێیان بۆ {مفرد وتثنیة وجمعی مذکری مخاطب} وە سێیان بۆ {مفرد وتثنیة و جمعی مؤنثی مخاطبة} وە یەکیان بۆ {متکلم وحده} وە یەکیان بۆ {متکلم مع الغیر} وە لەم نەخشەیە بڕوانە کە چواردە میسالن:

| | | |
|---|---|---|
| ١ | نصر | بۆ مفردی مذکری غائب، واتە نێرینەیەکی نادیار |
| ٢ | نصرا | بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، واتە دووی نێرینەی نادیار چونکە ئەلف نیشانەی دووانە |
| ٣ | نصروا | بۆ جمعی مذکری غائب، واتە لە دوو زیاتر چونکە واو نیشانەی جەمعە |
| ٤ | نصرَتْ | بۆ مفردی مؤنثی غائب، واتە یەکی مێینەی نادیار چونکە تێی زەنەدار نیشانەیەتی |
| ٥ | نصرتا | بۆ تثنیەی مؤنثی غائبانە، واتە دوو مێینەی نادیار |
| ٦ | نصرْنَ | بۆ جمعی مؤنثی غائبانە، واتە: کۆمەڵە ئافرەتێکی نادیار |
| ٧ | نصرْتَ | بۆ مفردی مذکری مخاتەبە، واتە: یەکێنێرینەی لە بەرامبەرە چونکە تێی مەفتوح نیشانەیەتی |
| ٨ | نصرتما | بۆ تثنیەی مذکری مخاتەبە، واتە دووی نێرینەی بەرامبەر |
| ٩ | نصرتم | بۆ جمعی مذکری مخاتەبە، واتە کۆمەڵە نێرینەیەکی بەرامبەر، ئەسڵەکەی {نصرتموا} بوو بەڵام واوەکە حەزف کراوە |
| ١٠ | نصرْتِ | بۆ مفردی مؤنثی مخاتەبە، واتە مێینەکی بەرامبەر |
| ١١ | نصرتما | بۆ تثنیەی مؤنثی مخاتەبە، واتە دوو مێینەی بەرامبەر |
| ١٢ | نصرتنّ | بۆ جمعی مؤنثی مخاتەبانە، واتە کۆمەڵە مێینەکی بەرامبەر |
| ١٣ | نصرتُ | بۆ متکلمی وەحدەیە، واتە تەنیا بێژەرکە خۆی مەبەست بێت |
| ١٤ | نصرنا | بۆ متکلمی مع الغیر، واتە بێژەر خۆیی‌و چەندی دیکەی مەبەست بێت |

جا ئەم چواردە صیغەیە بەم شێوەیە لە هەموو جۆرە فعلێك دروست بکە، مەگەر لەو فعلانە نەبێت کە قبولی گۆڕانکاری ناکەن وەکو {لیس، عسی...} وە بۆ ئیعلال کردنی ئەم چواردە صیغانە بڕوانە شەرحی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مدرس {رحمه الله}. (**وكذا البواقي**) واتە: هەموو فعلانی دیکەش بەم شێوەیەیە جا ثلاثی بن یانرباعیوە مجرد بی یان مزید بن.

جا یەکێك رەخنە دەگرێت و دەڵێت تۆ گوتت بینا فاعیل دەبێ پیتی یەکەمی مەفتوح بێت، کەچی هەندێك فعل هەنە لە بینا فاعیلدا پیتی یەکەمی مەفتوح نییە وەکو {اجتمع....}، ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموویت (**ولا تعتبر اعتراضا عن التعريف**) واتە: ئیعتیبار مەکەو مەیکە رەخنە بۆ پێناسەی بینا فاعیل (**بحركات الألفات في الأوائل**) ئیعتیبار مەکە بە حەرەکەی ئەو هەمزانەی کە لە ئەوەلی هەندێك فعل هەنە، وەکو {اجتمع، انقطع.....} (**غير الإفعال**) تەنها هەمزەی بابی ئیفعال نەبێت، وە ئەو هەمزانەش نەبن کە لە سەرەتای فعلان نینە، لەم دوو شوێنە هەمزە ئیعتیباری پێ دەکرێت، لە غەیری ئەم دوو شوێنە هەمزە هیچ نرخەکی نییەو ئیعتیباری پێناکرێت (**فإنها زائدة للوصل**) ئەو هەمزانەی لە سەرەتای ئەم فعلانە زیاد کراون کە بتوانن ئەم وشانە بخوێننەوە (**تثبت في الإبتداء وتسقط في الدرج**) واتە: ئەم هەمزانە دەمێنن لە کاتی دەست پێکردنی ئەم وشانە بەڵام کە شتێکیان هاتە پێشەوە لە بەین دەچن و ناخوێندرێنەوە، بۆ وێنە {انكسر} ئەم هەمزە یە دەخوێندریتەوە لە کاتێك هیچ شتێك لە پێشی نەبێ، بەڵام کە شتێك هات لە نێوانیان دەڕوات جا لەم کاتە تەماشای پیتی کاف دەکرێت ئەگەر مەفتوح بێت ئەوە بینا فاعیلە، وە ئەگەر —مضموم- بێت ئەوە بینا مەفعولە. جا لێرەدا مامۆستای زانا دەیەوێت هەمزەی وەصل و قەتع لێك جیا بکاتەوە لە هەر سێك بەشەکانی {كلمة} ئیسم و فعل و حەرف، دەفەرموویت (**واعلم**) بزانە قوتابی ئازیز وە ئاگاداربە ئەمە یاسایەکی گرنگە ئیشت پێی دەبێت (**ان الهمزات الزائدة في أوائل الأفعال**) بزانە: بێگومان ئەو هەمزانەی کە زیادن لە ئەوەلی فعلان (**المكسورة**

**والمضمومة**) جا ئەم هەمزەیە چ مەکسوری وەکو {إضرب وإجتمع} چ —مضمومی وەکو {أُنصر وأُستخرج المال} (**ومصادرها**) وە ئەم هەمزانەی کە زیادن لە ئەوەلی مەصدەری فعلان (**غير الإفعال**) تەنها هەمزەی بابی إفعال نەبیو بە هەموو صیغەکانی وە تەنها هەمزەی فعلەکانی —مضارع- نەبێت (**همزات وصل**) هەموویان هەمزەی وەصلن، بۆ ئەوە هاتوون کە بتوانین بە هۆی ئەوان ئەم حەرفەی کە لە دوای هەمزەیە بخوێنینەوە چونکە ئەگەر ئەم هەمزەیە نەبێت {ابتدا} بە ساکن دەبێت، ئەمەش قەدەغەیە، بە ناچاری ئەم هەمزەیە لەم شوێنانە زیاد دەکرێ، بەڵام هەمزەی بابی إفعال وە فعلی —مضارع- ەکان کە بۆ متکلمی {وحدە} زیاد دەکرێ ئەمان وەصل نین بەڵکە هەمزەی قەتعن هەموو کات دەخوێندرێنەوە، وە شتێکی روونە ئەم هەمزانەی لە ئەوەلی نەبن وەکو {سئل وقرأ..} ئەمانەش وەصل نینە، وە هەروەها ئەگەر لە ئەوەلیش بێت بەڵام ئەصلی بێت وەك {أخذ وأكل...} ئەمانەش وەصل نین (**والأسماء همزات قطع**) ئەمە عەتفە بەسەر قەولی مصنف کە فەرمووی {والأفعال} یانی بزانە بێگومان ئەو هەمزانەی کە زیادن لە ئەوەلی ئیسمەکان تەنها مەصدەرەکان نەبێت وە ئەوەمان باس کرد، غەیری ئەوان هەموویان هەمزەی قەتعن وە بە هیچ شێوەیەك لاناچن لە نێوان دوو وشە (**إلاّ في عشرة**) تەنها لە {١٠} دە ئیسم نەبێت لەم دە شووێنە لە ئیسمەکان هەمزەی وەصلن و لادەچن (**وهي ابن**) یەکەم: {ابن} ئەصلەکەی {بَنَوٌ} بووە بە فەتحەی دووەکانی ئەوەلی جا —ضمة- لەسەر واوی گران بوو لامان دا {التقاء الساکنین} روویدا لە نێوان پیتی واو لەگەڵ تەنوین جا واومان لادا بوو بە {بن} پاشان {ب}مان ساکین کرد وە هەمزەی وەصلمان زیاد کرد بۆ —تعویض- و نەمانی ابتدا بە ساکن (**وابنة**) ئیعلالی وەکو {ابن} وایە تەنها —تاء التأنیث- ی بۆ زیاد کراوە (**وابنم**) ئەصلەکەی {ابن} بووە میمی بۆ زیاد کراوە بۆ مبالەغە وەئەگەر بۆ —تعویض- بوایە هەمزە لادەچوو (**واسم**) ئەصلەکەی {سموٌ} بوو، واو لادراو سین ساکن کرا وە هەمزەیان هێنا (**وأَست**) ئەصلەکەی {سَتَهٌ} بوو هێ لادرا وە سین ساکن کراو هەمزەیان هێنا

(**واثنان**) ئەصلەکەی {ثنیان} بوو بە فەتحەی دووەکانی ئەوەلی ئنجا {ی} کە لام الفعلە لادرا، ئنجا فاء الفعل ساکن کرا وە هەمزەی بۆ زیاد کرا (**اثنتان**) ئەصلەکەی {اثنان} بوو {تاء التأنیث}ی بۆ زیاد کرا (**وامرؤ**) هەمزەی ئەوەلی وەصلە، بەڵام هی کۆتایی ئەصلەو (**وامرءة**) {تاء التأنیث} بۆ زیاد کراوە (**وأیمن الله**) ئەمە دەیەکەو کۆتاییە، {أیمن} واتە: بەرەکەت {أیمن الله وأیم الله} واتە: سوێندم بەرەکەتی خوا بێت، جا ئەمەی لێرەدا هەیە بە مانای سوێندە، وە ئەوەیان کە جەمعی {یمین}ە هەمزەکەی وەصل نییە بەڵکە قەتعە (**ففیها للوصل**) هەمزە لەم دە ئیسمانە بۆ وەصلە، وە ئەمەش بە سەماع زاندراوە، بەڵام لە فعلان و مەصدەرەکان قیاسی بوو (**وفي الحروف تكون للوصل مع لام التعريف وميمه**) ئەمەش عەتفە بەسەر {الأسماء} یانی ئەو هەمزانەی زیادن لە ئەوەلی حەرفان لە دوو شوێن بۆ وەصلن، لەگەڵ لام و لەگەڵ میم کە هەر دووکیان بۆ تەعریفن وەکو {الغلام} وە {أمصیام} لێرەدا هەردوو هەمزەکان بۆ وەصلن، وە لە غەیری ئەم دوو شوێنە لە هیچ شوێنەکی دیکەی حەرفان هەمزە بۆ وەصل نییە وەکو {إنَّ وأنَّ....} (**ولا تكون مفتوحة إلاّ معهما وفي أيمن الله**) هەمزەی وەصل مفتوح نییە مەگەر لە سێ شوێن، یەکەم: لەگەڵ لامی تەعریف دووەم: لەگەڵ میمی تەعریف، سێیەم: لەگەڵ {أیمن الله}، لە غەیری ئەم سێ شوێنانە یان مەکسور یان –مضموم- دەبێت. جا لەبەر ئەوەی لەو کاتەی هەمزەی وەصل لەگەڵ هەمزەی ئیستیفهام کۆ دەبێتەوە حوکمی تایبەتی هەیە، بۆ روونکردنەوەی ئەوە مصنف فەرمووی (**وتقلب ألفا مع همزة الإستفهام**) هەمزەی وەصلی مەفتوحە قەلب دەکرێت بە ئەلف لەو کاتەی کۆدەبێتەوە لەگەڵ هەمزەی ئیستیفهام، چونکە بە پێی یاسای هەمزەی وەصل دەبوایە لابچێت لەو کاتەی دەکەوێتە نێوان دوو وشە، بەڵام لێرەدا هەرچەندە لە نێوان دوو وشەدایە بەڵام ناکرێ بڕوا، خۆ ئەگەر لاشی نەبەیت ئەوە گرانی وشە دروست دەبێت بە هۆی کۆبوونەوەی دوو هەمزە لە سەرەتای وشەوە. جا ئەگەر یەکێك رەخنە بگرێت و بڵێت بۆ نابێ لابرێت، لە وەڵامدا دەگوترێت: ئەو کەلامەی کە هەمزەی ئیستیفهامی

لە ئەوەلیە کەلامێکی ئینشائیە وە ئەو کەلامەی بە بێ هەمزەی ئیستیفهامە کەلامێکی خەبەریە، وە ئەگەر یەکێك لەم دوو هەمزانە لابرێت نازانرێت کامە لادراوە لە کاتێکدا هەردووکیان مەفتوحن، وە هەروەها نازاندرێت داخۆ کەلامەکە ئینشائیە یان خەبەریە، بە ناچاری بۆ ئەوەی ئەو ئیلتیباسە روو نەدات هەمزەی وەصل قەلب دەکرێت بە ئەلف، جا هیچ گرانی نامێنێو تێکەڵاویش لە نێوان کەلامی خەبەریو ئینشائی نابێت. (**كما في آلحسن عندك**) پێشان {ألحسن عندك} بوو بەیەك هەمزە کە هەمزەی وەصلە، وە ئەم کەلامە خەبەریە، پاشان هەمزەی ئیستیفهام هات بوو بە {أألحسن عندك} بێگومان کەلامەکە بوو بە ئینشائی، جا ئەگەر هەردوو هەمزەکە بمێنن ئەوە گرانە، وە ئەگەر یەکیان لابرێت نازانرێت داخۆ کامەیە چونکە هەردووکیان مەفتوحن، وە کەلامی ئینشائی ئیلتیباسی بە کەلامی خەبەری دەبێت، بە ناچاری هەمزەی وەصل دەکەین بە ئەلف بوو بە {آلحسن عندك} نەگرانیو نە ئیلتیباسیش دەمینی (**وفي آيمن الله**) پێشان تەنها یەك هەمزە بوو بەڵام کە هەمزەی ئیستیفهام هات بوون بە دوو هەمزەو بووە {أأيمن الله} هەر وەکو ئەوەی پێشەوە قەلبی هەمزەی وەصل کرا بە ئەلف بوو بە {آيمن الله}. ئەوەی گوتمان باسی هەمزەی ئەوەلی مەفتوح بوو، ئنجا دێتە سەر باسی هەمزەی وەصلە مەکسورو ـمضموم- بۆیە فەرمووی (**وتحذف المكسورة والمضمومة معها إذ لا لبس فيهما**) حەزفی هەمزەی وەصلی مەکسورە وـمضمومة- دەکرێت لەو کاتەی لەگەڵ هەمزەی ئیستیفهام کۆدەبنەوە، چونکە هەمزەی وەصل هەموو کات مفتوحە ئەوانەش یان مەکسور یان ـمضموم-ە، ئەگەر حەزفیش بکرێت هیچ ئیلتیباسی کەلامی خەبەریو ئینشائی بەیەك نابێت، بۆ نمونە {أإجتمع القوم} ئێستا هەمزەی یەکەم ئیستیفهامەو مەفتوحە، وە هەمزەی دووەم هەمزەی وەصلە مەکسورە، هەر کامیان لابرێت کەلامەکە دەزاندرێت داخۆ خەبەرە یان ئینشائە، یانی ئەگەر هەمزەك بە مەکسوری دەرکەوت دەزانین هەمزەکە وەصلەو کەلامەکە خەبەریە، وە ئەگەر هەمزە مەفتوحەکە دەرکەوت کە هەمزەی ئیستیفهامە دەزانین کەلامەکە

ئینشائیە. نمونەی دووەم وەکو {أأُستخرج المال} لێرەدا ئەوە مەجهولی -ماضی- بابی ئیستیفعالە، وە روونە کە هەمزەکەی خۆی -مضموم-ە وە هەمزەی یەکەمیش استفهامە لێك جودانە هەر کاتەك وەصلەکەش لابرێت دەزاندرێت و هیچ التباس نابێت.

**تێبینی :**

کەلامە خەبەری واتە ئەوە کەلامەی کە تۆ بۆ هۆیکەلامە خەبەری مخاتەبە و بەرامبەرت دەدەی کە رستەکە لە رابردوو بووە یان لە داهاتوو دەبێت وەکو {کتب} واتە لە رابردوو نوسی، وە وەکو {یکتب} واتە لە داهاتوو دەنوسێت، وە کەلامی خەبەری بەم شێوەیە نییە، بەڵکو دوعایە یان پرسیارە یان فرمان پێکردنە یان نەهی لێ کردنە یان خۆزگە بردنە..... وەك بخوێنە. لە کاتێك باسی بینا فاعیلی -ماضی- تەواو بوو هاتە سەر باسی بینا مەفعولی -ماضی-، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پێناسەی بینا مەفعولی -ماضی-و -مضارع-ی دەکات بەگوێرەی مانا، جا دەفەرمووێت **(والمبنی للمفعول منه)** واتە: فعلی بینا مەفعول لە فعلی -ماضی- **(وهو مطلقا)** بینا مەفعول بە تێکڕایی چ -ماضی- بێت چ -مضارع- **(بحسب المعنی)** بە گوێرەی پێناسەی کە پەیوەندی بە مەعناوە هەبێت نەك بە لەفزەوە، چونکە ئەگەر لەم پێناسەیەش یەکسان بن بەڵام لە پێناسەی لەفزی لێك جیان وەکو بۆت دەردەکەوێت لە پێناسەکەیان، **(الفعل الذی لم یسم فاعله)** واتە: فعلی بینا مەفعول بە موتلەقی: ئەو فعلەیە کە ناوی فاعیلەکەی نەبرا بێت، جا فاعیلەکەی نەگوتراوە یان لەبەر ئەوەیە کە فاعیلەکەی نەزاندراوە {نەناسراوە} وەکو: {قُتِلَ زید}، یان لەبەر گەورەیی فاعیلە وەکو: {ضُرِبَ جندیّ} لە کاتێك سەرۆك کۆماری لێی داوە، یان لەبەر بچوکیو کەمایەتی فاعیلەکەیە وەکو: {ضُرِبَ الرئیس} کە سەرباز لێی داوە بە شەق، یان زۆر مەشهورەو دیارە پێویست بە ناو هێنان ناکات وەکو: {خُلِقَ الإنسانُ}، لەم شوێنانە باش وایە ناوی فاعیلەکە نە\گوترێت، جا ئەم پێناسەیە بۆ بینا مەفعولە بە گوێرەی مانا بۆ -ماضی-و -مضارع-ە، بەڵام

پێناسەی هەردووکیان بە پێی لەفزی لێك جیاوازن، جا دەیەوێت لێرەدا پێناسەی بینا مەفعولی -ماضی- بکات بە پێی لەفز بۆیە دەفەرمووێت (**ماکان أوله مضموما كفُعِلَ**) بینا مەفعول لە -ماضی- بە پێی پێناسەی لەفزی ئەوەیە: کە حەرفی ئەوەلی -مضموم- بێت وەکو {فُعِلَ وضُرِبَ وقُتِلَ......} ئەوە میسالی ئەو فعلانەیە کە هیچ هەمزەی وەصلیان لە ئەوەلی نەبێت (**أو كان اول متحرك يعتد به مضموما كأفتُعِلَ**) یان ئەوەیە کە ئەوەل حەرف کە ئیعتیباری هەبێو باوەڕی پێبکرێت -مضموم- بێت وەکو {افتُعِلَ واجتُمِعَ.....} بەڵێ کوتمان هەمزە هیچ حسابی بۆ ناکرێت وە حەرفی دووەمیش ساکنە جا تەماشای حەرفی سێیەم بکە ئەگەر مەفتوح بێت بینا فاعیلە وە ئەگەر -مضموم- بێت ئەوە بینا مەفعولە.

یەکێك دەڵێت: بۆچی لێرەدا هەمزە -مضموم- دەبێت، کەچی گوتمان هیچ نرخی نییە؟ لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**وهمزة الوصل تتبع هذا المضموم في الضم**) یانی هەمزەی وەصل شوێنی ئەم حەرفە سێیەمە دەکەوێت لە کاتی کە -مضموم- دەبێت، ئەگینا ئەم هەمزەیە لە بینا فاعیلی ئەم فعلانە مەکسورە جا کە -مضموم- کراوە لەبەر ئەوەیە نەبادا لێیەوە لازم بێت ئینتیقال و گواستنەوە لە کەسرەی هەمزە بۆ -ضمة-ی ئەم حەرفی سێیەمە، وە ئەگەر بڵێت: ئەی هەمزەکە ساکینەکەی لە دواوە نییە؟ لە وەڵامدا دەڵێت: ئەم ساکینەی کە لە نێوانیان هەیە بێ هێزە (**وما قبل آخره يكون مكسورا أبدا**) واتە: بینا مەفعولی -ماضی- ئەوەلەکەی بەم شێوەیە بوو کە گووتمان، وە حەرفی پێش کۆتاییش بەردەوام مەکسور دەبێت (**نحو ضُرِبَ زيدٌ**) ئەم {ضُرِبَ} بینا مەفعولی -ماضی-یە ئەوەلی -مضموم-ە وە حەرفی پێش کۆتایی کە {ر} مەکسورە، وە فاعیلەکەشی دیار نییە (**وأستُخرِجَ المالُ**) ئەمەش میسالی ئەوەیە کە هەمزەی وەصلی لە ئەوەلییەوە هەیە وە حەرفی سێیەمی متمانەی پێنا کرێت ئەصلەکەی {إستخرج السارق المال} پاشان فاعیل لادرا مەفعول کە {المال}ە چووە شوێنیو مەرفوع بوو، صیغەی فعلەکەشی کرا بە بینا مەفعول کە ئەوەل متحرکی متمانە پێکراو کە {ت}یە -مضموم- کراو حەرفی

پێش ئاخیریش مەکسور کرا، میسالی یەکەم ثلاثی مجرده وە میسالی دووەم ثلاثی مزیدە. یەکێك رەخنە دەگرێت و دەڵێت: تۆ گوتت بینا مەفعولی —ماضی- حەرفی پێش کۆتایی بەردەوام مەکسورە، کەچی ئێستا {فُزْدَ} بینا مەفعولی —ماضی-ە وە حەرفی پێش ئاخیری مکسور نییە بەڵکو ساکینە؟ ئەویش وەڵام دەداتەوەو دەفەرمووێت (**وجاء فُزْدَ له بضم فسكون**) بەڵێ هاتووە {فزد} بە —ضمة-ی ئەوەڵی‌و سکونی حەرفی پێش کۆتایی کە {ز}ە بەڵام ئەوە لە ئەصلدا وا نەبووە (**والأصل فُصِدَ له فقلب وسكن**) ئەصلەکەی {فصد} بووە بە گوێرەی یاسا پاشان قەلبی صادەکەی کراوە بە {ز} وە ساکین کراوە وە لە یاسا دەرچووە قاعیدەی پێ لەکەدار ناکرێت (**وحكى قطرب ضِرْبَ**) مامۆستا قترب {رحمه الله} گێڕاویەتییەوە کە {ضِرْبَ} هاتووە کە بینا مەفعولی —ماضی-ە (**بكسر فسكون**) بە کەسرەی ئەوەڵی‌و بە سکونی دووەمی، کەواتە: {فزد لە} تەنها یەك موخالەفەی هەبوو بەڵام ئەمەیان دوو موخالەفەی هەیە (**وقرئ رِدَّتْ الينا بكسر الراء**) لە قورئان خوێندراوەتەوە {رِدَّت} بە کەسرەی {ر} وە قاعیدە وایە بە —ضمة-ی {ر} بووایە کە لە پێش ئیعلال کردن {رُدِدَ} بووە (**وهى شاذة**) ئەم سێ وشەیە کە {فزد وضِرب ورِدت} هەرسێکیان شازن یاسایان پێ هەڵناوەشێتەوە چونکە قاعیدە لەسەر غالیبە، وە ئەگەر یەکێك بڵێت: چۆن شاز لە قورئانی پیرۆز هاتووە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە {أبى يأبى} باسکراوە.

## باسی فعلی مضارع

مصنف رزگاری بوو لە باسی فعلی —ماضی- بە هەردوو بەشەوە، جا دێتە سەر باسی فعلی —مضارع-ی بەهەردووك بەشیەوە کە ئەویش میسالێکە لەو میسالانەی لە مەصدەری مجرد دروست دەکرێت، بەڵام بە واستەی فعلی —ماضی- جا دەفەرمووێت (**واما المضارع فهو ماكان في اوله احدى الزوائد الأربع**) واتە: فعلی —مضارع- ئەو فعلەیە کە لە ئەوەڵییەوە زیاد کرابێت یەکێك لەم چوار حەرفانە

**(وهی الهمزة والنون والتاء والياء)** حروفە زیادەکان بریتین لەم چوار حەرفانە {أ، ن، ت، ی} **(تجمعها أنيت او أتين او نأتی)** ئەم چوار حەرفەی کۆکردۆتەوە یەکێك لەم سێ وشانە {أنيت....} بروانە هەرسێکیان کە ئەم چوار حەرفە لە هەموویان هەیە **(وقيل المضارع بزيادة حرف المضارعة على الماضی)** واتە: گووتراوە ئەمەش {ابن حاجب} ە خوای لیٚ رازی بێت فەرموویەتی: -مضارع- لە کاتێك دەبێتە -مضارع- کە یەکێك لەم چوار حەرفەی لە سەر-ماضی-ەکەی زیاد بکرێت **(فلا يرد نحو أكرم وتكلم)** جا بە پێی پێناسەی ئیبن حاجب نابێتە رەخنە {أکرم وتکلم} وە هاوبیناکانیان کە هەر یەکی لەم دووانە یەك لە چوار حەرفە زیادەکانیان لە ئەوەلیەوە هەیە کەچی -مضارع-یش نینە چونکە ئەم زیادە لەسەر -ماضی- زیاد نەکراوە، بەڵکو نیشانەی -ماضی- ئەم بابەیە، وە بەڵگەش ئەوەیە کە ئەم دوو حەرفە مانای -مضارع-یەتی ناگەیەنن کە هەمزە بۆ متکلمی وەحدە هاتووە، وە {ت} بۆ مخاتەب هاتووە، بەڵام بە گوێرەی پێناسەی یەکەم ئەوانە دەبنە جێی رەخنە چونکە هەریەك لەوانە حەرفەکی لەم چوار حەرفانە لە ئەوەلییەوە هەیە وە زیادیشە وە -مضارع-یش نین. جا لێرەوە مصنف دەیەوێت ئەم چوار حەرفە دابەش بکات و دەفەرمووێت **(فالهمزة للمتكلم وحده)** هەمزە کراوە بە نیشانە بۆ متکلمی وەحدە، یانی هەر فعلە -مضارع-ەك هەمزەی لە ئەوەلییەوە بوو ئەوە بۆ ئەو کەسە دەبێت کە خۆی قسە دەکات -فعلەکە دەکات- وەکو بلێت {أذهبُ} واتە من دەرۆم {أکتبُ} واتە من دەنوسم **(والنون له مع غيره)** نون نیشانەیە بۆ متکلمی مع الغیر، یانی ئەو کەسەی کە هەندێکی دیکەی لەگەڵدانە، واتە: ئەو کەسەی قسە دەکات خۆیو چەند کەسێکی دیکەن وەکو: {نذهب ونکتب} یانی ئێمە دەڕۆین و ە ئێمە دەنوسین **(وقد يستعمل للواحد مجازا)** هەندێك جار نون بۆ یەك کەس بەکار دێت، بەڵام مەجازە لە مانای ئەصلی خۆی لادەدات کە مانای ئەوەیە کە پێویستە لە یەك زیاتر بێت ئەمە لە قورئانی پرۆز زۆرە وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلا

خَسَاراً﴾ (الاسراء:٨٢) **(والتاء للمخاطب)** وە هەروەها {ت} داندراوە بۆ موخاتەب، واتە: ئەو کەسەی کە تۆ قسەی لەگەڵ دەکەی **(مفردا أو مثنى أو مجموعا مذكرا أو مؤنثا)** جا ئەم موخاتەبە موفرەد واتە یەك کەس بێت، یان دووان –تثنية- واتە دوو کەس بن، یان جەمع واتە زۆر بن، -مذكر- بێت واتە نێرینە، یان –مؤنث- بێت واتە مێینە {ت} بۆ ئەم هەموو میسالانە بەکار دێت وەکو {تذهب، تذهبان، تذهبون، تذهبين، تذهبان، تذهبن}، **(وللغائبة المفرد أو المثناة)** واتە: {ت} بۆ غائیبەی –مؤنث-یش دەبێت لەگەڵ تەسنیەکەی، جا {تذهب، تذهبان} چۆن بۆ موخاتەبی مذكر دەبن وە هەروەها بۆ غائیبی –مؤنث- یش دەبن، جا بە قەرینە لێك جودا دەکرێنەوە **(والياء للغائب المذكر مطلقا)** واتە: {ى} بۆ غائیبی مذكران دەبێت، یانی: {ى} نیشانەیە بۆ –مذكر-ی غائیب بە موتلەقی جا چ موفرەد بێت یان دووان بن یان جەمع بێت وەکو {يذهب، يذهبان، يذهبون} **(ولجمع المؤنث الغائبة)** {ى} نیشانەیە بۆ جەمعی –مؤنث- غائیبە وەکو {الهندات يذهبن} وە لە پێشان باسکرا کە ئەوانی دیکە واتە: مؤنثەکان هەموویان بە {ت} بوون تەنها ئەم جەمعە نەبێت **(ووجه زيادتها واختصاص كل بما اختص به في الشرح)** واتە: هۆی زیاد کردنی ئەم چوار حەرفانە لە نێو هەموو حروفەکانی زیادکران کە {١٠} دە پیتن و بریتین لە پیتەکانی {سألتمونيها}، وە هۆی تایبەتکردنی هەر یەکێك لەم چوار پیتانە بەم صیغەی کە پێیەوە تایبەتکراوە ئەوە لە شەرحی تەصریفی زەنجانی کە مەشهورە بە {سعدينى} بدۆزەوە لەوێ باسکراوە کە بۆچی ئەم چوار حەرفە هەڵبژێردراون، وە بۆچی ئەم حەرفە بۆ ئەم جۆرە کەسانە تایبەت کراوە.

**تێبینی :**

ئەگەر بپرسیت بۆچی ناوی خوا هەر بە غائیبی –مذكر- بە کاردێت؟ ئەوە لە وەڵامدا دەگوترێت: چونکە {الله} عەلەمە وە هەموو عەلەمێك بە غائیب حسابە،

وە صیغەی —مذکر-یش گەورەترە لە صیغەی —مؤنث- بۆیە بە —مذکر- هاتووە {الله يحكم}.

(**وهذا يصلح للحال والإستقبال**) فعلی —مضارع- دەگونجێت بۆ حال و بۆ ئیستیقبال واتە: بۆ زەمانی ئێستاو وە بۆ زەمانی داهاتوو دەگونجێت، ئەوە لە کاتێکدا بۆ هەردووکیان دەگونجێت کە هیچ نیشانەی پێیەوە نەبێت (**تقول يفعل وتريد غدا**) تۆ دەڵێی {فلان يفعل} واتە: فلاَن کەس ئێستاکە ئەو کارە دەکات، ئەمە فعلی —مضارع-ەو مەبەستت لێی کاتی ئێستایە وەکو {ألآن} (**ويسمى حالا وحاضرا**) ئەم جۆرە فعلە کە مەبەستت لێی زەمانی ئێستاکەیە ناو دەبرێت بە —حال- و-حازر- جا ئایا ئەم دوو وشەیە مانایان لێك جیاوازە یان نا ئەوە دوایی باسی لێوە دەکەین (**ويفعل وتريد غدا**) ئەم جارەیان دەتوانی بڵێی {يفعل} وە مەبەستت لێی زەمانی داهاتوو بێت.

پوختەی ئەو باسە ئەوەیە کە ئەم فعلە موشتەرەکە لە نێوان کاتی ئێستاو کاتی داهاتوو، بە مەرجێك هیچ نیشانەی پێیەوە نەبێت کە تایبەتی بکات بە زەمانی ئێستا یان زەمانی داهاتوو (**ويسمى مستقبَلاً بفتح الباء**) ئەو جۆرە فعلە —مضارع-ە کە لە بۆ زەمانی داهاتووی بەکار دەینی پێی دەگوترێت {مستقبَل} بە فەتحەی {ب} لە وشەی {مستقبل} (**والقياس الكسر**) بەڵام قاعیدەو یاسا وا دەخوازیت {ب} یەکەی مەکسور بکرێت، چونکە زەمان روو لە ئێمە دەکات و بە پیر ئێمەوە دێت نەوەك ئێمە بەرەو رووی زەمانەوە بچین و بەرەو پیریەوە برۆین، کەواتە: زەمان {مُسْتَقْبِل}ەو بەرەوپیری ئێمەوە دێت، وە ئێمە {مُسْتَقَل}ین واتە: بە پیرمانەوە دێت، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە زەمان بەرەو رووی ئێمەوە دێت، ئەها نەتبینیوە رۆژ دەڕواو شەو دێت (**فإذا أدخلت عليه السين أو سوف أو مخففاتها**) واتە: هەر کاتی بچێتە سەر فعلی —مضارع-ی سین یا {سوف} یان یەکێك لە کورتکراوەکانی {سوف} کە کورتکراوەکانی بریتین لە {سو، سی، سف} (**اختص بالزمان المستقبل**) واتە: کە یەکێك لەوانەی باسمان کرد چووە سەری

ئەوە تایبەت دەبێت بە زەمانی داهاتوو وەکو {سیذهب, وسوف یذهب، وسي یذهب، وسو یذهب، وسف یذهب} واتە لە داهاتوو دەڕوات (**أو لام الإبتداء اختص بالحال**) هەرکاتی لامی إبتدا بخرێتە سەر فعلی -مضارع- ئەوا تایبەت دەبێت بە زەمانی حال، واتە: ئێستا وەکو {لیذهبُ زید} یانی ئێستا بڕوات، بەڵام ئەمە بۆچوونی کوفیەکانە وەکو ئێستا بۆت روون دەبێتەوە. لێرەدا رەخنەگرێك لەوانەیە بڵێت: مادام {ل} نیشانەی حال بێت، چۆن لەگەڵ {سوف} کۆدەبێتەوە کە نیشانەیە بۆ داهاتوو؟ مامۆستا لە وەڵامدا دەفەرمووێت: (**وفي ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ ﴾ لمجرد التأكيد**) واتە: لام لەم ئایەتە پیرۆزە کە لەگەڵ سوف کۆبووەتەوە تەنها بۆ تەئکید کردنەوەی مانای فعلەکەیە، وە هیچ مانای زەمانی حال نادات، چونکە ئێمە دەڵێین: لە کاتێکدا لام بۆ زەمانی حالە کە ئەم -مضارع-ە بگونجێت بۆ هەردووکیان وە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ناگونجێت چونکە {سوف} هیچ مانای دیکەی نییە (**وعند البصريين اللام للتأكيد فقط مطلقا**) ئەوەی کە باسکراو گوتمان لام لە بۆ حالە ئەمە بۆچوونی کوفیەکانە، بەڵام زانایانی بەصرە دەڵێن: لام هەموو کات بۆ تەئکیدەو هیچ کات مانای زەمانی ئێستا نادات، واتە: لەگەڵ سین و سوف بێت یان نا هەر بۆ تەئکیدەو هیچ زەمانی ئێستا نادات. جا بزانە فعلی -مضارع-یش وەکو فعلی -ماضی- بینا فاعیل و بینا مەفعولی هەیە، لەبەر ئەمە مصنف دەفەرمووێت (**فالمبني للفاعل منه**) بینا فاعیل لە فعلی -مضارع- یانی ئەو فعلە -مضارع-ی کە دروستکراوە بۆ ئەوە کە پال بدات بۆ لای فاعیلی (**ما كان حرف المضارعة منه مفتوحا**) ئەو فعلەیە کە پیتی -مضارع-ەتی کە حروفەکانی -أنیت- بوون مەفتوح بێت وەکو {یَکتب ویَقرأ....} وە وەکو {تَأکل وتَشرب...} (**إلاّ ما كان ماضيه غلى أربعة أحرف**) مەگەر لەو فعلە -مضارع-ەی کە -ماضی-یەکەی لەسەر چوار حەرفانە، جا ئەم چوارە ئەصل بن وەکو {دحرج} یان یێك زیاد کرابێت وەکو {أکرم وفرّح وقاتل} (**فإنه منه مضموم أبدا**) حەرفی -مضارع-ی لەم جۆرانە -مضموم- دەبێت، هەر چەندە بینا فاعیلیش بێت، ئەمەش ئەو چوار

بابەن (**نحو: یُدحرِج، ویُكْرِم، ویُفرِّحُ، ویُقاتِلُ**) حەرفی —مضارع-ی لەم چوار بابە —مضموم- دەبێت، کە یەکیان رباعی مجردە وە ئەوانی دیکە ثلاثی مزیدن بە حەرفەکی. جا بۆ جیا بوونەوەیانت لە بینا مەفعولی لە مەو دوا باس دەکات.

یەکێك پرسیار دەکات: بۆ لەم چوار بابانە حەرفی —مضارع-ەتی —مضموم- دەبێت؟ ئەویش لە وەلآمدا دەفەرموێت (**للإلتباس في یُكْرِمُ**) چونکە ئەگەر مەفتوحی بکەین ئەوا ئیلتیباسی دەبێت ئەم {یكرِمُ}ە کە ثلاثی مزیدە بە —مضارع-ی مجرد کە {یَضْرِبُ ویَحْسِبُ} جا لەبەر نەهێشتنی التباس —مضموم- کرا، ئەگەر چی گرانیش دەبێت، ئەمە لە {یُكرِمُ} بەم شێوەیەیە (**وحمل البواقی علیه**) وە سێ بابەکانی دیکەش حەمل کرانەوە سەر {یُكرِم} واتە: حەرفی —مضارع-ەتی لەوان —مضموم- کرا ئەگەرچی التباسیش نابێت، چونکە لەگەڵ یكرم لە —ماضی- وەکو یەك وانە یا لە —مضارع-یش وەکو یەك وابن. جا ئەگەر یەکێك بڵێت: باش وایە کەم حەمل بکرێتە سەر زۆری ئەی بۆ لێرە زۆر کە سێ بابەکانن حەمل کرانە سەر کەمی کە یكرم؟ ئێمەش دەڵێین: لە کاتێك وایە کە هیچ بەر بەستێك مانیع نەبێت، بەڵام لێرەدا بەر بەست هەیە کە التباسە. یەکێك دەڵێت: بۆ مەکسور نەکرا خۆ کەسرە سووك ترە؟ ئەویش لە وەلآمدا دەفەرمووێت (**ولم یكسر لأن بعضهم یكسرون حرف المضارعة فیما ماضیه مكسور العین او في أوله همزة مكسورة**) واتە: حەرفی —مضارعة- مکسور نەکرا لەوانە ئەگەرچی کەسرە سووکترە، لەبەر ئەوەی کە هەندێك لە صەرفیەکان هەنە کە حەرفی —مضارع-ەتی مەکسور دەکەن لە دوو شوێن: یەکەم: هەر فعلە —مضارع-ەك —ماضي-ەکەی مەکسور العین بێت وەکو {عَلِمَ} جا لە —مضارع-ەکەی دەڵێن {یِعْلَمُ} بە کەسرەی {یاء}. دووەم: هەر فعلە —مضارع*-ەك لە سەرەتای —ماضی-ەکەی هەمزەکی مەکسور هەبێت وەکو {إجتمع.....} جا لە —مضارع-ەکەی دەڵێن {یِجْتَمِعُ} بە کەسرەی {ی} (**دلالة علی كسرهما**) مەکسور کردنی حەرفی —مضارع-ەتی لەم دوو شوێنە، بۆ ئەوەیە ببێتە نیشانە کە لە —ماضی-یدا عین یان هەمزە مەکسورە

(**فلو كسر فيهما لألتبس**) ئەگەر حەرفی —مضارع-ی لەوانە مەکسور بکرێت ئیلتیبباس روو دەدات. بۆ وێنە: ئەگەر بڵێین: {يِكرِم} بە کەسرەی {ی} یەکسان دەبێت لەگەڵ {يِحْسِب} کەچی ئەمە ثلاثی مجردە وە {يِكرم} مزيدە (**ولتوهم انه ايضا لذالك الدلالة**)وە ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەیە، واتە: گومان وا دەچێت کە کەسرەی ئەم چوار بابەش بۆ ئەوەیە کە کەسرە هەیە لە —ماضی-یەکەیان، بۆیە حەرفی —مضارع-یان مەکسور کراوە (**وليس في ماضيها كسرة**) وە حاڵ وایە کە هیچ کەسرە لە —ماضی-ەکەی ئەم چوار بابە نییە، نە عين الفعل مەکسورە وە نەهەمزەی مەکسوریشیان لە ئەوەڵی هەیە، کەواتە: نابێت حەرفی -مضارع-ی لەم چوارە مەکسور ببێت.

لەو باسەوە رەخنە گیراوە بەوەی کە گوتراوە: فعل هەیە —ماضی-یەکەی چوار حەرفی‌یە لەگەڵ ئەوەشدا حەرفی —مضارع-ی تێدا —مضموم- نەکراوە وەکو {خصّم} وە هی واش هەیە کە —مضارع-ی پێنج حەرفەو حەرفی —مضارع-یشی —مضموم- کراوە وەکو {استطاع} کە بابی {إفعال}و سین زیاد کراوە؟ جا لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**ولما كان الزائد الثانى في أسطاع وأهراق خلاف قياس**) لە کاتێك کە زائیدی دووەم لەم دوو فعلە کە {أسطاع}و {أهراق}ەن، واتە: سین و هێ کە هەردووك زیادکراون بە پێچەوانەی یاسا، چونکە نیشانەی بابی {إفعال} بەس هەمزەیە (**وحذف همزة خصّم بمقتضى الإعلال**) وە لادانی هەمزەی {خصّم}ەی بە گوێرەی پێویستی ئیعلال بوو (**كانا رباعيين والأخير خماسيا**) ئەمە جوابی {لَمَّا}یە، واتە: دووەکانی ئەوەڵی کە {أسطاع وأهراق}ەن بە چوار پێتی دەژمێردرێن، نەك بە پێنج حەرفی، کەوایە: مافی —مضموم- بوونیان هەیە لە —مضارع-دا، بەڵام ئەوەی ئاخیری کە {خصّم}ەیە ئەصلەکەی {اختصم} بووە ئەوە بە پێنج حەرفی حسێبەو مافی —مضموم- بوونی نییە، چونکە ئێمە گوتمان تەنها لەو فعلانە حەرفی —مضارع-ەت —مضموم- دەبێت کە —ماضی-ەکەیان لەسەر چوار حەرف بێت، ئەوەش چوار پیت نییە، بەڵام دوانی پێشوو بە چوار حەرفی حسابن

(**تقديرا**) واتە: کە {أسطاع وأهراق} بە چوار حەرفی دەژمێرین و وە {خصم}ەش بە پێنج حەرفی دەژمێرین، ئەوەش بە {فرض} تەقدیرە، لە رووی لەفزەوە نییە چونکە {لفظا} {خصم} چوارەو ئەوانی دیکە پێنج حەرفین، بەڵام کە حساب بۆ سین و هێ نەکرێ ئەوان دەبنە چواری، وە ـمضموم- دەکرێن، وە حساب بۆ هەمزەی {خصّم}ە بکرێت دەبێتە پێنجی ـمضموم- ناکرێت.

جا بۆ جودا بوونەوەی بینا فاعیلی ئەو چوار بابانە لە بینا مەفعولیان دەفەرمووێت (**وعلامة بناء هذة الأربعة للفاعل**) نیشانەی ئەوە کە ئەم چوارە بینا فاعیلن وە بینا مەفعول نینە ئەوەیە (**كون الحرف الذي قبل آخره مكسورا ابدا**) کە حەرفی پێش حەرفی ئاخیری بەردەوام مەکسورە، یانی لە هەموو شوێن جیاوازی لە نێوان بینا فاعیل و بینا مەفعول حەرفی یەکەمە، تەنها لەم چوار بابە وانییە، بەڵکو حەرفی پێش حەرفی کۆتاییە، جا ئەگەر مەکسور بێت ئەوانە بینا فاعیلن، ئەگینا بینا مەفعولن وەکو {يُكْرِمَ ويُكْرَمُ} جا لێرەوە دێتە سەر ئەو میسالەکانەی کە حەرفی ـمضارع-یان مەفتوح دەبێت (**يَنْصُرُ**) ئەمە بۆ {مفردی مذکری غائيبة} وە {ی} مەفتوحە (**يَنْصُران**) ئەمە بۆ ـتثنية-ەکەیانە (**يَنْصُرون**) بۆ جەمعیانە (**تَنْصُرُ تَنْصُران يَنْصُرْنَ**) ئەمەش مفردەو ـتثنية-و جەمع بۆ ـمؤنث-ی غائیبانە وە {ت} لە دوانی ئەوەلی مەفتوحە، وە {ی} لەوەی ئاخیریان (**تَنْصُرً تَنْصُران تَنْصُرون**) ئەمەش بۆ موزەکەری موخاتەب بە هەر سێ میسالەکانی (**تَنْصُرين تَنْصُران تَنْصُرْنَ**) ئەمانەش بۆ ـمؤنث-ی موخاتەبە لە هەر سێ میسالەکانی (**أَنْصُرُ نَنْصُرُ**) ئەمانەش بۆ یەکەمیان بۆ متکلمی وەحدەو دووەمیان بۆ متکلمی مع الغیر، لە هەر هەمووان حەرفی ـ مضارع-ی مەفتوحە چونکە بینا فاعیلن (**وقس عليه البواقى**) تۆ قیاسیان بکە بۆ سەر {يَنصرُ}ی بۆ دروست کردنی بینا فاعیلی ـمضارع-ی هەموو فعلەکانی دیکە، ثلاثی وەرباعی وە مزیدو مجرد بەم شێوەیە دەبێت، وە لە هەموویان حەرفی ـ مضارع-ە مەفتوحە تەنها لە چوار شوێنەکان ـمضموم-ی بکە، وە بۆ اعلالەکانیش

بڕوانە شەرحی مامۆستا مەلا عبد الكريمي مدرس –خوای لیٚ رازی بیٚت-. جا هاتە سەر باسی بینا مەفعولی –مضارع-ی دەفەرموویٚت (**والمبني للمفعول منه ما كان حرف المضارعة منه مضموما ابدا**) فعلی بینا مەفعول لە –مضارع-ی ئەو فعلەیە کە حەرفی –مضارع-ی لەویدا –مضموم- بیٚت (**وما قبل آخره مفتوحا ابدا**) وە حەرفی پیٚش کۆتاییش مەفتوح دەبیٚت بە بەردەوامی لە بینا مەفعولی –مضارع-دا جا ئەم فعلە لە هەر بابیٚك بیٚت –ثلاثي- بیٚت یان رباعی مجرد بیٚت یان مزید (**نحو يُنْصَرُ يُنْصَرَان يُنْصَرُون...ألخ**) ئەمانە فعلی بینا مەفعولی –مضارع-ن، مفردو –تثنية-و جەمع بۆ –مذكر-ی غائیب، وە لە هەمووان حەرفی –مضارع-ی –مضموم-ە، وە حەرفی پیٚش ئاخیریش مەفتوحە، دەبا زنجیرەی میسالەکان تەواو بکەین {تُنْصَرُ تُنْصَران يُنْصَرْنَ} ئەمانەش بۆ –مؤنث-ی غائیبانە {تُنْصَرُ تُنْصَران تُنْصَرون} ئەمانەش بۆ –مذكر-ی موخاتەبە {تُنْصَرين تُنْصَران تُنْصَرْنَ} ئەمانەش بۆ –مؤنث-ی موخاتەبە {أُنْصَرُ نُنْصَرُ} ئەمانەش بۆ متكلمی وەحدە و متكلمی مع الغير، جا لە هەموو فعلیٚك ئاوا چواو بەم شیٚوەیە چواردە میسالی بۆ دروست بکە.

براکانم: گوتمان هەر کاتیٚك فعل کرا بە بینا مەفعول ئەوا فاعیلەکە لا دەچیٚت وە مەفعول لە شویٚنی مەرفوع دەبیٚت، بەلیٚ ئەگەر فعلەکە موتەعەدی بیٚت تەواوە، بەلاٚم فعلی لازم هیچ مەفعولەکی نییە تا لە شویٚنی فاعیل بیٚت، جا بۆیە مصنف –رحمه الله- دەفەرموویٚت (**ولا يبنى من اللازم إلاّ بعد تعديته**) واتە: فعلی بینا مەفعول دروست ناکریٚت لە فعلی لازم مەگەر لە دوای کردنی بە موتەعەدی، جا کردنی فعلی لازم بە متعدی لە پیٚشەوە باسکرا کە گوتمان بە هۆی نەقلٚ کردنی بۆلای چەند بابیٚك بوو وە بە هۆی حەرفە جەریش بوو، بۆ نمونە: {ذَهَبَ} فعلیٚکی لازمە ئەگەر ویستمان بیکەینە بینا مەفعول ئەوا یان دەبیٚت نەقلی کەین و بیکەینە {أذهب} بە نەقل بۆ بابی إفعال، یان دەبیٚت بە هۆی حەرفە جەر بیکەینە متعدی ئنجا بینا مەفعولی لیٚ دروست بکەین وەکو بیکەینە {ذهبتُ بزيد} جا لەو کاتە کە

دەیکەینە بینا مەفعول دەبێتە {أُذْهِبَ زيدٌ} وە لە دووەمیان دەگوترێت {ذُهِبَ بزيدٍ}.

## باسی ما و لای نافیە

(**واعلم انه يدخل على المضارع ما ولا النافيتان**) تۆ بزانە ئەی قوتابی خۆشەویست بێگومان دەچێتە سەر فعلی —مضارع- {ما} وە {لا} کە هەردووکیان بۆ نەفی هاتوون (**ولا يغيران صيغته**) وە ئەم دوو حەرفە شکل و صیغەی ئەم فعلە —مضارع-ە ناگۆڕێت وە هیچ شتێکی لەم فعلە حەزف ناکەن، تەنها ماناکەی دەگۆڕن، بۆ وێنە: {يَكتبُ يكتبان} یەك لەم دوو حەرفە ئەگەر بخەیتە سەر لە —لفظ-دا وەکو خۆیان دەمێننەوە، وە دەڵێت {ما يَكتبُ ما يكتبان} بەڵام ماناکەی لە —إثبات- دەکاتە نەفی، چونکە {يكتبُ} واتە دەنوسێت، کەچی {مايكتبُ} واتە نانوسێت (**وجزم بعضهم بلا**) هەندێك لە عەرەبەکان فعلی —مضارع-ی مەجزوم دەکەن و مەجزومیان کردووە بە لای نەفی، بەڵام لە کوێ (**في نحو جئتك كي لايكن لك علىَّحجة**) لەم میسالەو هاووێنەکانی، ئێستا وشەی {يكن} لێرەدا مەجزوم بووە، چونکە ئەصلەکەی {يكون} بووە کە حەرفی {لا} هاتە سەری حەرەکەی نونی لادا جا {إلتقاء الساكنين} رویدا لە نێوان واو کە عين الفعلەو نونیش کە لام الفعلە، وە حەزفی واوەکەمان کرد بوو بە {يكن} جا نون ساکن بوو بە هۆی عەمەلی {لا} بەڵام واو کە لاچوو بە هۆی گەیشتنی دوو ساکن بوو کە واو و نونە (**مما يصلح فيه أن يكون قبله كي**) لەم جۆرە میسال و رستانەی کە بگونجێت ناویان لە پێش پیتی {لا} پیتی {كي} هەبێت (**لشبهه بالشرط في وجود معنى السببية**) حەرفی {لا} -مضارع-ی مەجزوم دەکات لەم جۆرە رستانە، چونکە ئەم جۆرە رستانە موشابەهەو هاووێنەییان هەیە لەگەڵ جوملەی {شرطيّة} لەوەدا کە یەکەم هۆیەو سەبەبە بۆ هی دووەمین کە {جزايه} بۆ وێنە کە دەڵێت {إن تَأْتِني أُكْرِمْكَ} کە شەرت و جەزانە، هاتن لەو میسالەدا سەبەبی رێز لێنانە. وە لەو

میسالەش کە مەبەستی ئێمەیە واتە: هاتمە لات تاکو قسەو گلەیی نەکەی، هی یەکەم هۆیە بۆ نەبوونی هی دووەم. ئنجا دێتە سەر ئەو میسالانەی کە {لفظاً} ئیشیان تێدا نەکراوە دەفەرمووێت: (**لاينصرُ لاينصُران لاينصُرون...ألخ**) ئەمە میسالی پیتی {لاَ} وە هەر سێکیان بۆ –مذکر–ی غائیبە، جا دەتوانی باقی میسالەکانی دیکە بە خۆت بهێنی (**ومایِنصرُ وما ینصران ومایِنصرون....ألخ**) ئەمانەش میسالەکانی پیتی {ما} بە خۆت هەر چواردە میسالەکان تەواو بکە. پیتی {لاَ} لە لەفزەن ئیش ناکات بەڵام ماناکەی لە {إثبات}ەوە دەگۆڕێت بۆ نەفی، واتە: لە بوون بۆ نەبوون دەیگۆڕێت (**واعلم أنه يدخل عليه الجازم**) بزانە حال وایە دەچێتە سەر فعلی –مضارع– عامیلی جازم کە لە عیلمی {نحو} باسکراون (**فيحذف حركة الواحد**) ئەم عامیلە جازیمە کە چووە سەر فعلی –مضارع– حەرەکەی –مضارع–ی لادەبات لە کاتێکدا کە حەرەکەکە بۆ موفرەد بێت، جا چ بۆ نێرینە بێت یان بۆ مێینە بێت کە ئەمە پێنج میسال دەگرێتەوە لە چواردەکان کە ئەمانەن {مفر مذكر غائب ومفرد مذكرمخاطب ومفرد مؤنث غائبة ومتكلم وحده ومتكلم مع الغير} وە ئەوەش بزانە ئەگەر –مضارع–ەکە {معتل اللام} بێت حەزفی لام الفعلەکە دەکات وەکو {لم يرمِ ولم يغزُ ولم يخشَ} . لە یەکەمیان حەزفی {ی} کراوە وە لە دووەمیان حەزفی واو کراوە وە لە سێیەمیان حەزفی ئەلف کراوە کە لە مەودوا بە درێژی باسی دەکات (**ونون التثنية وجمع المذكر والواحدة المخاطبة**) وە هەروەها نونی –تثنية–ش لادەبات بە موتلەقی، وە نونی جەمعی –مذكر–یش لادەبات غائیب و موخاتەب وە نونی موفرەدی –مؤنث–ی موخاتەبەش لادەبات (**لأنها فيها علامة الرفع كالضمة في الواحد**) واتە: نون لەم جۆرە فعلانە نیشانەی مەرفوع بوونیانە هەروەکو –ضمة– لە موفرەدەکان نیشانەی مەرفوع بوونە، کەواتە: چۆن –ضمة– بە عامیلی جازم لادەچیت بە هەمان شێوەش ئەم نونەش لەم فعلانە لادەچیت کە پێیان دەڵێن {ألأفعال الخمسة} کە رەفعەیان بە هەبوونی نونە، وە نەصبەو جەزمیشیان بە حەزفی

نونە (**لا نون جمع المؤنث**) عامیلی جازم نونی جەمعی —مؤنث- حەزف ناکات چ غائیب بێت وە چ موخاتەب (**فإنه ضمير كواو جمع المذكر فتثبت أبدا**) چونکە ئەم نونە لە جەمعی —مؤنث- -ضمیر-ە واتە: فاعیلە وەکو واوی جەمع —مذکر- وایە کە —ضمیر-ەو فاعیلەو ناڕوات، ئەم نونەی جەمعی —مؤنث-یش وایە بەردەوام هەر دەمێنێت (**فتقول لم ينصُرْ لم ينصرا لم ينصروا...ألخ**) ئێستا {ینصرْ} فعلی —مضارع-ە پێش ئەوەی کە {لم}ی بخەیتە سەر مەرفوع بوو وە {مثبت} بوو، بەڵام کە پیتی {لم} هاتە سەری عەمەلی لەفزی کردو حەزفی حەرەکەی کردو بوو بە زەنە وە عەمەلی مەعنەویشی کرد چونکە {إثبات} بوو کردی بە نەفی، وە هەروەها موستەقبەل بوو کردی بە —ماضی- وە لەم دوو میسالەی دیکە نونی حەزف کردووە چونکە لە ئەصلدا {ینصران وینصرون} بوونە عەمەلی لەفزیو مەعنەوی کردووە وەکو گوتمان، جا تۆش بەم شێوەیە چواردە میسالەکان تەواو بکە، لە هەموو شوێنەکان تەنها دەستکاری نونی جەمعی —مؤنث- نەکەی، وە ئەگەر ئەو فعلەش {معتل اللام} بوو حەزفی حەرفەکەی بکە هەر وەکو لە مەودوا پشت بە خوا بە درێژی باسی لێوە دەکات. لێرەدا رەخنەگر دوو رەخنەی هەیە، یەکەم: دەڵێت بۆ ئەم —مضارع-ە مەجزوم نەبوو کە {یأتیك} -ی-ای هەرماوە. دووەم: دەڵێت بۆ {لم} نەچۆتە سەر فعلی —مضارع- لە {كأن لم سوى....}؟ جا مامۆستای بەڕێز لە وەڵامدا دەفەرموویێت (**وجاء ألم يأتيك غير مجزوم**) هاتیە ئەم —مضارع-ە کە {یأتیك}دیە وە {لم}ی لەسەرەو مەجزومیش نەبووە، بەڵکو {ی}ی هەرماوە، قاعیدەش وا بوو کە ئەم {ی}ە بڕوات و بڵێت {ألم یأتك} ئەمە بەشێکە لە پارچەی شعرێك کە تەواویەکەی ئەوەیە:

**ألم يأتيک والأنباء تنمى**

**بما لاقت لبون بنى زياد**

(**وكأن لم سوى أهل من الوحوش توهل**) وە هاتووە {لم} لەم شیعرەدا نەچۆتە سەر فعلی —مضارع- (**مفصولا**) یانی فەصل هەیە لە بەینی {لم}و فعلە مەجزومەکەی کە {توهل}ە . ئەمە بەشێکە لە پارچە شعرێك کە ئەوە تەواوەکەیتی:

**فأصبحت معانيها قفارا رسومها**

**كأن لو سوى أهل من الوحوش توهل**

ئەصلەکەی {كأن لم تؤهل الدار سوى أهل من الوحوش}. (**لضرورة الشعر**) واتە: ئەم دوو میسالە کە یەکەم مەجزوم نییەو دووەمیان فەصل بووە لە بەینی {لم} و فعلەکەی هەردووکیان لەبەر ناچاری شعر وانە، چونکە ئەگەر وەها نەبوایە وەزنی شعرەکە تێك دەچوو، وە ئەمەش بەلای شاعیرانەوە زۆر گرنگە. (**ويجوز حذف المجزوم بعد لم سماعا وبعد لما قياسا**) واتە: دروستە فعلی —مضارع-ی مەجزوم لابِبرێت لە دوای {لم ولما} بەڵام لە پاش {لم} بە سەماع لا دەبرێت، واتە: بیستراوە کە فعلی —مضارع-ی لە دوای حەزف دەکرێت، وە ناتوانی لە هیچ ئەو فعلانە حەزف بکرێت کە نەبیسترا بێت لێی حەزف کرابێت. بەڵام لە دوای {لما} بە قیاس حەزف دەکرێت، کەواتە: ئەگەر فعلێك لێشی نەبیسترابێت ئەوە دەتوانی لێی حەزف بکەیت. ئنجا دێتە سەر میسالەکانی کە لێیان حەزف کراوە، جا میسالی {لم} وەکو (**إحفظ وديعتك التى استودعتها يوم الإغارة إن وصلت وإن لم**) لێرەدا لە دوای {لم} فعلی —مضارع-ی مەجزوم حەزف کراوە، وە ئەگەر بیهێنیتەوە دەبێتە (**وإن لم تصل**) وشەی {تصل} کە فعلی —مضارع- مەجزومە بیستراوە کە لە دوای {لم} حەزف کراوە. ئەو شاعیرەی کە ئەم هۆنراوەی نوسیووە ناوی {ابراهيم کوڕی عەلی کوڕی موحەمەد. مانای شعرەکەش ئەوەیە: بپارێزە ئەو شتەی کە من کردمە ئەمانەت لەلای تۆ لەکاتی جەنگ. وە میسالی {لما}ی ئەوەیە (**وندم زيد ولما**) ئێستا وشەی {ينفع} فعلی —مضارع-ە لە دوای پیتی {لما} حەزف کراوە، وە ئەم حەزفکردنە قیاسیە بەبێ بیستن دەکرێت، ئەگەر بتەوێت فعلە مەحزوفەکەی بینیەوە دەگوترێت (**أى ولما ينفعه الندم**).

**(وأنه يدخل عليه الناصب)** بزانە بێگومان دەچێتە سەر فعلی —مضارع- عامیلی ناصب، کە چوار عامیلن **(فيبدل من الضمة فتحة)** —ضمة-ەی ئاخیری موفردەکان دەگۆڕی دەیان کاتە فەتحە **(ويسقط النونات سوى نون جمع المؤنث)** وە هەموو نونەکان کە نیشانەی رەفعەنە حەزفیان دەکات لە {الأفعال الخمسة} تەنها نونی جەمعی —مؤنث- هەرگیز ناڕوات، چونکە گوتمان ئەم نونە فاعیلە وەکو واوی جەمعی —مذكر- وایە هەر دەمێنێو ناڕوات **(حملاً على الجازم في الأخير)** جا کە نونەکان حەزف دەکات لەبەر ئەوەیە چونکە عامیلی ناصبە حەمل کراوە بۆ سەر عامیلی جازمە لە حەزفی نونەکان، کە مەسئەلەی دووەمە واتە: مەبەست لە ئەخیری حەزفی نونەکانە، بەڵام لە مەسئەلەی گۆڕاندنی —ضمة- بە فەتحە ناصبە حەمل نەکراوە بۆ جازمە، جا ئەم حالی نەصبە لە ئیسمەکانیش حەمل کراوە بەسەر جەڕە، وە ئەمەش دەزانیت کە جەڕەو جەزمە مقابلن کە یەکیان تایبەتە بە فعل وە ئەوەی دیکەیان تایبەتە بە ئیسم، جا کاتی میسالەکانە **(تقول لن يَنْصُرَ لن يَنْصُرا لن ينصُروا.....الخ)** ئێستا {ينصرُ} پێشان —ضمة-ی هەبوو بەڵام کە پیتی {لن} هات گۆڕیو کردی بە فەتحە وە {ينصران وينصرون} نونەکەیان حەزف کراوە بە هۆی {لن} وە هەروەها عەمەلی مەعنەویشی کردووە کە لە —إثبات-ەوە گۆڕی بۆ نەفی **(ومن الجوازم لام الامر)** لەعەوامیلی جازمەیە لامی ئەمرە کەئەویش حەرەکەی مفرەدەکان لادەبات ونونەکان لادەبات تەنها نونی جەمعی —مؤنث- نەبێت بەڵام لەبەرئەوەی چەند حوکمێکی جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانی تر جیاوازی کردووە **(وهي مكسورة)** یانی لامی ئەمری خۆی مەکسورە واتە لەژێرە وەکو {ليكتب} **(وان كان الفتح فيما علي حرف واحد اصلا)** بەڵێ ئەم لامە لەژێری هەیە ئەگەر چی {فەتحە}واتە لەسەریش ئەسلترو باشترە بۆئەو وشانەی کە بیناکەیان لەسەر یەك حەرفە، وەکو واوی عەتف وە {ف}ی عەتف و وە لامی ئیبتیدا....هتد، چونکە فەتحە سووکترە، بەڵام کە ئەوەیان مەفتوح نەکراوە **(لتناسب العمل الجزم الذی بمنزلة**

**الكسرة)** یانی لەبەر ئەوە لام مەکسور نەکرا، تاکو منسوب بێت حەرەکەی خۆی کە کەسرەیە لەگەڵ عەمەلی خۆی کە جەزمەیە، کە ئەم جەزمەیەش وەکو کەسرە وایە لە تایبەتیدا، چونکە چۆن کەسرە تایبەتە بە ئیسمان جەزمەش تایبەتە بە فعلان، وە عامیلی جەزمەش لەسەر ئیسمەکانی زاهیر مەکسورە وەکو {لِزید}، جا باش وایە عامیلی جەزمەش مەکسور بێت وەکو {لِیضرب} **(وتسكن مع الواو والفاء وثم)** لامی ئەمر هەرچەندە مەکسورە بەڵام لەگەڵ یەکێك لەو سێ حەرفە {و، ف، ثم} ساکین دەکرێت وەکو {ولْیدخل، فلْیکتب، ثمّ لْیذهب} **(تشبیها بعین كتف)** چونکە ئەم لامە تەشبیهکراوە، واتە: شوبهاندیتیان بە عین الفعلی {کتف} کە {ت}یە، چونکە ئەم پیتە لە ئەصلدا مەکسورە، بەڵام دروستە ساکین بکرێت. وە ئەم سێ حەرفەش ئەگەر لەگەڵ لامی ئەمریو حەرفی فعلی –مضارع- کۆبوونەوە شێوەی وەك {کتف}ی دروست دەکەن، چونکە وەکو ئەو سێ حەرفینەو ناوەندیان مەکسورە، کەواتە وەکو ئەویش دروستە ساکین بکرێت ئەگەرچی جیاوازیش لە نێوانیاندا هەیە، چونکە لە {کتف}ی حەرفەکان هەموویان ئەصلینە بەڵام لێرە زێدەنەو ئەصلی نینە، بەلێ حوکمی {ف، و} وەکو یەك وایە چونکە – شوبهانەکە رێکە- وە {ثم}ەش حەمل کراوە سەر ئەوان چونکە هەموویان حروفی عەتفن **(تقول في أمر غير المخاطب)** تۆ دەڵێی لە میسالەکانی ئەمری بە لام بۆ ئەمری غەیری موخاتەبی، کە دەکاتە هەشت میسال سێیان بۆ –مذکر-ی غائیب وە سێیان بۆ –مؤنث-ی غائیب وە دووانیان بۆ هەردوو متکلمەکان **(لِيَنْصُرْ لِيَنْصُرا لِيَنْصُروا)** ئەمە موفرەدو –تثنية-و جەمعی بۆ –مذکر-ی غائیب **(لِتَنْصُرْ لِتَنْصُرا لِتَنْصُروا)** ئەمەش هەرسێ نمونەکانن بۆ غائیبی –مؤنث- **(لِأَنْصُرْ لِنَنْصُرْ)** ئەمانەش هەردوو میسالەکانی متکلمەکانن. جا ئەوە بزانە لەو میسالانەی هێنامانەوە هەموو حەرەکەکانی موفرەدی رۆیشتوون وە نونەکانیش جگە لە نونی جەمعی -مؤنث- نەبێت هەموویان رۆیشتوون هەروەکو لە پێشەوە گووتمان، وە ئەوەش بزانە ئەمری بەلامی بۆ موخاتەبان نابێت لەبەر ئەوە فەرمووی {في أمر غير المخاطب} چونکە

موخاتەب ئەمری تایبەتی خۆی هەیە وەکو لەمەو دوا باسی دەکات. جا یەکێك لەسەر ئەوە رەخنە دەگرێت و دەڵێت: تۆ گوتت ئەم ئەمرەی بە لام تەنها بۆ غەیری موخاتەبانە ئەوەتە لە قورئان هاتووە کە خوای گەورە دەفەرموویت {فَلْتَفْرَحوا} خۆ ئەمە ئەمری بە لامە وە بۆ موخاتەبان هاتووە، ئەویش وەڵام دەداتەوەو دەفەرموویت (**وقراءة فَلْتَفْرَحوا بالتاء شاذة**) یانی ئەم خوێندنەوەی {فلتفرحوا} بە {ت} خوێندنەوەیەکی شازە کە لەگەڵ لامی ئەمر دایە چونکە لامی ئەمر بۆ غائیبانە نابێت بۆ موخاتەبانی بەکار بێنێت، وە بۆ موخاتەبان لەو نمونەیە دەبێت بڵێت {إفرحوا} خۆ لای هەمووشمان باش دەزانین کە یاسا بە شتی شاز هەڵناوەشێتەوەو لکەدار نابێت، وە هەندێك چارەی دیکەشی بۆ دۆزراوەتەوە کە کەمێك لەمەودوا باسی لێوە دەکات (**وفي المبني للمفعول يعم الغائب والمخاطب**) واتە: ئەگەر فعلەکە کرا بە بینا مەجهول ئەوە لامی ئەمری دەچێتە سەر جا موخاتەب یان غائیب بێت، چونکە خۆی لە باسی بینا فاعیلی فەرمووی {فی أمر غیر المخاطب} بەڵام لە فعلی بینا مەفعول هیچ جیاوازی نییە، کەواتە: لە بینا مەفعولی دەتوانی هەر چواردە میسالی بینیەوە وەکو {لِيُنْصَرْ لِيُنْصَرا.....ألخ} چونکە لێرەدا هیچ فاعیل دیار نییە (**ويجوز دخول اللام على المخاطب المعلوم اذا كانوا حاضرا وغائبا**) دروستە لامی ئەمر بچێتە سەر فعلی -مضارع-ی مەعلوم لەو کاتەی کە بۆ موخاتەب بێت، وە ئەوانەی ئەمریان پێ دەکرێت هەندێکیان لەوێ ئامادەو حازر بن وە هەندێکیان لەوێ دیار نەبن (**ليفيد اللام الغيبة والتاء الخطاب**) بۆ ئەوەی لام سوودبەخش بێت و ئاماژە بێت بۆ ئەوانەی کە ئامادەنینەو حازرنینە، وە {ت} ئاماژە بێت بۆ ئەوانەی کە موخاتەبن وەکو {لِتَذْهَبوا} ئێستا لەو میسالەدا لام ئاماژەیە بۆ ئەوانەی کە غائیبن وە {ت} بۆ ئەوانەی کە موخاتەبن، ئەگەر بهاتبا لەو نمونەیە هەموویان غائیب بوونایە ئەوە دەگوترا {لِيَذْهَبوا} وە ئەگەر هەموویان موخاتەب بوونا دەگووترا {إذْهَبوا} (**والأكثر تغليب الحاضر**) بەڵام بە زۆری حیساب بۆ حازرەکان دەکرێت و صیغەی ئەمری موخاتەب بەکار دێت. لەم کاتەدا

بلێ: {إذهبوا} جا هەمووان دەگرێتەوە، ئەگەرچی هەندێکیشیان ئامادە نەبن **(ومنها لا الناهية)** یانی یەکێکە لە عامیلی جازیمە وشەی {لا}یە کە بۆ نەهی هاتووە. نەهی واتە: داوا دەکەی کە ئەم کارە ئەنجام نەدرێت **(تدخل على الغائب والمخاطب فيهما)** ئەم {لا}ی نەهیە دەچێتە سەر فعلی -مضارع-ی جا غائیب بێت یان موخاتەب بێت، وە هەروەها بینا فاعیل بێت یان بینا مەفعول بێت **(لايَنْصُرْ لايَنْصُرا لايَنْصُرُوا....الخ)** ئێستا لەو میسالانەدا ئەم {لا}یە چۆتە سەر ئەم فعلانە عەمەلی تێدا کردوون، عەمەلەکەش لە لەفزو لە مانادا کراوە، مانایەکەی کردۆتە نەهی واتە: داوا دەکەی کە فعلەکە نەکرێت، وە عەمەلی لەفزی ئەوەیە کە مەجزومی کردووە بە حەزفی حەرەکەی لام الفعل. وە تۆش دەتوانی هەر چواردە میسالەکان بینی کە لە هەموویان حەزفی حەرەکەی موفرەدی کرابێت لەگەڵ حەزفی نونەکان تەنها نونی جەمعی -مؤنث- نەبێت، وە لە بینا مەفعولیش بە هەمان شێوە، وە ئەگەر ئەو فعلەی ئەم نونەی دەخرێتە سەری ئەگەر معتل اللام بوو ئەوە {لا}ی ناهیە حەرفی ئاخیری دەبات وەك {لم يرمِ ولم يغزُ}.

## باسی ئەمری بە صیغە

**(وأما الأمر بالصيغة)** ئەو ئەمرەی کە خودی وشەکە بە مانا ئەمرو داواکاریە، واتە: ئەمەرەکە لە خودی وشەکە وەردەگیرێت نەك بە هۆی لامەوە بێت **(وهو أمر المخاطب)** ئەم ئەمرە تایبەتە بەو کەسەی کە لە بەرامبەرتەو ئامادەیەو روو بە روو قسەی لەگەڵ دەکەی، وەکو دەڵێت {أُكتُبْ} **(فهو جارٍ على لفظ المضارع المجزوم)** ئەمری بە صیغە دەکەوێتە شوێنی فعلی -مضارع-ی مەجزوم وە لەسەر قانون و یاسای ئەم فعلەیە **(في حذف الحركات والنونات)** لە حەزفکردنی حەرەکەی موفرەدەکان و نونەکانی -تثنية-و جەمع و موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەبە، تەنها نونی جەمعی -مؤنث- لاناچێت جا چ غائیب یان موخاتەب بێت، وە ئەگەر ئەو فعلە معتل اللام بێت ئەوە حەزفی لام الفعل دەکرێت بەو

مەرجەی شتێك نەبێت بۆ مانەوەی ئەم لام الفعلە وەکو ئەوەی کە نونی تەئکید یان ئەلف...هتد. کە لەمەودوا باسی دەکات. جا ئەو فعلە -مضارع-ەی کە ئەمری بە صیغەی لێ دروست دەکرێت دوو جۆری هەیە: چونکە یان حەرفی دوای حەرفی -مضارع-ی یان حەرەکەدارە یان ساکینە، ئنجا دێتە سەر ئەو باسەو دەفەرموێت (**فإن کان ما بعد حرف المضارعة متحرکا**) واتە: ئەگەر حەرفی دوای حەرفی -مضارع-ەتی حەرەکەی هەبوو (**فتسقط منه حرف المضارعة**) یاسا وایە کە تۆ حەرفە -مضارع-ەکەی حەزف دەکەی لە ئەوەلی ئەم فعلە (**وتأتي بصورة الباقي مثل المجزوم**) جا {تلفظ} دەکەی بەو سورەت و بەشەی کە ماوەتەوە لە دوای لادانی حەرفی -مضارع-ی بە وێنەی -مضارع-ی مەجزوم {تلفظ}ی پێ دەکەی، واتە: چۆن لە -مضارع-ی مەجزوم حەزفی حەرەکەکان و نونەکانت دەکرد تەنها نونی جەمعی -مؤنث- نەبێت، وە چۆن ئەگەر فعلەکە معتل اللام بووایە حەزفی لام الفعلەکەت دەکرد ئەم ئەمرەی بە صیغەش بە هەمان شێوە. جا کە فەرمووی {مثل المجزوم} وەدەرکەوت کە ئەمری بە صیغە وەکو ئەمری بە لام و فعلی -مضارع- نییە کە ئەوان موعرەب و مەجزومن، بەلاَم فعلی -مضارع- مەجزوم نییە بەلاَم لە حەزفی نونەکان و حەرەکەی موفرەد وەکو ئەوان وایە، ئەم باسە لە کتێبەکانی {نحو} تەماشا بکە (**مثاله من تُدَحْرِجُ**) میسالی ئەمری بە صیغە لەم فعلە -مضارع-ەی کە حەرفی پاش حەرفی -مضارع-ی حەرەکە دارە کە {تدحرج}یە" جا دەڵێت: (**دَحْرِجْ**) ئەمە بۆ مفردی -مذکر-ی موخاتەبە ئەصلەکەی {تدحرج} بوو {ت}حەرفی -مضارع- بوو لاماندا،پاش ئەم حەرفە حەرەکەدارە پێویست بە هەمزەی وەصل ناکات: ئاخرەکەمان گیڕا بە وێنەی -مضارع-ی مجزوم بە حەزفی حەرەکەی ئاخری" بوو بە{دحرج} (**دحرجا دجرجوا**) ئەمەش تثنیة و جەمعە حەرفی -مضارع-ی لە ئەوەلیەوە لادراوە نونەکانیش لە ئاخری لادران بووبە{دحرجا دحرجوا} (**دحرجي**) ئەمەش بۆ موفرەدی-مؤنث-ی موخاتەبە، ئەصلەکەی{تدحرجین} بوو{ت} کەحەرفی -مضارع-ی بوو لاماندا،وە ئاخرەکەمان گیڕا بەوێنەی

-مضارع-ی مجزوم بُە حەزفی نونەکەی بووبە{دَحرجي}(**دحرجا دحرجْن**) ئەمەش تثنیەوجەمع، جا لەتثنیة{ت}لەگەڵ نونی ئاخری لادراوە، بەڵام لە جەمع تەنها{ت} حەزف کراوە، چونکە ئەم نونە لاناچێ. (**وهكذا فَرِّحْ**) هەربە شێوەی {دحرج} وایە {فرَح}، کەئەصلەکەی {تُفَرِحُ}بوو، {ت} لەگەڵ حەرەکەی ئاخری لاچووە، ئەمە موفرەدی-مذکر-ە جاباقی میسالەکان {فرِحا، فرحوا، فَرِحي، فرحا، فَرِحنَ}(**وقاتِل وتكَسَروتباعَد وتَدَحرَج**) یانی هەرفعلەك حەرفی پاش حەرفی -مضارع-ی حەرەکە داربێت بە شێوەی {دَحرِج} ئەمری بە صیغەی لی دروست بکە. ئێستا {قاتل} ئەمرە لە بابی مفاعلە، ئەسلەکەی {تقاتل}بوو، وە{تکسر}ئەمرە لە بابی {تفعل}، ئەسلەکەی {تتکسر}بوو، وە{تَباعَد}لە بابی تفاعلە، ئەسلەکەی {تَتَباعد}بوو، وە{تَدَحرَج}بابی {تفعلل}دیە، روباعی مەزید و فیە بەیەك حەرفە، ئەسلەکەی {تتدحرج}بوو. لە هەر هەموان حەرفی -مضارع- حەزف کراوە، وە ئاخرەکەی بە وێنەی -مضارع- ی مجزوم حەرەکەی لاچووە: وە لە -تثنیة-و جەمعەکانیش حەزفی نونەکان دەکرێت، تەنها نونی جەمعی -مؤنث- نەبێت. ئەمە ئەو -مضارع-ە بوو کەحەرفی پاش حەرفی -مضارع-ی حەرەکەدار بێت. (**وان كان ما بعد حرف المضارعه ساكنا**) واتە ئەگەر ئەو حەرفەی کە لە پاش حەرفی -مضارع-ە کە بە ساکن بوو، (**فتحذف منه حرف المضارعه وتأتي بِصورة الباقي مثل المجزوم**) لەم کاتە تۆ حەرفی -مضارع-ەکەی حەزف دەکەی جا{تلفض} دەکەی بەم سورەتەی کە ماوەتەوە، بە وێنەی فعلی -مضارع- مجزوم، واتە حەزفی حەرەکەونونەکان جگە لە نونی جەمعی -مؤنث- دەکەی وە ئەگەر {معتل اللام} بێت حەزفی حەرفەکەی ئاخری دەکەی وەکو پێشان باسکرا، (**مزيداً في أوله همزةُ وصلِ مكسورةٌ**) جا کە{تلفض} بەم باقیە دەکەی لە حاڵێکدا کە زیاد بکرێ لە ئەوەلی ئەم فەعلە ئەمرە ، همزەی وەصلی مەکسورە، تاکو{ابتداء} بە ساکن نەبێت، (**ابتداء عند سيبوية**)، جا هەمزە مەکسورەکە هەر لەکاتی هێنانەکەی بەم شێوەیە هێندراوە، لە سەر فەرموردەی سیبویە{رحمە اللة} (**وبعد**

**زیادتها ساكنا عند الجمهور)** بەڵام زۆربەی زۆری زانایانی عیلمی {صرف} دەڵێن: ئەم هەمزە بە ساکن زیادکراوە، جا پاشان ئەم حەرەکەیان پێدا کە کەسرەیە. یەکێك پرسیار دەکات بۆچی هەمزە هەڵبژێردراوە لە حروفەکانی زیادکردن کە{سئلتمونیها} یە جا لە وەڵام دا دەفەرموێت: (**خُصَّت لأن الأبتاء بالأقوى أولى)** واتە هەمزە تایبەت کرا بەم زیادکردنە، چونکە هەمزە حەرفێکی بەهێزە، جا{ابتدا} واتە دەست پێ کردنی هەر وشەیەك بەم حەرفە بە هێزە باشترە لە حەرفێکی تر. یەکێك دەڵێت: بۆ سیبویە بە مەکسوری زیاد دەکات، وە هەر وەها جمهور لە دوای هێنانی بە ساکن مەکسوری دەکات؟ لەوەڵامدا دەڵێت: (**ولان الكسرة اعدل الحركات)** یانی سیبویە وجمهور ئەم کەسرەیان هەڵبژاردووە، چونکە کەسرە ڕێکترین حەرەکەیە ومام ناوەندیە، واتە نە وەکو -ضمة-ی گرانە ونە وەکو فەتحەی سوکە، بۆ ئەو ئەم شوێنە لە هەموان باشترە (**او لان الاصل في تحريك الساكن الكسر)** جمهور بە ساکن زیادی کردووە، پاشان حەرەکە داریان کرد بە کەسرە، چونکە ئەصل ویاسا لە حەرەکە دار کردنی ساکن کەسرەیە. میسالەکان{اِحزب، اِجتمع، اِحرنجم} (**ومضمومة ان كان عين المضارع مضموماً)** ئەمە عەتفە بەسەر -مکسورة- یانی لەدوای لادانی حەرفی -مضارع-ی هەمزە زیاد دەکرێ، ئەو جارە بە -مضموم-ی زیاد دەکرێ، بەو مەرجەی کە عەین الفعل لەم فعلە -مضارع-ە -مضموم- بێت، لەم کاتە دا ئەم هەمزەیەش -مضموم-ە، هەر چەندە گرانیش بێت، (**لمناسبة حركة العين)** جا کە هەمزە -مضموم- دەکرێت لەبەر دووشتە، یەکەم: لەبەر مناسەبەی حەرەکەی عەین الفعلە، تاکو وەك یەك بن (**وثقل النقل من الكسرة الي الضمة)** ، دووەم: کە هەمزە -مضموم- کراوە ئەوەیە گرانە زمان لە سەرەوە بەرەو -ضمة- بڕوات، وەئەمەش هەموو کەس هەستی پێ دەکات، میسالەکە وەکو {اُنْصُرْ} ئێستا هەمزە -مضموم-ە تاکو لەگەڵ صادی وەك یەك بن، وە زۆریش ناخۆشە لە کەسرەی هەمزە بەرەو -ضمة-ی صادی بڕۆی، یەکێك دەڵێت: ساکن لە نێوانیان هەیە کەواتە لە کەسرەی بۆ -ضمة-ی ناچی،

بەڵکو بۆ ساکن دەچێت. لەوەڵام دا دەڵێت: (**والساكن حاجز غير حصين**) یانی ئەم حەرفە ساکنەی کە هەیە لە نێوان هەمزەو -ضمة-ی عين والفعل، ئەمە پەردییەکی بێ هێزە وەکو مردوو وایە وەهیچ حیسابی بۆ ناکرێ، کەواتە ئەگەر هەمزە مەکسور بێت، {انتقال} لە کەسرەیە بۆ -ضمة- ئەوەش ناخۆشە، یەکێك دەڵێت: مفتوحی بکە، لەوەڵامدا دەفەرموێت: (**واللبس بمضارع المتكلم لو فتحت**) ئەگەر ئەم هەمزەیە مفتوح بکرێ التباسی ئەم ئەمرە دەبێت بە فعلی -مضارع- لەکاتێ بۆ {متكلم وحدة}بێت، وەکو{أَنْصُرُ} ، لێرە تۆ نازانی ئەم وشە ئەمرە یان -مضارع-ی {متكلم وحدة}یە ، جا ناچار بوین کە -مضموم-ی بکەین، وە ئەکەر تۆ بڵێیت ئەمری بە صیغە ئاخرەکەی زەنەدارەو -مضارع-ی متكلم حەرەکەدارە، چۆن پێك دەچن. لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵێ راستە، بەڵام لەکاتی {وەقف} واتە لەسەر وەستان، وەك یەك دەبن: کەواتە ئەم هەمزەیە مەفتوح ناکرێت، (**مثاله أُنْصُرْ ، أُنْصُرا، أُنْصُرُوا**) ئەم سێ میسالە بۆ -مذكر-ی موخاتەبە -مفرد-و- تثنية-و-جمع-. (**أُنصرى أُنصرا أنصرن**) ئەم سێ میسالەش بۆ -مؤنث-ی موخاتەبانە بە موفرەدو -تثنية-و جەمع، ئێستا ئەم شەش میسالە فعلی ئەمرن لە -مضارع-ی بابی یەکەمن، حەرفی -مضارع- لە هەموویان حەزف کراوە پاش ئەم حەرفەش ساکین هەیە، جا هەمزەی وەصلمان بۆ هێناوە بە -مضموم-ی چونکە عين الفعل -مضموم-ە، وە حەزفی حەرەکەو نونەکانیش کراوە تەنها نونی جەمعی - مؤنث- ماوە وەکو لە پێشەوە گوتمان، وە بۆ زیادە شارەزایی ئەم ئیعلالانە بڕوانە کتێبی مامۆستای مدرس بکە (**وكذا البواقى**) واتە: وەکو {انصر انصرا....هتد} وایە هەر هەموو بابەکانی دیکە لە مەزیدو موجەرەد، جا ئەوەی کە حەرفی پاش حەرفی -مضارع- متحرك بێت هەمزەی ناوێت وە ئەوەی ساکین بێت هەمزەی دەوێت، وە ئەوەی عين الفعلی لە -مضارع-ەکەی -مضموم- بێت هەمزەی بۆ - مضموم- بکە لەوانی دیکە لە هەمووی مەکسور بکە. یەکێك رەخنە دەگرێت و دەڵێت:تۆ گوتت لە دوای حەزف کردنی حەرفی -مضارع- تەماشا دەکەین ئەگەر

پاش ئەم حەرفە حەرەکەدار بێت ئەوە پێویست بە هەمزە ناکات وە ئەگەر ساکین بێت پێویست بە هەمزە دەکات وە مەکسورو -مضموم- بە هەمان شێوە کە باسکران، وە ئێستا بڕوانە {أَكْرِمْ}فعلی ئەمرەو هەمزەی لە ئەوەلیەوە هەیە وە ئەم هەمزە نە مەکسورەو نە -مضموم-ە بەڵکە مەفتوحە، جا لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**وفتح همزة أَكْرِمْ بناء على الأصل المرفوض**) یانی عەرەبەکان یان صەرفییەکان مەفتوحیان کردووە هەمزەی {أَكْرِم}و هاووێنەکانی واتە: فعلی ئەمر لە بابی ئیفعال، چونکە دروستکراوە ئەم فعلە ئەمرە لە فعلە -مضارع-ەکی کە فەرامۆش کراوەو بەکار نایەت وە کە ئەصلیش بوو کەچی ئەم -مضارع-ەی بەکار دێت کە گووتمان (**فإن اصل تُكْرِمُ تُأَكْرِمُ**) چونکە بەڕاستی ئەصلی {تكرم} {تأكرم} بووە بەم هەمزەی کە نیشانەی ئەم بابەیە وە لە پێشان باسکرا بۆچی ئەم هەمزە حەزف کراوە -ئەوە بوو گووتمان لە -مضارع-ی متكلم دوو هەمزە کۆدەبنەوە وە ئەمەش گرانە جا هەمزەیەکمان لادا، وە لە صیغەکانی دیکەش {تكرم، نكرم، يكرم} لادرا، ئەگەرچی هەر یەك هەمزەیە لەو میسالانە دوو نینە، وەکو دەڵێن {طردا للباب} (**وبني الأمر من ذالك الأصل**) واتە: ئەمری بە صیغەی ئەم بابە لەو ئەصلە دروستکراوە کە فەرامۆش کراوەو مەتروکە کە {تأكرم}ی خاوەن هەمزەیە (**بحذف حرف المضارعة وإسقاط الحركة**) حەرفی -مضارع-مان حەزف کرد لەگەڵ لابردنی حەرەکە لە حەرفی ئەخیری (**وإعادة الهمزة لزوال علة الحذف**) جا هەمزە لە شوێنی خۆی ماوە چونکە هۆی حەزف کردنی ئەم هەمزەیە کۆبونەوەی دوو هەمزە بوو لە -مضارع-ی متكلمی{وحدة} ئەمەش نەما چونکە ئێستا -مضارع-نیە بەڵکو بویتە ئەمر، کەواتە هەمزە لە شوێنی خۆی دەمێنێ، جا ئەم مانایە لە سەر ئەمەیە کە وشەی {اعادة} بەمانا {اثبات}ە وە مانای تریشی هەیە، بەڵام ئەمەیان گونجاوترە بۆ ئەم شوێنە، جا ئەمە بوو هۆی مفتوح بوونی ئەم هەمزەیە. لە کاتێك (مصنف) {رەحمەتی خودای لێ بێت} ڕزگاری بوو لە باسی ئەمری بە صیغە، جا هاتە سەر باسی {تخفيف} کردنی فعلی -مضارع- و دەفەرمووێت (**واعلم أنه اذا**

**اِجتمع تاءان فِي أوّل مضارع تَفَعَّل وتَفاعَل وتَفَعْلَلَ)** یانی تۆ بزانە بەراستی هەرکاتێك کۆبونەوە دوو {ت} لە ئەوەڵی فعلی -مضارع- {تفعل و تفعاعل و تَفَعْلَل}ی واتە بابی {تفعُل و تفاعُل و تَفَعْلُل} کە دوانی ئەوەڵی -ثلاثي- مەزیدن بە دوو حەرف، سێهەمیان روباعی مەزیدە بە یەك حەرف جا ئەو میسالانەی کە دوو{ت}ی لیێ کۆدەبنەوە، **(کالمخاطب مطلقا)** واتە فعلی -مضارع-ی موخاتەب لەم سێ بابە دوو{ت}ی لەوێ کۆدەبنەوە بە {مطلق}ی یانی مفرد بێ یان -تثنية- بێ یان جەمع بێ -مذکر-بێ یان -مؤنث-، ئەمە بوو بە شەش میسال، **(والغائبة والغائبتين)** وەهەروەها لە مفردی -مؤنث-ی غائبە- وە-تثنية-ي -مؤنث-ی غائبە، یانی هەرکاتێك فعلی -مضارع- لەم سێ بابە بوو ئەم میسالانە بوون دوو{ت}ی کۆدەبنەوە، ئەمە بوون بە هەشت میسال، بەڵام لە موفرەدی -مذکر-ی غائب بە هەرسێك میسالەوە، وە لە جەمعی -مؤنث-ی غائبە هەر یەك {ت}ی دەبێ، چونکە ئەوانە بەبێ{ت} بەکاردێن، وەکو لە باسی حروفی{أنيت} باسکرا، جگە لە{ت} نیشانەی بابەکان هیچ{ت} دیکە یان نی یە، ئەمە بوون بە دوانزە میسال، وە لەگەڵ دوو{متکلمین} دەبن بە چواردە، کە ئەوان یەك بە هەمزەی {متکلم وحدة}یە و ئەوی تریان بە نون بەکاردێت بۆ{متکلم مع الغير}، **(فيجوز اِثباتهما)** یانی دروستە ئەم دوو{ت}یە هەردووکیان پێکەوە هەبن، کە یێکیان بۆ{مطاوع}دیەو نیشانەی ئەم بابەیە،وە ئەوی تریان حەرفی -مضارع-ە، جا بۆیە دروستە هەردووکیان مەوجودبن، چونکە ئەم هێشتنەوەیە ئەسلە. جا لە قورئانی پیرۆز خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿**وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ**﴾ ئیستا {تتلقي} بابی{تفعل}ە وە هەردوو تیەکان ماون **(ويجوز حذف احديهما للتخفيف)** وە دروستیشە لا بردنی یەکیێ لەم دوانە بۆ سوك کردنی ئەم وشەیە، میسالەکان {تجنبُ وتقاتلُ و تدحرجُ} کە ئەسلەکە{تتجنب......هتد} یەك لەم دوو{ت}یە حەزف کراوە، بەڵام بابزانین کامیان حەزف کراوە**(والمحذوف الاولي علي الاصح)** ئەوەی حەزف کراوە {ت}یەکەمە جا مەبەست بە یەکەمی ئەوەیە کە لە پێشەوە دیارە،

نەك ئەوەی کە پێشان هاتووە کە هی {مطاوع}ەیە وەکو هەندێك وا دەڵێن: (**وقبل الثانية**) گوتراوە ئەم{ت}یەی حەزف کراوە هی دووەمە لەنوسین دا کە{ت} {مطاوع}ەیە. یەك دەڵێت دیارە{ت} حەزف دەکرێ لە بینا فاعلەکەیان، نەدی لەبینا مفعولە کەیان جا دەفەرموێت: (**ولا يحذف من المجهول**) واتە {ت} حەزف ناکرێ لە بینا مفعولەکەیان، (**للزوم اللبس بمعلومه المحذوف منه لو حُذفَتِ الاولي**) چونکە -التباس-ی ئەو مجهولەی دەبێت بەو معلومەی کە{ت}ی لێ حەزف کراوە، لە کاتی حەزفی{ت}ی یەکەم بکرێ لەم مجهولە. پوختەی ئەم باسە دروست نیە{ت} حەزف بکرێ لە بینا مفعولی ئەمانە: نە{ت}ی یەکەم ونە{ت}ی دووەم، چونکە ئەگەر هی یەکەم حەزف بکرێ -التباس-ی ئەم بینا مفعولە دەبێت بە فعلی بینا فاعل، کە ئەویش {ت}ی یەکەمی لێ حەزف کراوە، بویتە{تَتَجَنَبُ} کە بینا فاعلە، هی یەکەمی لێ حەزف بکە دەبێتە{تجَنَبُ} وە{تُتجنبُ} بە-ضمة-ی {ت}یەکەم بینا مفعولە، وەرە هی یەکەمی لێ حەزف بکە کە هی -مضموم-ەکەیە دەبێتە{تجَنَبُ} لێرەدا هیچ جیاوازی نەما لەنێوان مەجهول ومعلومەکەی، جیاوازی لە نێوانیان بە{ت}یە -مضموم-ەکەیە، کە ئەو لاچو-التباس-ی ئەم معلوم ومەجهولە پێك دەبێت، ئەمە لە کاتێك کە{ت} یەکەم لابدرێ. جا هاتە سەر باسی هی دووەم کە گوتمان دروست نیە ئەویش لابدرێ، جا دەفەرموێت(**وبمجهول ماهو لمطاوعته لو حذفت الثانية**) یانی دروست نیە هی دووەمیش حەزف بکرێت لەم فعلە کە{تُتَجنب} چونکە ئەگەرحەزف بکرێت -التباس-ی دەبێت ئەم -مضارع-ە مەجهولە لەم سێ بابە بە فعلی -مضارع-ی مەجهول لە بابی {تفعيل}و {مفاعلة}و {فعللة} کە تێی دووەم حەزف بکرێت. پوختەی ئەم باسە ئەوەیە کە ئێمە لە پێشەوە گوتمان: بابی {تَفَعُّل} بۆ موتاوەعەی بابی {تفعيل} هاتووە وەکو {كَسَّرْتُهُ، فتَكَسَّر}، وە هەروەها بابی {تفاعل} بۆ موتاوەعەی بابی {مفاعلة} هاتووە، وە بابی {تفعلل} کە رباعی مەزیدە بۆ موتاوەعەی مجردی خۆی هاتووە کە {فَعْلَلَة}یە وەکو {دحرجته فتدحرج}، جا لێرەدا

{تُتَجَنَّبُ} کە فعلی -مضارع -ی مەجهولە لە بابی {تَفَعُّل} {ت}ی دووەمی لێ حەزف بکە دەبێتە {تُجَنَّبُ} ئنجا وەرە -مضارع-ی مەجهول لە بابی {تفعیل} بناسە، بێگومان دەبێتە {تُجَنّبُ} وە هەروەها بەم شێوەیە {تُتَباعَدُ} کە مەجهولی بابی {تفاعل}ە جا تۆش {ت} -مضموم-ەکە بهێڵەوەو مەفتوحەکە لابدە دەبێتە {تُباعَدُ}، وە مەجهولی -مضارع-ی مفاعلەش بە هەمان شێوە هەر {تُبَاعَدُ} بوو، وە هەروەها {تُتَدَحْرَجُ} {ت}ی مەفتوح لادە دەبێتە {تُدَحْرَجُ}، وە مەجهولی {تُدَحْرَجَ}یش هەر بە هەمان شێوە {تُدَحْرَجَ}یە کەچی ئەمەیان روباعی موجەرەدە وە هی یەکەمیان مەزیدە، جا لەبەر ئەوە گووتی: تێی یەکەم حەزف ناکرێت چونکە ئەگەر حەزف بکرێت ئەوە فعلی مەجهولی ئەو سێ بابە ئیلتیباسیان دەبێت بە مەجهولی ئەو سێ بابانە {تفعیل، مفاعلة، فعللة} لە کاتێك ئەو سێ بابە مەزیدانە بۆ موتاوەعەی ئەوانی یەکەم هاتوون، واتە: {تفعُّل، وتفاعل، وتفعلل} بۆ موتاوەعەی {تفعیل، ومفاعلة، وفعللة} هاتوون، ئەم -إلتباس- ەش کە گووتمان دەبێت ئەوە تەنها لە بینا مەجهولییە. جا یەکێك لێرەدا پرسیار دەکات: ئایا لە هیچ شوێنێك هاتووە کە لەو بابانە کە دوو تێ کۆبوونەوە یەکێك لابدرێت؟ ئەویش وەلام دەداتەوەو دەفەرموویێت بەلێ هاتووە لە قورئانی پیرۆز لە فعلی بینا مەعلوم تێیەك لادراوە (**وفي التنزيل** ﴿**فَأَنْتَ لَهُ تَصَدَّى**﴾، و﴿**نَاراً تَلَظَّى**﴾، و﴿**تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ**﴾) واتە: هاتووە لە قورئانی پیرۆز کە لە فعلی بینا مەعلومی -مضارع- لەو بابانە حەزفی تێی کراوە، وەکو {تصدی} ئەصلەکەی {تتصدی} بوو، وە {تلظی} ئەصلەکەی {تتلظی} بوو، وە {تنزل} ئەصلەکەی {تتنزل} بوو، لەم سێ فعلە کە هەموویان -مضارع-ی بابی {تفعل}ن تێ حەزف کراوە. جا یەکێك پرسیار دەکات چۆن دەزانی کە لەوانە تێیەك حەزف کراوە، کێ نالێ ئەوانە هەر -ماضی- نەبن؟ مامۆستاش لە وەلامدا دەفەرموویێت (**ولو كانت ماضيات لقيل تصديت**) یانی ئەگەر {تصدی} فعلی -ماضی- بووایە ئەوە دەبووا بگووترابا {تصديتَ} بە قەرینەی ئەو {أنت}ی لە پێشیەتی وە ئەگەر -ماضی- بۆ مفرد موخاتەب بەکار

هات ئەوە دەبێت {ت}ی پێوە بنوسێت، مادامەکی {تَ}ی پێوە نەلکێندرا ئەوە بە دیار کەوت کە -ماضی- نییە، کەوابوو -مضارع-ە {ت}ەکی لێ لادراوە (**وتلظتْ**) یانی ئەگەر {تلظی} فعلی -ماضی- بووایە ئەوا دەیفەرموو {تلظت} چونکە {نار}ی -مؤنث- لە پێشیەتی، وە هەر فعلەك -ماضی- بێت إسناد بدرێت بۆ -ضمیر-ی -مؤنث- پێویستە {ت}ی -تأنیث- بۆ ئەم -مؤنث-ە هەبێت. جا دەرکەوت کە ئەم فعلە -ماضی- نییە، چونکە {ت}ی -تأنیث-ی ساکینە لە دواوە نییە (**وتنزَّلتْ أو تَنَزَّلَ بفتح اللام**) یانی ئەگەر {تنزل} -ماضی- بووایە ئەوا یان دەبێ {ت}ی -تأنیث-ی لە دوا بووایە، چونکە لەفزی مەلائیکەت -مؤنث-ە یان دەبێت لام مەفتوح بووایە چونکە حەرفی ئاخیری لە فعلی -ماضی- واجبە مەفتوح بێت ئەگەر -ضمیر-ی فاعیلی پێوە نەبێت، وە لێرەش لام مەفتوح نییە بەڵکە مەرفوعە وەهیچ {تاء التأنیث الساکنة}ەی پێوە نییە، جا دەرکەوت کە ئەمە -مضارع-ە وە حەزفی {ت}ی لێکراوە. جا ئەم باسە کۆتایی پێ هات. لێردوە دێتە سەر باسی چەند یاسایەك لە بابی إفتعال دەفەرموێت (**واعلم أنه متی کان فاء إفتعل صادا أو ضادا أو طاء أو ظاء**) بزانە ئەی قوتابی بەڕاستی هەر کاتێك - فاء الفعل-ی بابی إفتعال یەك بێت لەم چوار پیتانە {ص، ض، ط، ظ،} (**قلبت تاءه طاء**) لەم کاتەدا قەلبی {ت}ی بچووك دەکرێتە {ط}ی گەورە، وە {ت}ی گچکەش نیشانەی بابی إفتعال (**لتعسر النطق بالتاء بعدها**) قەلبی {ت} دەکرێ بە {ط} چونکە زەحمەتەو ناخۆشە {تلفظ} کردن بە {ت}ی بچووك لە دوای ئەم چوار حەرفانە (**لإطباقها وانخفاض التاء**) چونکە ئەم حەرفانە کە پێیان دەڵێن {مطبقة} زمانی بەرەو مەلاشو بەرز دەکەنەوە، وە {ت}ی بچوکیش لە حروفی {منخفضة}یە یانی زمانی بەرز ناکاتەوە، جا ئەم {ت}ی بچوکەش لەگەڵ ئەم چوار پیتە دژی یەکن، جا قەلبی {ت}ی بچووك دەکرێت بە {ط} کە لەگەڵ یەکتر دەگونجێن (**مثل اصطلح من الصلح**) میسالی ئێمە لێرەدا {اصطلح}یە کە لە {صلح}ی وەر گیراوە، بەڵێ {صُلح} مەصدەری مجردە دەیکەن بە -ماضی-

پاشان نیشانەی بابی إفتعال کە هەمزەی مەکسورە لەگەڵ {ت}ی مەفتوحە لەنێوان -فاء الفعل و عین الفعل- جا دەبێتە {اصطلح} قاعیدەی لیّ هاتە جیّ قلبی {ت} کرا بە {ط} بوو بە {اصطلح} **(ولا تقلب الصاد طاء فتدغم)** دروست نییە صاد بکرێتە {ط} جا دەغم بکرێت و بیکەیتە {إطَّلَحَ} **(لأن حروف الصفير لا تدغم في غيرها)** چونکە حروفی صەفیری، واتە: ئەو پیتانەی کە پێیان دەڵێن حروفی صەفیر -واتە ئاوازو فیزە فیز- کە ئەمانەن {س، ص، ز} دەغم نابن لە هیچ حەرفێکی غەیری خۆیان، بەڵام لە خۆیان دەغم دەبن واتە: دروستە سین دەغم بکریّ لە سین وە دووەکانی دیکەش بە هەمان شێوە، بەڵام دروست نییە {ط} دەغم بکریّ لە صاد....هتد. **(ومثل إضطرب من الضرب)** {اضطرب} -ماضي- بابی إفتعالە لە {ضرب}ی وەرگیراوە، جا هەمزەی مەکسور لەگەڵ {ت}ی مەفتوح زیاد بکە دەبێتە {اضترب} جا قاعیدەی لیّ هاتە جیّ {ت} بکە بە {ط} دەبێتە {اضطرب} **(ولا تدغم الضاد أيضا في الطاء)** دروست نییە {ض} دەغم بکرێت لە {ط} هەروەکو {ص} دەغم نەکرا **(لأن حروف {ضوى مشفر} لا يدغم بعضها في بعض ففي غيرها بالأولى)** چونکە ئەم حەوت حەرفەی کە لەم رستەدا هەنە کە ئەمانەن {ض، و، ى، م، ش، ف، ر} کە پێیان دەڵێن حروفی {ضوى مشفر} ئەمانە هەندێك لە هەندێکیان دەغم نابن، یانی دروست نییە {ف} دەغم بکرێت لە {م}ی، یان {ش} دەغم بکرێت لە {ض}ی ...هتد. کەواتە لە غەیری خۆیان هەر دروست نییە، بەڵام لە نەفسی وێنەی خۆیان دروستە، یانی دروستە {ف}ی دەغم بکرێت لە {ف}ی، وە واو لە واو، وە شین لە شین...هتد. **(وجاء العكس فيهما على خلاف القياس)** واتە: هاتووە بە پێچەوانەی یاسای پێشوو، کە {ط} بکرێتە {ص}و پاشان دەغم بکرێت لە وشەی {اصطلح} بیکەی بە {إصّلح} ،یان بکریّ بە {ض} لە وشەی {اضطرب}ە بیکەیتە {إضّرب} بەڵام ئەمە خیلافی یاسایە، چونکە یاسا ئەوهایە کە ئەوەل قەلب بکریّ بە ئی دووەم لێرەدا بە پێچەوانەوە دووەم کراوەتە یەکەم **(ومثل إطَّرَدَ من الطَّرْدِ)** {اطّرد} فعلیّ -

ماضی-یە لە بابی إفتعالە، مەصدەری موجەرەدی {طرداً} پاشان کراوەتە {طَرَدَ} پاشان هەمزەی مەکسور لەگەڵ {ت}ی مەفتوح زیاد کرا.

بوو بە {إطترد} وەکو {إجتمع}ە پاشان {ت} کرا بە {ط} وە دەغم کرا بوو بە {إطَّرَدَ} (**وليس فيه إلاّ الإدغام**) دروست نیە لە {اطرد}ەی هیچ لوغەتێك وەکو ئەوانی تر تەنها ادغام دروستە (**ومثل اظطلم من الظلم علي الأصل**) دواین میسال وەکو {اظطلم}ە مەصدەرە مجرەدەکەی {ظُلْم} بوو کراوە بە {ظَلَمَ} پاشان نیشانەی بابی{افتعال} کە {ت} لەگەڵ هەمزە زیاد کرا بوو بە {اظتلم} پاشان {ت}کرا بە {ط} بووبە{اظطلم}، ئەمە لوغەتی ئەصلەکەیەتی کە هیچ دەغمی بۆ نەکراوە (**ویجوز {اطلم} علي القياس**) دروستە {ظ}بکرێ بە{ط} وەدەغم بکرێ، وەکو {اطلم} وە ئەمەش موافقی یاسایە، چونکە قەلبی یەکەمی کراوە بە دووەم، (**واظلم علي خلافة**) وە دروستە بیکەی بە {اظلم} بە پێچەوانەی یاسا، چونکە لێرەدا قەلبی دووەمی کراوە بە هی یەکەم (**وكذا متصرفاتها**) یانی ئەم حوکمە تەنها بۆ -ماضي-ەکان نیە، بەڵکو بۆ هەموو مشتقاتەکانی تریشە وەکو -مضارع-و مصدرو -اسم الفاعل-.....هتد. وەکو {يصطلح، اصطلاحاً، مصطلح.....هتد.} (**واعلم انه متي كان فاءافتعل دالاً أو ذالًا أو زاءً قلبت تائه دالاً**) بزانە هەرکاتێك {فاء الفعلي} بابی {افتعال} یەك بوو لەم سێیانە {د، ذ، ز} لەم کاتە قەلبی {ت}زیادەکەی دەکرێ بە {د} (**لقربهما من التاء مخرجاً**) چونکە {ط}لە قاعیدەی پێشوو {د} لەم قاعیدەیە، لەگەڵ{ت}ی بچووك {قرب المخرج}یان هەیە، واتە لەم شوێنەی کە لێی دەردەچن لە ناو دەمی لێك نزیکن، چونکە هەر سێکیان ودسەتینە، یانی لە ناوانی زاری دەردەچن. (**فتقول في افتعل من الدرء والذكر والزجر**) تۆ دەڵێیت لە دروست کردنی فعلی -ماضي- لە بابی {افتعال} لەم سێ مصدەرە کە{الدرء و الذكر و الزجر}ن (**ادّرَءَ**) لێرەدا {دَرْءً} مصدەری مجرەدە بیکە بە فعلی -ماضي- مجرد، بوو بە{دَرَءَ} پاشان نیشانەی بابی {افتعال} کە هەمزەیە لەگەڵ {ت} زیاد بکە، بوو بە {اِدْ تَرَءَ} جا

قەلبی {ت} کرا بە {د}و دەغم کرا بوو بە{ادّرَءَ} (**وليس فيه الا الأدغام**) لەم وشەیە دا تەنها ادغام دروستە، وەهیچ لوغەتی تری دروست نیە وەکو{اطرد} کەلەپێشان باس کرا، (**واذ دكَرَ**) بەڵێ -ماضي- **مجردەکەی** {ذَکَرَ} بوو، پاشان نیشانەی بابی {افتعال} زیادکرا بوو بە {اذْتکر} لەبەر ئەم یاسایە {ت} کرا بە{د} بوو بە {اذدكر} (**وفيه ثلاثة أوجه اظطلم**) یانی دروستە لە وشەی {إذدكر} هەر سێکی ئەو لوغەتانەی لە {اظطلم}ی دروست بوون، واتە: دروستە -ذال- بکرێتە دال و دەغم بکرێت و بگوترێت {إدّكر}، ئەم وەجهە لەگەڵ پێشوەکەی هەردووکیان قیاسین، وە بە پێچەوانەی دووەمیش دەتوانی {دال} بکەیتە {ذال} وە بڵێی {إذّكر} بەڵام ئەمەیان بە پێچەوانەی یاسایە هەروەك لە پێشەوە باسکرا (**وازدجر**) ئەم فعلە -ماضی- موجەرەدی {زجر} بوو، پاشان کردمان بە بابی إفتعال بوو بە {إزتجر}، دوای ئەوە قەلبی تێ کرا بە دال بە پێی قاعیدەی رابردوو بوو بە {إزدجر} (**وفيه وجها إصطلح**) یانی دروستە لە {إزدجر} هەردووکی ئەو شێوانەی لە {إصطلح}ەی دروست بوون، کە دەکاتە: {إزدجر} بە بێ دەغم کردن، وە {إزّجر} قەلبی دالی بکەی بە {ز} وە دەغمی بکەی، بەڵام دروست نییە بخوێنییەوە {إدّجر} چونکە گووتمان حروفی صەفیر لە غەیری خۆیان دەغم ناکرێن. جا لێرەدا لەوانەیە یەکێك بڵێت: بۆچی مصنف باسی جیمی نەکرد، کەچی تێ کراوە بە دال لەگەڵ جیم وەکو {واجدزّ}؟ ئەویش وەڵام دەداتەوەو دەفەرمووێت (**وأما قلبها مع الجيم دالا كما في واجدزّ شيحاً فشاذ**) یانی قەلبی {ت} لە بابی إفتعال لەگەڵ پیتی جیم کە کراوە بە دال وەکو شاعیر دەڵێت {واجدزّ} ئەمە شازەو کەمەو، یاسای پێ هەڵناوەشێتەوە، جا لەبەر ئەوە مصنف {ر.خ} باسی نەکرد، جا {اجدزّ} -مضاعف-ە وەکو {مدد} -ماضی- مجردی {جزز} بووە پاشان کرا بە بابی إفتعال بوو بە {اجتزز، يجتزز} وەکو {إجتمع} جا ئەمری بە صیغە لە -مضارع-ەکەی دروست کرا بوو بە {اجتز} پاشان {ت} کرا بە دال بوو بە {اجدز}.

## باسی نونەکانی تەئکید

جا مصنف {ر،خ} کۆتایی هێنا بە بابی إفتعال، هاتە سەر باسی دوو نونەکانی تەئکیدو فەرمووی (**وتلحق الفعل غير الماضي والحال ولو لفظا فقط نونان للتأكيد**) واتە: دەلکێ بە ئاخیری فعل دوو نون کە هەردووکیان بۆ تەئکیدن، واتە: بۆ بەهێزکردنی مانای فعلن، بەڵام مەرجە کە ئەو فعلەی نونی تەئکیدی پێوە دەلکێ کە بە هیچ شێوەیەك -ماضی- نەبێت تەنانەت لە لەفزیش -ماضی- بێت هەر دروست نابێت وەکو {إن ضربت ضربت} ئێستا ئەم فعلە لە لەفزدا -ماضی-یە بەڵام لە مەعنادا -مضارع-ە بە هۆی {إن الشرطية} جا ناتوانی نونی پێوە بلکێنی، وە هەروەها نابێت ئەو فعلەی کە نونی پێوە دەلکێت نابێت ئەو فعلە -مضارع-دش بێت کە بۆ زەمانی حال و ئێستاکە بێت (**إلاّ في الدعاء**) گووتمان نونی تەئکید بۆ -ماضی- نابێ مەگەر ئەو فعلە -ماضی-یە دوعا بێت لەو کاتە نونی تەئکیدی پێوە دەلکێت، جا هەندێك دەڵێن: قیاسیە وە هەندێك دەڵێن شازە (**كدامنَّ سَعْدُكِ**) ئێستا لەو نمونەیە {دام} فعلی -ماضی-یە وە نونی پێوە لکاوە بەڵام چونکە بۆ دوعایە دروستە، ئەوە بە شێکە لە پارچە شعرەك کە تەواوەکەی ئەوەیە:

**دامنّ سعدكِ لو رحمتِ متيماً**

**لولاكِ لم يكن للصبابة جانحا**

وە هەروەها ئەو فعلە -ماضی-ەی کە {إن الشرطية}ی لەسەرە لەگەڵ {ما} کە زیادە وەکو دەفەرمووێت (**فإمّا أدركن واحد منكم الدجال فليقرأ بسورة الكهف**) ئێستا {أدرك} فعلی -ماضی-یە لە بابی إفعالەو نونی تەئکیدی پێوە لکاوە لە کاتێکدایە کە {إن الشرطية} لەگەڵ {ما}ی زائیدە لەگەڵ جوملەکەی دایە، چونکە {إما} ئەصلەکەی {إن ما} بووە (**لمعنى الإستقبال فيه**) واتە: لەبەر ئەوە نونی تەئکید بەو فعلە -ماضی-یە وە لکاوە چونکە بۆ هۆی {إن الشرطية} مانای بۆتە إستقبال واتە: زەمانی داهاتوو دەدات یانی ئەگەر بە شازیش

دابندرێ لەبەر ئەمەیە کەمانای زەمانی دانەهاتووی تێدایە جا ئەم بەڵگەیە بۆ میسالی پێشووش دەگونجێت، چونکە {دام} دووعایە بۆ بەردەوام بوونی ئەم چاکەیە، ئەگەر چی هەندێك زانا بەرێزەکان دەڵێن بۆ دوعا قیاسە لە هەموو شوێنێك دەبێ. یەکێك رەخنە دەگرێ و دەڵێت: تۆ گوتت نونی تەئکید تەنها بۆ فعل دەبێت، وە دەبینم بە {اسم الفاعل}یش لکاوە وەکو {أقائلن} لە وەڵامدا دەفەرموێت: (**وشذ في اسم الفاعل**) یانی شازە کە نونی تەئکید لکاوە بە {اسم الفاعل}، (**مثل اقائلن أُحضروا الشهود**) لێرەدا قائل {اسم الفاعل}ەو ئەسلەکەی {قاول} بووە وئیعلال کراوە ونونی تەئکیدی پێوە لکاوە، بەڵام شازە یاسای پێ لەکەدار نابێت و هەڵناوەشێتەوە، کە گووتمان ئەم نونە تایبەتە بە فعل.

**تێبینی :**

ئەم شعرە بەزۆر شێوە ماناکراوەتەوە، یەك لە ماناکانی ئەوەیە: کە پیاوێکی عەرەب لە ژنی خۆی تورە دەبێت، وە پێی دەڵێت تۆ ژنی من نیت و، من تۆم مارە نەبریوە، لەو کاتەدا ئەم شاعیرە کە {ذؤبی کوری عجاجة} بەم عەرەبە دەڵێت:

**أرأيت ان جائت به أملودا مرجلاً ويلبس البرودا ولا يرى....ألخ،**

واتە: پێم بڵێ ئەگەر ئەم ژنە کورێکی رێك و پێك و سەر شانەکراوو قوماشێکی یەمەنی لەبەر کراوی هێنا وە هیچ ماڵو سامانی پێ نەبێت تۆ دەڵێیت ئەم ژنە هی من نییە با بۆ تۆ بێت، یان دەڵێی هی منە برۆن شاهید حازر بکەن، خۆ لەم کاتە ناڵێی هی من نییە.

(**ويشترط في اللحوق أيضا معنى الطلب**) واتە: بە مەرج گیراوە بۆ لکاندنی ئەم دوو نونە بە فعل کە مانای {طلب} واتە: داواکاری بگەیەنێت، هەروەك بەشەرت گیراوە کە ئەم فعلە -ماضی-و حال نەبێت، یانی {مستقبل} داهاتوو بێت، جا ئەم داوایەش (**تحقيقا كالأمر**) جا داوایەکەش حەقیقی بێت و راستەوخۆ بێت، وەکو فعلی ئەمرو نەهی... هتد (**أو تشبيها كالنفي**) یان ئەگەر داوایەکە هەقیقی نەبێت، بەڵام هاووێنە بێت، وەکو نەفی کە هاووێنەیە لەگەڵ نەهی لە نەبووندا،

ئێستا {لاتذهبْ} بە سکوونی ئاخیری نەهـیە، بەڵام {لاتذهبُ} بە رەفعەی نەفییە، مانای هەردووکیان نەڕۆیشتن دەگەیەنێت، بەڵام هی یەکەم داوایە، وە هی دووەم داوا نییە، جا نونی تەئکید بۆ هەردووکیان دەگونجێت وەکو {لاتذهَبَنَّ} (**دون الأخبار المستقبلة**) نونی تەئکید نابێ بۆ ئەو فعلانەی کە ماناکەیان ڕووداوێکی دانەهاتووە، وە خاڵیە لە داواکاری (**لفقد الطلب**) چونکە ئەم جۆرە فعلانە {طلب} داواکاریان تێدا نییە، وە ئەمەش مەرجە بۆ نونی تەئکید (**مثل سينصر**) ئێستا ئەم فعلە -مضارع-ەکی موستەقبەلەو خاڵیە لە داواکاری کەواتە دروست نییە نونی تەئکیدی پێوە بلکێ {سينصرنَّ}* نابێت هەرچەندە ئەم پیتی سینە بۆ تەلەبە هەر نابێت (**إحديهما خفيفة ساكنة**) یەك لەم دوو نونە سوکەو زەنەدارە (**والأخرى ثقيلة مفتوحة**) وە دووەمیان گرانەو سەری هەیە، میساڵەکانی هەردووکیان وەك ئەوەی کە قورئان دەفەرمووێت ﴿لَيُسْجَنَنَّ وَلِيَكُوناً مِنَ الصَّاغِرِينَ﴾. یەکێك پرسیار دەکات و دەڵێت: ئەم نونەی -ثقيلة- هەموو کاتێك هەر مەفتوح دەبێت؟ لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**إلاّ فيما تختص أي تنفرد الثقيلة به**) بەڵێ هەر مەفتوحە تەنها لە دوو شووێن نەبێت، کە ئەم دوو شوێنە نونی -ثقيلة- تایبەتە پێیان، وە خەفیفەیان ناچێتە سەر (**وهو فعل الأثنين وجماعة النساء**) ئەو دوو فعلەی کە نونی -ثقيلة-ی بۆ تایبەتە یەکیان -تثنية-یە چ بۆ پیاوان یان بۆ ئافرەتان، واتە: بۆ -مذكر- بێت یان بۆ -مؤنث- بێت، وە ئەوی دیکەیان جەمعی -مؤنثة- جا غائیب بێت یان موخاتەب (**فكسرت فيهما**) ئەم نونە ی -ثقيلة- لەم دوو فعلانە مەکسور کراوە، مەفتوح نییە (**تشبيها بنون التثنية**) لەبەر شوبهاندن و هاووێنەیی ئەم نونە لەگەڵ نونی -تثنية- لەوەدا کە هەردووکیان زیادن وە لە دوای ئەلف هاتوون، جا چۆن ئەویان مەکسورو لە ژێر کراوە ئەمەشیان بە هەمان شێوە لە ژێریان کرد (**نحو إذهبانِّ وإذهَبْنانِّ**) ئێستا {إذهبانِّ} فعل ئەمرە بۆ دوو کەس لە {تذهب} وەرگیراوە کراوەتە {إذهبا} پاشان نونی گرانمان پێوە لکاند بوو بە {إذهبانَّ} بە فەتحەی نون، پاشان نون مەکسور کرا لەبەر هاووێنەیی لەگەڵ نونی -

تثنية- بوو بە {إذهبانِّ}، وە {إذهبنانِّ} جەمعی -مؤنث-ی موخاتەبە ئەصلەکەی {إذهبنَّ} بووە، کە لە {تذهبن}ەی -مضارع- وەرگیراوە، نونی تەوکیدمان بۆ دانا بوو بە {إذهبْنَنَّ} پاشان ئەلفەکمان زیاد کرد لە نێوان نونی جەمعی -مؤنث-و نونی تەئکید بوو بە {إذهَبْنانِّ} وەکو بە خۆی دەفەرموویێت (**وتدخل ألفا بعد نون الجمع لتفصل بين النونات**) تۆ ئەلفێك دادەنێی لە دوای نونی جەمع بۆ ئەوەی جیایی‌و فەصل بێخیتە نێوان ئەم سێ نونە، کە یەکیان نونی جەمعەو دووانی دیکە نونی تەئکیدن چونکە نونی -ثقیلة- بە دوو نون حسابە یەکیان لەوەی دیکە دەغم کراوە، هەر لەبەر ئەمەش فەرمووی {النونات} بە صیغەی جەمعی گووت. وە ئەگەر یەکێك بڵێت: بۆچی یەکیان حەزف ناکەیت؟ دەڵێم: چونکە یەکیان فاعیلە وە ئەوانی دیکە تەئکیدن هیچیان نابێ حەزف بکرێن. (**ولا تدخلهما الخفيفة**) تۆ نونی خەفیفە نەخەیتە سەر ئەم دوو فعلە کە -تثنية-و جەمعی -مؤنث-ە مە خوێنەوە {اذهبانْ و اِذهبنانْ} (**والا يلزم التقاءالساكنين علي غير حده**) ئەگەر نونی خەفیفە بەم دوو فعلە بلکێنی گەیشتنی دوو پیتی ساکن روودەدات لەسەر غەیری ئەم سنوورو یاسایەی کە بۆی بڕیار دراوە کە ئەمەش دروست نابێت وەکو لەمەو دواباس دەکرێن، ئەم دوو پیتەش، یەکیان ئەلفەو، وە ئەوی تریان دەبێتە ئەم نونە خەفیفەیەی کە بیهێنی (**أما في التثنية فظاهر**) بەڵێ گەیشتنی ئەم دوو پیتە ساکنە لە میسالی -تثنية-شتێکی روونەو دیارە لەبەرچاو وەکو {اذهبانْ} ئەوەتە دوو ساکن لەم میسالە پێکەوەن، کە ئەلف ونونە (**وأما في الجمع فلأن الألف يُزاد معها**) بەڵام لە جەمعی ئەگەرچی هیچ ئەلفی تێدانیە، پێویستە لەوێش ئەلف زیاد بکرێت جا کە زیاد کرا ئەم {التقاء الساكنين}ە دەبێت. ئەگەریەك بڵێت: بۆ ئەلف زیاد دەکەی؟ دەڵێین چۆن لە نونی -ثقیلة- زیاد کراوە هەروەها لێرەش زیاد دەکرێ، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە قەرەداغی کە حاشیەی تصریفی {مەلا عەلی}ە {ر.خ} (**وان ذُهبَ الي مذهب يونس ايضا**) یانی ئەلف هەر زیاد دەکرێت لەگەڵ نونی خەفیفە، وەکو بۆ -ثقیلة- زیاد کراوە. ئەگەر لەسەر بۆچونی مامۆستای بە ڕێزیش

بێت کە {یونس}ە . جا بزانە لێرەدا سێ بۆچون هەیە، یەکەم: بۆچوونی {بصریەکان} ئەوان دەڵێن نونی خەفیفە بۆ ئەم فعلە قەدەغەیە، کە مامۆستا علی {ر.خ} لەسەر بۆ چوونی ئەوانە. دووەم: بۆچوونی {کوفیەکان} ئەوان دەڵێن نونی خەفیفە دەخەینە سەر ئەم دووانە، بەڵام نون حەرەکە دار دەکرێت لەبەر {إلتقاء الساکنین} کەواتە دروستە بڵێیت {اذهبانِ} بە کەسرەی نونی تەوکید. بیرو بۆچوونی سێهەم: هی مامۆستا {یونس}ە، ئەو دەفەرمویت نونی تەوکیدی سووك دەخەینە سەر ئەم -تثنية-و-جمع- وەهیچ حەرەکەشیان پێ نادەین وگەیشتنی دوو ساکن لێرەدا دروستە، جا مامۆستا {علی} فەرمووی ئەگەر نونی خەفیفە بخەیتە سەر ئەم دووانە پێویستە ئەلف زیادبکرێت، چونکە بۆ -ثقیلة- زیادکراوە، بۆئەمەش زیاد دەکرێت هەرچەندە بڕۆین بۆ بۆچوونی {یونس} کە بە ئاشکرا {إلتقاء} بووە (**ولا یجوز تحریکها**) بەڵێ کوفیەکان گووتیان نونەکەی حەرەکە دار دەکەین، جا بەڕێزی ڕەدیان دەداتەوەو دەڵێت: دروست نییە ئەم نونە حەرەکەدار بکرێت (**لأنهم یحذفونها عند التقاء الساکنین**) چونکە عەرەبەکان نونی خەفیفە لادەدەن لەکاتی گەیشتن بە ساکنێك، هەروەك میسال دەهێنێ و دەفەرمووێت (**کقول الشاعر: لا تُهِینُ الْفقیرَ....الخ، والأصل لا تهینَنْ : صح**) ئەصلەکەی پێشی تەوکید بکرێت {تهین} بوو، -ماضي-ەکەشی {إهانَ}دیە، {لا}ی نەهی هاتەسەری و حەرەکەی نونی لادا{إلتقاء الساکنین} بوو لەنێوان {ی}کە {عین الفعل}ە لەگەڵ {ن} کە {لام الفعل}ە پاشان {ي} لادراو{ن}بەساکن ماوە، جا نونی تەوکیدی خەفیفە هات و نونی ئەصلی مەفتوح کرد و{إلتقاء} نەما وە {عین الفعل} کە {ی}ە گەڕاوە شوێنی خۆی و، بووبە{لا تُهینَنْ} کە خۆی فەرمووی {والأصل....الخ} پاشان لەگەڵ {الفقیر}لێکدرا {إلتقاء} لە نێوان نونی خەفیفە لەگەڵ لامی {الفقیر} ڕوویدا بەناچاری نونەکەمان حەزف کرد بووبە {لا تُهینَ الفقیرِ} بەڵگەش لەسەر حەزفی نونی ئەوەیە کە نونی ئەصلی مفتوح بووە وە {ي} {عین الفعل}یش گەڕاوەتەوە، چونکە پێش ئەوەی تەوکید بکرێت {ي} حەزف کرابوو، وە

نونەکەشی ساکن بوو بەڵام کەتەوکید کرا، نونی {لام الفعل} مفتوح کراو {ي} {عين الفعل} گەڕاوە.

**پاشکۆ :**

باش وایە درێژە بدەین بە باسی نونی تەئکید چونکە ئومێدەوارین سودی هەبێت. ئنجا برای فەقێ گووتمان دوو نون بە فعلەوە دەلکێن بۆ تەئکید کردنەوەی فعلەکە، یەکەم: -ثقيلة-ی مەفتوحە، واتە: سەری هەیەو گرانەو بە شەددەیە. دووەم: خەفیفەی ساکینە، واتە: سووکەو زەنەدارە، وەکو دەڵێن: {إذهبنَّ، وإذهبَنْ} وە ئەوەش بزانە فعل سێ جۆری هەیە -ماضی- وە -مضارع- وە ئەمر، گووتمان ئەم نونانە بۆ فعلی -ماضی- دەست نادات مەگەر بە شاز واقیع بووبێت، وە بۆ فعلی ئەمریش بەبێ مەرج دەبێت، بۆ فعلی -مضارع-یش سێ جۆری هەیە، یەکەم: واجب، واتە: دەبێت هەر پێیەوە بلکێت، دووەم: جائیز، واتە: هەبوون و نەبوونی دروستە، سێیەم: ممنوع: واتە: قەدەغەیە پێیەوە بلکێت. ئنجا بزانە مەرجەکانی واجب چوارن، یەکەم: ئەو فعلە -مضارع-ە جەوابی {قسم} واتە: سووێند بێت. دووەم: لامی قەسەم لەسەر -مضارع-ەکەی بێت. سێیەم موستەقبەل بێت. چوارەم: -مثبت- بێت، یانی: حەرفی نەفی لەسەر نەبێت، میسالی ئەمە {واللّه لأبرنَّ صديقى} لێرە {أبر} -مضارع-ە وە جەوابی سوێندە، لامی لەسەرەو موستەقبەلەو -مثبت-ە واجبە نونی تەوکید بەم -مضارع-ەوە بلکێت. وە مەرجەکانی دروستبوونی ئەم نونەی تەوکید حەوتن، یەکەم: لە پێش ئەم -مضارع-ە {إن الشرطية} هەبێت لەگەڵ {ما}ی زائیدە، ئنجا ئەم وشەی {إن} دەغم بکرێت لە وشەی {ما} وەکو بڵێیت {إمّا تهملنَّ السعى تتعرض للفشل}. دووەم: لامی ئەمری لە پێش بێت وەکو {لتتركنَّ مدح نفسك وإلاّ كنت هدفا للسخرية}. سێیەم: لای نەهی لە پێش بێت وەکو قورئان دەفەرمووێت ﴿**وَلا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ**﴾. چوارەم: إستفهام، وەکو {هل تساعدنَّ الفَقيرَ}. پێنجەم: {عرض} {إلا تغفرنَّ ذنب الصديق}. شەشەم: {تحضيض} وەکو {هلا تخلصنَّ لزملائك}. حەوتەم: {تمني} وەکو {ليت اكمال الدراسة يعمنَّ

الطلاب} . لەم شوێنانە تۆ دەتوانی تەوكید بكەی و نەكەی بەپێی كات وشوێن، وە لە دوو شوێن قەدەغەیە تەوكید بكرێت. یەكەم: ئەو-مضارع-ەی كە جەوابی سوێندە، بەڵام مەرجەكانی واجب بوونی تێدا نەبێت، وەكو {والله لسوف آزور استاذي} لێرە لام هەیە بە{أ} لەسەر وشەی{أزور} نییە، بەڵكە فاصل هەیە، {والله لأقرء القران الآن} بۆ مستقبل نییە بەڵكە بۆ حالە{والله لا أحب الخونة} -مثبت- نییە بەڵكە{منفي}یە. دووەم: مەرجەكانی دروست بوونی تەوكید نەبێ كە حەوتەكانن، وەكو {تساعد الفقير} بەبێ وشەی {هل} یان بڵێت {تترك مدح نفسك...الخ} تا بەم شێوە تاكو تەواو دەبن.

یەكێك پرسیار دەكات و دەڵێت:{مصنف} {ر.خ}فەرمووی ئەگەر نونی خەفیفە بخەیتە سەر ئەم دوو فعلە {التقاء الساكنين} رودەدات لەسەر غەیری یاسای خۆی ئەمە وا دەگەیەنێ كە{التقاء الساكنين} هەبێت لەسەر یاسای خۆی ودروست بێت؟ جا دەفەرموویێت: بەڵێ (**والتقاء الساكنين إنما يجوز قياساً**) یانی: گەیشتنی دوو ساكین دروست نییە بە گوێرەی یاسا (**إلاّ فيما إذا كان الأول حرف لين والثاني مدغما**) مەگەر لە كاتێك كە ساكینی یەكەم لەم دوانە پیتی لین بێت و، وە ساكینی دووەمیش دەغم كرابێت لە پیتی دوای خۆی، وە پیتەكانی لین ئەوانەن {واو ساكن ما قبل مضموم، ياء ساكن ما قبل مكسور، وألف ساكن ما قبل مفتوح} ئەم سێ پیتە هەموو كات حەرفی عیللەیان پێ دەگوترێت، بەڵام هەموو كات پێیان ناگوترێت پیتی لین. جا ئەوەی گووتمان لەسەر بۆچونی هەندێك لە زانایانە، وە هەندێكی دیكە جیاوازی دەخەنە نێوان حەرفی لین و مەددە، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە حاشیەكانی تەصریفی مەلا عەلی (**كدابَّةٍ**) ئێستا وشەی {دابة} ئەصلەكەی {دابِبَة} بوو، پاشان پیتی یەكەم ساكن كرا ئنجا لە هی دووەم دەغم كرا، لێرەدا دوو ساكین بە یەك گەیشتن یەكەمیان ئەلف و دووەمیان {باء} كە دەغم كراوە لە بێی دووەم جا ساكینی ئەوەڵ حەرفی مەددە وە ساكینی دووەم دەغم كراوە لەسەر یاسای خۆیەتی، ئەمە دروستە (**وخُوَيْصَّة**) ئەمە تەصغیری {خاصّة}یە، ئەصلەكەی

{خُوَیْصِصَة} بووە صادی یەکەم ساکن کراو لە صادی دووەم بزر کرا، جا دوو ساکن بە یەك گەیشتن یەکەمیان {ی} وە دووەم صاد ئەمە دروستە چونکە بە گوێرەی یاسایە. وە میسالی واویش ئەوەیە {تُمُودّ الثوب} ئەصلەکەی {تُمُودِدَ} بوو، فعلی بینا مەجهولی {تمادد}یە وەکو {تباعد} ئەلفەکەی کرا بە واو چونکە بە پێی یاسای خۆیەتی، وە دالی یەکەم ساکن کراو لە دالی دووەم بزر کرا، جا هەرچەندە دوو واو بە یەك گەیشتن کە کە واوو دالە دروستە چونکە بە پێی یاسای ڕێ پێدراوە (**والوقف كزيدْ**) واتە: بە یەککگەیشتنی دوو ساکین بە گوێرەی قیاس دروستە لە کاتی {وقف} وەستان لەسەر هەر وشەیەك جا حەرفی مەد بێت یانە نا، وەکو {زَیْدْ} حەرفی دووەمی لینە یان وەکو {بَكْرن عَمْرٌو... هتد} (**ودخول همزة الإستفهام على الإسم المعرف باللام**) دروستە دوو ساکین بە یەك بگەن لە کاتی هەمزەی إستفهام بخەیتە سەر ئیسمێك کە ئەلف و لامی تەعریفی خراوەتە سەر وەکو {آلْحسنُ} ئەصلەکەی {أَلْحسن} بوو، هەمزەی یەکەم إستفهامە وە هەمزەی دووەم وەصلە، هەمزەی وەصل قەلبی کرا بە ئەلف، جا {إلتقاء الساكنين} ڕوویدا لەگەڵ لامی {الْحسن} ئەمە دروستە چونکە بە گوێرەی یاسای خۆیەتی (**وفي غيرها تحذف المده**) واتە: ئەگەر دوو ساکین بە یەك گەیشتن لە غەیری ئەم سێ شوێنەی ڕێیان پێدراوە پێویستە پیتی مەدە حەزف بکرێت لە کاتێك {إلتقاء} لەگەڵ ئەو بێت جا ئەو مەدە واو بێت یان {یاء} یان ئەلف بێت وە لە یەك وشە بن یان لە دوو (**كيَغْزو الجَيْشُ**) ئێستا ئەم واوە کە پیتی مەدەیە لەگەڵ لامی {الجيش} بە یەك گەیشتوون ئەم واوە {لفظاً} حەزف کراوە بەڵام بە نووسین هەر دەمێنێت، وە بەهەمان شێوە میسالەکانی ئەلف و یائیش وەکو {يَخْشَى القومُ} وە {يَرْمي الغرض} ئەم ئەلفە لە {یخشی} وە یائی {یرمی} ئەگەر چی لە نووسین ماون بەڵام ناخوێندرێنەوە (**ويُحَرِّكُ غيرها**) واتە: ئەگەر {إلتقاء الساكنين} بوو، بەڵام پیتی مەدە لەوێ نەبوو بەڵکە پیتێکی دیکە لەوێ بوو ئەمەیان لانادرێت و، پێویستە حەرەکەی بدەیتێ، جا ئەم پیتە ئەگەر پیتی عیللەش بێت هەر لانادرێت، چونکە گووتمان تەنها پیتی مەدە

لادەدرێت، جا حەرەكەدار كردنی ئەم ساكینە یان ساكینی یەكەم حەرەكەدار دەكرێت یان هی دووەم وەكو مامۆستا خۆی دەفەرموویت (**إما الأول**) واتە: یان ساكینی یەكەم حەرەكەدار دەكرێت، وە لەمەودوا دەفەرموویت {وإما الثانی} (**كاِضرب القومَ**) لێرەدا دوو ساكین بە یەك گەیشتن ساكینی یەكەم {باء}ەو ساكینی دووەم لامی {القوم}ە بە ساكینی یەكەم وە حەرەكە خستراوە كە {ب} وە حەرفێكی ساغیشە عیللە نییە، یان وەكو {إخشَىِ اللّهَ یا هندُ} لەم وشەیە {ی} حەرفی عیللەیە بەلاّم حەرفی مەددە نییە، وە ئەمەش حەرەكەدار كراوە بە كەسرە (**والأصل أن یحرك بالكسر**) یاساو قانون وایە كە پیتی ساكین بە {كسرة} لەژێر حەرەكەدار بكرێت، جا ئەم ساكینە یەكەم بێت وەكو میسالی خۆمان یان دووەم بێت (**ویعدل عنه لمناسبات**) گوتمان قانون وایە ساكین وە حەرەكە بخسترێت بە لەژێر، بەلاّم هەندێك جار لەم یاساو قانونە لادەدرێت و ئەم ساكینە حەرەكەدار دەكرێت بە غەیری كەسرە لەبەر چەند شتێك كە گونجاوو رێكترە (**مثل الخفة فی الفتحة**) یەك لەم شتانەی كە لە كەسرە لابدرێ ئەوەیە كە فەتحە سوكە جا ئەم ساكنە حەرەكەدار دەكرێت بەفەتحە چونكە سوكە لەسەر زمانی، وەكو{مِنَ المدینة}لێرەدا {التقاء الساكنین} رویدا لەنێوان نونی {مِنْ} لەگەلّ لامی {المدینة} جا نون حەرەكەدار كرا بەفەتحە چونكە زۆر سووكە (**وضمة اصلیة علی ما بعد الساكن الثانی وفی كلمته**) وە هەروەها موناسبەكی تر كە لەكەسرە لادەدەین ئەوەیە هەركاتێك-ضمة- یەكی ئەسلی هەبێت لەدوای ساكینی دووەم، وە-ضمة-كەو ساكنەكەش لە یەك وشە دابن لەم كاتەش ساكنی یەكەم بەكەسرە حەرەكەدار ناكرێت بەلّكو ئەم جارە بە -ضمة- حەرەكەدار دەكرێت، لەبەر رێك بوونی لەگەلّ ئەم -ضمة-ی كە لەدوای ساكنی دووەم هەیە (**كقالتُ اخْرُج**) ئێستا ساكنی یەكەم{ت} -تأنیث-ە وساكنی دووەم پیتی{خ}ە لەدوای ئەم ساكنە -ضمة-كی ئەصلی هەیە كە -ضمة-ی {ر}یە وە هەردووكیان لە یەك وشەدانە، جا ساكینی یەكەم حەرەكەدار كراوە بە -ضمة- لەبەر موناسەبەی پاش ساكینی دووەم، چونكە هەرچەند -ضمة- گرانە بەلاّم زمان لەسەر

یەك ڕێگا بڕوا هەر خۆشترە، میسالی دیکە (**وقالتُ اغْزی**) لێرەدا {اغزی} فعلی ئەمرە بۆ -مؤنث-ی موخاتەبە، ئەصلەکەی {تغزوین} بووە وەکو {تنصرین} ئیعلال کراوە، بەڵێ {التقاء} لە نێوان {ت} لەگەڵ غەین بوو {ت} حەرەکەدارکرا بە -ضمة- چونکە لە دوای ساکینی دووەم کە {غ}ە -ضمة-کی ئەصلی هەبووە کە -ضمة-ی پیتی {ز}یە بەڵام لەبەر هۆی ئیعلال واو نەماوە وە {ز} مەکسور بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم -ضمة-یە لە ئەصلدا هەبووە ئێستاشلە{تقدیر}دا حیسابی بۆ دەکرێت، وە ساکینی یەکەم -مضموم- دەبێت بەڵام کەسرەشی دروستە (**لا قالتُ ارْموا فإنّه یکسر**) واتە: دروست نییە لێرەدا ساکینی یەکەم کە {ت}ە حەرەکەدار بکرێت بە -ضمة- چونکە لە دوای ساکینی دووەم کە {ر}ە -ضمة- هەیە کە هی میمە، بەڵام ئەصلی نییە بەڵکو بە هۆی ئیعلال -مضموم- بووە چونکە ئەصلەکەی {إرمیوا} بووە وەکو {إضربوا} یانی میم مەکسور بووە لە ئەصلدا کەواتە لە ساکینی یەکەم -ضمة- دروست نییە، وە هەروەها ئەگەر -ضمة- ئەصلیش بێت بەڵام لەگەڵ ساکینی دووەم لە یەك وشە دانەبن -ضمة- لە ساکینی یەکەم هەر نابێت وەکو {إنِ الْحکم} ئێستا لە دوای ساکینی دووەم کە لامە -ضمة-ی ئەصلی هەیە کە هی {ح}ە بەڵام چونکە لەیەك وشە نین ساکینی یەکەم کەنونە -مضموم- نابێت جا ئەگەر بلێیت بۆ یەك وشە نین؟ لەوەڵام دا دەڵێین: لام وشەیەکە وە حوکم وشەیەکی دیکەیە هەرگیز -ضمة- دروست نابێت (**وإما الثانی**) گوتمان یان ساکینی یەکەم حەرەکەدار دەکرێت یات هی دووەم کە ئەمەیە (**إن أسکن الأول لغرض**) بە مرجێك ساکینی دووەم حەرەکەدار دەکرێت کە حەرفێك ساکین بکرێت لە پێش ئەم ساکینە لەبەر مەبەستێك، جا دوو ساکین دەگەن بە یەك ئەو جارە ساکینی دووەم حەرەکەدار دەکەین (**کلم یَلْدَهْ والأصل یَلِدْهُ**) میسالی وە حەرەکە خستنی ساکینی دووەم وەکو {لم یَلْدَهْ} ئەصلەکەی {یَلِدْهُ} بووە لام لەژێر دال لەبەر عامیلی جازیم زەنەدار بوو (**شُبِّهَ بکَتْفٍ**) جا ئەم فعلە شوبهێندرا بە وشەی {کَتْف}ە کە هەردووکیان سێ حەرفین و حەرفی ناوەندیان لەژێری هەیە، وە دروستیشە لە

{کتف}ەی حەرفی ناوەندی کە {ت}یە زەنەدار بکرێت، جا لەم فعلەش واتە {یلده} حەرفی ناوەندی وەکو {کتف} مەکسورە، وە دروستە زەنەدار بکرێت، وە هەردووکیشیان سێ حەرفینە، ئەگەرچی لە {کتف} هەموو حەرفەکان ئەصلینە بەڵام لەم فعلە پیتی {ی} زیادە، جا مەبەست لەم شوبهاندنە سوککردنی ئەم فعلەیە، جا کە تەشبیە کرا (**فأُسْكِنَ اللام**) لەم فعلەدا لام کە عین الفعلە پێشان لەژێری هەبوو ساکین کرا وە {إلتقاء الساكنين} بوو لە نێوان لام و دال، پێویستە چارەسەر بکرێت (**فحرّك الدال بالفتح لإقتضاء الهاء الفتح**) جا کە دوو ساکین بە یەکگەیشتن ساکینی دووەم کە دالە وە حەرەکە خسترا لەبەر بە یەکگەیشتنی دوو ساکین، وە کە فەتحەی پێدرا ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە پیتی {ه} دەیەوێت پێشی مەفتوح بێت تەگینا کەسرە ئەصلە (**ولو حرّك اللام لفات الغرض**) بەڵێ دال حەرەکەدار کرا چونکە ئەگەر لام حەرەکەدار بکرابا ئەو مەبەستەی کە لامی بۆ ساکین کرا بوو -کە شوبهاندنە بە -کتف- بەلاش دەچوو (**ويحذف مع التأكيد بالنون النون التي في الأمثلة الخمسة**) حەزف دەکرێت لە کاتی لکاندنی نونی تەوکید بەو پێنج فعلە کە پێیان دەگوترێت {الأمثلة الخمسة} ئەم نونەی کە هەیانە (**وهي يفعلان وتفعلان ويفعلون وتفعلون وتفعلين**) واتە: پێنج فعلەکان ئەمانەن، یەکەم: {يفعلان} بۆ دوو نێرینەی غائیب، واتە:بۆ دووی نادیار دەگووترێت. دووەم: {تفعلان} ئەمە بۆ سێ میسال دەگونجێ، بۆ دوو نێرینەی موخاتەب، وە بۆ دوو مێینەی غائیبە، وە بۆ دوو مێینەی موخاتەبە. سێیەم: {يفعلون} بۆ جەمعی -مذكر-ی غائیب بەکار دێت. چوارەم: {تفعلون} بۆ -مذكر-ی موخاتەب بەکار دێت. پێنجەم: {تفعلين} بۆ موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەبە، واتە: بۆ یەك ئافرەتی حازر بەکاردێت. جا ئەم نونە لەم پێنج فعلە دەڕوات لە کاتی نونی تەئکیدیان پێوە لکاندرا (**لأنه فيها علامة الإعراب**) چونکە ئەم نونە لەم پێنج فعلە نیشانەی إعرابە وەکو عیلمی نەحو باس دەکات کە ئەم فعلانە رەفعەیان بە هەبوونی نونە، وە نصبەو جەزمەیان بە حەزفی نونە، جا کە ئەم نونە نیشانەی إعراب بێت دیارە ئەم پێنج فعلەش موعرەبن (**وهذا**

**يجعل الفعل مبنيا كنون جمع المؤنث**) وە ئەم نونەی تەئكیدیش بە هەر فعلەك وە لكا بێت دەیكاتە مەبنی هەرودك نونی جەمعی -مؤنث- فعلی دەكاتە مەبنی. جا لە كاتی ئەم نونە تەئكیدە هات پێویستە نیشانەی إعراب لا بچێت (**وحينئذ يكون مبني الأصل عند بعض ومبني العارض عند آخرين**) لە كاتی كە ئەم فعلە تەئكید كرا بەم نونە ئەوا ئەم فعلە دەبێتە مەبنی و لە موعرەبی دەردەچێت، جا هەندێك دەڵێن: مەبنی ئەصلە كە بەصریەكانن، وە هەندێكی دیكە دەڵێن: مەبنی -عارض-ە ئەمانەش كوفیەكانن، جا جیاوازی لە نێوان ئەم دووجۆرە مەبنیە وە بەڵگەی بوونی ئەم فعلە بەم دوو جۆرە مەبنیە لە كتێبە درێژەكان باس كراوە (**ويحذف واو يفعلون وتفعلون وياء تفعلين**) هەروەها لە كاتی لكاندنی نونی تەئكید بەم فعلانە واویش لادەبرێت لە {يفعلون و تفعلون} وە هەروەها {ي} یش لە {تفعلين} هەرودك نونەكە لادەبردرێت (**للثقل والإستطالة في الثقيلة**) جا كە واو و {ي} لادەبرێن لەبەر دوو شتە لە نونی -ثقيلة- یەكەم لەبەر گرانییە، دووەم لەبەر درێژی وشەكەیە بە هۆی ئەم نونە تەئكیدە، بڕوانە وشەی {يفعلونّ} پێك هاتووە لە فعلێك وئیسمێك وحەرفێك، بێگومان بەم شێوەیە درێژەو گرانە، جا كە واو حەزف كرا كەمێك سووك دەبێت، ئەمە لە نونی -ثقيلة- بەم شێوەیە، واتە: حەزفەكە لەبەر {ثقل وإستطالة}یە، بەڵام لە خەفیفەی ئەوەیە كە دەفەرمووێت (**والتقاء الساكنين على غير حده في الخفيفة**) بەڵام لە كاتی نونی سووك تەنها لەبەر یەك شتە كە ئەم واوو {ي}ە لادەبرێن، ئەوەشیان بە یەككگەیشتنی دوو ساكینە، وە ئەم بە یەككگەیشتنەشیان لەسەر غەیری یاسای خۆیە، ئەمەش گوتمان قەدەغەیە، بڕوانە وشەی {يَفعَلُونْ} ئێستا دوو ساكین كە واوو نونن بە یەككگەیشتون، بەڵێ ساكینی یەكەم حەرفی مەدە، بەڵام هی دووەم {مدغم} نییە، كەواتە دروست نییە ئەم نونە خەفیفە بەم فعلانە بلكێ وە واو و {ي}یش بمێنن، بەڵكو پێویستە لابچن و لە كاتێك دەبینین كە -ضمة-و كەسرەش لە جیاتی واو لە {يفعلون وتفعلون} وە {ي} لە {تفعلين} ماون و، پێویست بەم واو و {ي}د ناكات (**أو للأخير فيهما عند منْ**

**يشترط كون المدة والمدغم في كلمة واحدة)** گووتمان لە کاتی لکاندنی نونی -ثقیلة- واو و {ي} لەبەر دوو شت حەزف دەکرێت، کە گران و درێژی وشە بوون، بەڵام لە کاتی لکاندنی نونی سووك تەنها یەك شت بوو ئەمەشیان بە یەکگەیشتنی دوو ساکین لەسەر غەیری یاسای خۆی بوو، جا لێرەدا دەفەرمووێت: حەزفی ئەم واو و {ي}ە لە -ثقیلة-و خەفیفەی هەر لەبەر ئەم عیللەتی دواییە کە {إلتقاء الساكنين}ە لەسەر غەیری یاسای خۆی، نەك لەبەر گرانیو درێژی بێت، جا ئەم عیللەتە لە نونی خەفیفە ئاشکرایە، بەڵام لە نونی -ثقیلة- ئاشکرا نییە چونکە لەوێدا ئەوەڵ حەرفی مەددەیەو دووەم مودغەمە وە لەسەر یاسای خۆیەتی، بەڵام هەندێك لە زانایان دەڵێن: دەبێت حەرفی مەددەکە ساکینی یەکەمە لەگەڵ مودەغەمەکە کە ساکینی دووەمە لە یەك وشەدا بن، جا لەسەر بۆچوونی ئەم زانایانە لە یەك وشەدا نینە، چونکە واو وشەیەکی جیاوازە لەگەڵ نون، کەواتە لە هەردووکیان کە نونی سووك و گرانە ئەم واوو {ي}ە لادەچن تەنها لەبەر گەیشتنی دوو ساکینەکە لەسەر غەیری حەدی خۆیە، نەك لەبەر گرانیو درێژی بێت، کەواتە: حەزفی واو لە {يفعلونّ} کە نونی گرانە وە لە {يفعلونْ} کە نونی سووکە لەبەر یەك هۆیە کە گەیشتنی دوو ساکینە **(وعدم اللبس)** ئەمەیان وەڵامە بۆ پرسیاری کەسێك کە دەڵێت: ئەی بۆ ئەلفی -تثنية-ش لە {يفعلان وتفعلان} حەزف ناکەیت؟ جا لە وەڵامدا دەفەرمووێت: واوو {ي} لادەبرێن چونکە تێکەڵیو ئیلتیباسی لەگەڵ هیچ روونادات **(لدلالة الضمة والكسرة عليهما)** چونکە -ضمة-ی لام الفعل لە {يفعلون وتفعلون} وە کەسرەکەی لە {تفعلين} دەلالەت دەکەن و بەڵگەنە لەسەر ئەم واوەو {ي}ە، یانی بەهۆی ئەم بۆرو ژێرە تۆ دەزانی کە واو و {ياء} حەزف کراون، بۆ وێنە {أَتَذْهَبُون} دەبێتە {أَتَذْهَبُنَّ} لێرەدا -ضمة- بەڵگەو دەلیلە لەسەر حەزفی واو، {وهل تذهبين} کە مفرەدی -مؤنث-ە دەبێتە {هل تذهبِنَّ} لێرەدا کەسرە شاهیدە کە {ياء} حەزف کراوە **(بخلاف ألف التثنية)** ئەمە بە پێچەوانەی ئەلفی -تثنية-یە، یانی: دروست نییە ئەلفی -تثنية- لابدرێت، چونکە لەویدا إلتباسی

دەبێت ئەم -تثنیة- بە موفرەدی، بۆ نمونە {هل تذهبان} جا ئەگەر ئەم ئەلفە لابچیت نونەکەش مافی لەژێری نامێنێت پێویستە لەسەر بکرێت جا دەبێتە {هل تذهبَنَّ} کە لە راستیدا ئەم صیغەیە هی مفرەدە، وە لێرەدا هیچ جیاوازی نەما لە نێوان -تثنیة-و موفرەد، کەواتە: هیچ رێگا نەما بۆ لادانی ئەلفی -تثنیة-. جا ئێمە گووتمان واو و {یاء} حەزف دەکرێن لە کاتی تەئکید کردن، ئایا ئەم حەزفە لە هەموو کاتێك دەکرێت؟ لە وەلامدا دەفەرموویت **(إلاّ إذا انفتح ما قبلهما)** مەگەر لە کاتێك کە حەرفی پێش واو و {یاء} لەسەری هەبێت، لەم کاتەدا ناتوانین هیچیان حەزف بکەین **(لفقد الدال علیهما)** چونکە لەو کاتی هیچ شتێك نییە دەلالەت بکات و بەڵگە بێت لەسەر واو و {یاء} چونکە گووتمان -ضمة- بەڵگەیە کە واو لێرەدا هەبووە، وە کەسرە بەڵگەیە لەسەر هەبوونی {یاء} جا کە لە پێش ئەم واو و {یاء}ە فەتحە هەبوو ناتوانیت لایان بدەیت **(وذالك في الناقص)** واتە: ئەو فعلەی کە بەم شێوەیە ئەوە لە معتل اللام دا وایە کە پیتی پێش ئەم واو و {یاء}ە لەسەری هەیە **(نحو لاتَخْشَوُنَّ)** ئەصلەکەی {تَخْشَیونَ} بووە، {یاءَ} کراوە بە ئەلف و حەزف کراوە، پاشان {لا}ی نەهی خراوەتە سەری ئەم نونەی لاداوە، جا تەئکید کراوە بە نونی گران {إلتقاء} دەبێت لە نێوان واوی جەمع و نونی تەئکید کە دەغم کراوەو ناتوانین هیچیان حەزف بکەین، بە ناچاری واو وەحرەکە خسترا بە -ضمة- چونکە ئەگەر ئەم واوە لابدرێت هیچ نییە دەلالەتی لەسەر بکات، وە ئەگەر نونیش حەزف بکەیت ئەوە هیچ تەئکید کردنەوە نامێنیت **(ولا تَخْشَینَّ)** ئەمە مفرەدی -مؤنث-ی موخاتەبە، ئەصلەکەی {تخشَیْیْنَ} بووە بە دوو {یاء} جا {یاء}ی لام الفعل قەلب کرا بە ئەلف و لادرا جا لای نەهی هات و نونەکەی لادا، جا تەئکید کرا بە نونی -ثقیلة- {إلتقاء} بوو لە نێوان {ی} کە هی موفرەدی فاعیلەو-مؤنث-ە لەگەڵ نونی تەئکید، وە دروست نییە هیچیان لابدرێت، چونکە ئەگەر نونی لابدەیت ئەوە تەئکید نامێنیت، وە ئەگەر {ی} لابدەیت هیچ نییە بەڵگە بێت لەسەری، بە ناچاری {ی} حەرەکەدار دەکرێت بە کەسرە، چونکە

هەردووکیان موناسیبی یەکن لێك دێن (**وَلَتُبْلَوُنَّ**) ئەمەش وەکو میسالی یەکەم جەمعی -مذکر-ە بەڵام بینا مەفعولە، ئەصلەکەی {تُبْلَوونَ} بووە، واوی یەکەم کرا بە ئەلف و حەزف کرا بوو بە {تُبْلَوْنَ} پاشان لامی جەوابی قەسەم هێندرا لەگەڵ نونی تەئکید حەزفی نونی پێشوو کرا، جا ئیلتیقا بوو لە نێوان واو و نون وە نابێت هیچیان لابدرێن، بە ناچاری واو حەرەکەدار کرا بە -ضمة- چونکە پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە (**وإمّا تَرَيِنَّ**) ئەمەش موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەبە وەکو هی دووەم، ئەصلەکەی {تَرْئَيِينَ} بووە، حەزفی هەمزەمان کرد، پاشان {ي} قەلب کرا بە ئەلف و لادرا بوو بە {تَرَيْنَ} پاشان {إما}ی شەرتیەمان خستە سەری بوو بە {إما تَرَيْ} ئەوجارە تەئکید کرا بە نونی تەئکید وە {ياء} کە بۆ موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەبەیە بە ناچاری مەکسور کرا بوو بە {إما تَرَيِنَّ} لەسەر وەزنی {تَفَيِنَّ} واتە: بەس {فاء الفعل} ماوە، بەڵام لەوانی پێشوو تەنها لام الفعل لادەچوو، جا ئەگەر بتەوێت ئیعلالی ئەوانە بە درێژی بزانیت بڕوانە شەرحە تەصریفی مامۆستای مودەریس بکە -خوا تەمەنی درێژبکا- (**ويفتح آخر الفعل إذا كان فعل الواحد والواحدة الغائبة**) ئەمانەش چەند حوکمێکن کە باسیان دەکات بۆ ئەو فعلەی کە نونی تەئکیدی پێوە لکاوە، دەفەرمووێت: ئاخیری فعل لەسەری بۆ دەکرێت لە کاتێك کە ئەو فعلە بۆ موفرەدی -مذکر- بێت غائیب یان موخاتەب، وە یان موفرەدی -مؤنث-ی غائیبە بێت، وە هەروەها {متكلم وحده ومتكلم مع الغير} (**لخفته**) بۆیە لەم کاتە لەسەر دەکرێت چونکە فەتحە سووکە (**ويضم إذا كان فعل جماعة الذكور**) واتە: ئاخیری فعلی -مضموم- دەکرێت لە کاتێك کە جەمعی -مذکر- بێت جا غائیب بێت یان موخاتەب (**ويكسر إذا كان فعل الواحدة المخاطبة**) ئاخیرەکەی لەژێر دەکرێت لە کاتێك موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەبە بێت (**أی يبقى على الضم والكسر**) واتە: بۆ جەمعی -مذکر-ان ئەگەر خۆی -مضموم- بێت ئەوە واوی لێ دەهێندرێت، وە ئەگەر -مضموم- نەبوو -مضموم- دەکرێت، وە بۆ موفرەدی -مؤنث-یش بە هەمان شێوە ئەگەر مەکسور بێت باشە، ئەگینا مەکسوری

بکە (**فتقول بالثقیلة**) تۆ دەڵێیت لە ئەمری غائیب لە کاتی تەئکیدکردنی بە نونی گران (**لِینصُرَنَّ**) ئەمە بۆ موفرەدی -مذکر-ی غائیبە ئەصلەکەی {لِینصُرْ} بوو تەئکیدمان کرد بە نونی گران بوو بە {لینصرنَّ} ئاخرەکەمان لە سەرکرد (**لِینْصُرانِّ**) {لینصرا} بوو تەئکید کرا بەنونی -ثقیلة-، وەنونەکەشی لە ژێرکرا، چونکە لەدوای ئەلفی -تثنیة- هاتووە (**لِینْصُرُنَّ**) {لینصروا} بوو جەمعی -مذکر-ی غائیبە تەئکیدمان کرد جا واوی جەمعی لاچوو لەبەر {التقاء الساکنین} یان لەبەر گران ودرێژی وە ئاخیرەکەش -مضموم- کرا وە-ضمة- ش دەلیلە لەسەر واوی لادراو (**لِتنصُرَنَّ**) موفرەدی -مؤنث-ی غائیبە تەئکید کراوە وەئاخردکەشی مەفتوحە (**لِتنْصُرانِّ**) -تثنیة-ی مؤنث غائیبە (**لِیَنْصُرْنانَّ**) جەمعی -مؤنث-ی غائیبە ئەصلەکەی {لِینصُرْنَ}بوو تەئکیدمان کرد بوو بە {لِینْصُرْنَنَّ} سێ نون کۆبوونەوە جا ئەلفێکمان لەدوای ئەلفی جەمع دانا بۆ{فصل} لەنێوانیان پاشان ئەم نونە مەکسورکرا (**لأنْصُرَنّ**) متکلم وحدە (**لننْصُرَنّ**) ئەمەش متکلم مع الغیر لەم دووەش ئاخری فعل مەفتوحە (**وبالخفیفة**) واتە تۆ دەڵێیت لەکاتی تەئکید بەنونی سووك (**لِینْصُرَنْ**) بۆموفرەدی -مذکر-ی غائیبە ئاخیرەکەی مەفتوحە (**لِینْصُرُنْ**) جەمعی -مذکر-ی غائیب ئاخیرەکەی دەبەرە، واو حەزف کراوە -ضمة- لەشوێنی ماوە، وەمیسالی -تثنیة-ش نیە چونکە گووتمان نونی سووك بۆ -تثنیة-و جەمعی -مؤنث- نابێت (**لِتنصُرَنْ**) موفرەدی -مؤنث-ی غائیبە بەنونی سووك وە -تثنیة-و جەمعیش نابێت (**لأنصُرَنْ**) بۆ خۆم بەتەنها (**لننصُرَنْ**) خۆم و غەیری خۆم لەگەڵ بێت ئەمەی باسکرا ئەمری بەلامی بوو کە بۆموخاتەب نابێت. جاباسی ئەمری بەصیغە بکەین کەهەر بۆ موخاتەبە (**انْصُرَنَّ**) موفرەدی -مذکر-ی موخاتەب ئاخیرەکەی مەفتوحە (**انصرانِّ**) -تثنیة- یانە نونەکەی مەکسورە (**انصُرُنّ**) جەمعیانە واو لاچووەو -ضمة- لەشوێنی ماوە (**انصرِنَّ**) موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەبە {ی} لاچووە ولەژێر لەشوێنی ماوە (**انصرانِّ**) -تثنیة- یە {انصرنانِّ} جەمعیانە لێرە سێ نون کۆبوونەتەوە ئەلفێك لەنێوانیانە وەئەمانە

میسالی نونی گران بوون (**وبالخفيفة انصُرَن انصُرُن**) تەئكید بەنونی خەفیفە (**انصرَنْ**) موفرەدی -مذکر- (**انصرُن**) جەمع بۆ -مذکر-ی موخاتەب، واو نەماوە (**انْصُرِنْ**) بۆ موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەبە {ی} حەزف کراوە، وە ئاخیرەکەشی لەژێرە، وە -تثنية-ی هەردووکیان و جەمعی -مؤنث- لە نونی خەفیفە نابێت (**وقِس عليه البواقي**) جا تۆش هەر هەموو بابەکانی دیکە -ثلاثي- رباعی مزید مجرد قیاس بکە بۆ سەر ئەو بابەی کە باسکرا.

## باسی ئیسم فاعل و ئیسم مەفعول

لە کاتێك کۆتایی بە باسی وەرگێڕانی مەصدەر بۆ -ماضی و مضارع- وە ئەمرو نەهیو باقی صیغەکانی دیکە هات، جا هات دەستی کرد بە باسی ئیسمی فاعیل و ئیسمی مەفعول کە ئەوانیش بە هۆی فعلی -مضارع- لە مەصدەری مجرد وەردەگیرێن، جا دەفەرمووێت (**وأما إسم الفاعل والمفعول من الثلاثي المجرد**) ئەمە عەتفە بۆسەر {وأما الأمر بالصيغة} واتە: ئەگەر بتەوێت ئیسمی فاعیل و ئیسمی مەفعول دروست بکەیت لە -ثلاثی- مجرد- (**فالأكثر أن يجئ إسم الفاعل منه على فاعل**) زۆرتر وایە کە ئیسمی فاعیل لە -ثلاثی مجرد- صیغەکەی لەسەر وەزنی فاعیل دەبێت، کە ئەمەش لە فعلی بینا فاعیلی -مضارع- وەردەگیرێت، بەڵام ئیسمی فاعیل لە غەیری -ثلاثی مجرد- ئەوا لە پاشان باسی لێوە دەکات -إن شآء الله- (**بزيادة الألف بعد الفاء**) واتە: لە کاتێك کە حەرفی -مضارع- لادرا ئەلفێك لە پاش {فاء الفعل}ەکەی زیاد دەکرێت، بۆ نمونە {يَنصر} پیتی {ياء} لادەچێت و وە ئەلفێك لە دوای نونەکە زیاد دەکرێت و، وە نونەکە مەفتوح دەکرێت (**إذ في الأول يلتبس بالمتكلم**) چونکە ئەگەر ئەم ئەلفە لە ئەوەڵی وشە زیاد بکرێت ئەوە ئیلتیباسی دەبێت و تێکەڵ دەبێت لەگەڵ موتەکەلیمی وەحدە، یانی جیاوازی نابێت لە نێوان ئیسمی فاعیل و متکلمی وەحدە ئەگەر ئەم حەرەکەی ئەلف واتە: هەمزە لەسەری هەبێت وەکو {أَنْصُرُ} وە ئەگەر بۆری هەبێت

ئەوە ئیلتیباسی دەبێت بە -مضارع-ی متکلم یان -ماضی- مەجهول لە بابی إفعال، وەکو {أُنْصَرُ} لە بابی إفعال، بەڵام ئەم هەموو ئیلتیباسە تەنها لە کاتی وەستان دەبێت، ئەگینا ئاخیری فعلی -ماضی ومضارع- جیاوازن چونکە حەرەکەی ئەوان واتە: -ماضی ومضارع- تەنوین نییە، وە ئەوەش دەزانیت کە نابێت ئەم ئەلفە لە سەرەتاکەی زیاد بکرێت چونکە ساکینەو دەستکردن بە ساکینیش نابێت، وە ئەگەر کەسرەی بدەیتێ {إِضْرِبْ} ئیلتیباس دەبێت بە ئەمری بە صیغە، جا بە ناچاری ئەم ئەلفە زیاد کرا لە نێوان {فاء الفعل} و عین الفعل دەبێتە {ناصِرٌ} **(وفي الآخر بالتثنية)** یەکێك پرسیار دەکات و دەڵێت: ئەو ئەلفە لە کۆتایی زیاد بکە، جا دەڵێت: ئەگەر ئەم ئەلفە لە ئاخیری زیاد بکرێ ئیلتیباسی دەبێت ئەم ئیسمە فاعیلە بە -تثنیة-ی فعلی -ماضی- مەعلوم ئەگەر ئەوەلی مەفتوح بێت وەکو {نَصرا} وە ئەگەر ئەوەلەکەی -مضموم- بێت ئەوە ئیلتیباسی دەبێت بە فعلی بینا مەجهول **(وكسر العين وإن التبس بأمر المفاعلة)** لە ئیسمی فاعیل عین الفعل مەکسورکرا، جا ئەوەی مەکسورە وەکو خۆی مایەوە وەکو {ضارِب} وە ئەوەی مەکسور نەبێت مەکسورکرا وەکو {ناصِر} جا ئەم عەینە مەکسورکرا هەرچەندە ئیلتیباسی ببێت بە فعلی ئەمری بابی {مفاعلة} لە کاتی وەستان وەکو {ناصِرْ} و {قاتِلْ} کە تۆ نازانی کە ئەم وشەیە ئیسمی فاعیلە یان فعلی ئەمرە لە بابی {مفاعلة} لە کاتی وەقف و وەستان، بەڵام کە مەکسورکرا بە ناچارییە **(لأنه لو فتح لألتبس بماضيها)** چونکە ئەگەر ئەم عەینە مەفتوح کرابایە ئیلتیباسیو تێکەڵاوی لەگەڵ -ماضی-یەکەی دەبوو لە بابی {مفاعلة} **(وهو أصلٌ ومقدم على الأمر)** وە حال وایە -ماضی- ئەصلە بۆ فعلی ئەمر وە پێشتریشە لەسەر ئەمر لە رووی {لفظ} و ماناوە لە رووی لەفزەوە چونکە ئەمر لە فعلی -مضارع- وەرگیراوە، وە فعلی -مضارع-یش لە فعلی -ماضی- وەرگیراوە، کەواتە: -ماضی-یەکە پێشتر بوو، لە رووی ماناش بە هەمان شێوە، چونکە -ماضی- واتە: فعلێك کە رابراوە، بەڵام ئەمر وانییە، وە مەراح دەڵێت: بۆیە ئیلتیباس بە فعلی ئەمر باشترە.

چونکە ئیسمی فاعیل و ئەمر لەیەك نزیکن کە هەر دووکیان لە فعلی -مضارع- وەرگیراون. یەکێك دەڵێت: وەرە ئەو عین الفعلە -مضموم- بکە؟ جا ماموٚستا لە وەڵامدا دەفەرمووێت: (**ولو ضم لثقل**) واتە: ئەگەر ئەم عین الفعلە -مضموم- بکرابایە ئەوە گران دەبوو جا بەهەر حاڵ ئیلتیباسەکە بێ چاکترە لەوە کەئەم ئیسمە فاعلە لەسەر زمانی گران و ناخۆش بێت، جابا میسالەکان بهێنین (**تقول ناصِرٌ**) واتە تۆ دەڵێیت لەدروست کردنی ئیسمی فاعیل لە -ثلاثی مجرد- {ناصِرٌ} ئەمە بۆ موفرەدی -مذکر-ە جا غائیب و موخاتەب و متکلم، واتە: بۆ هەمووان دەبێت، دەڵێیت: {أنا ناصر، هو ناصر، أنت ناصر} ئەصلەکەی {ینصر} بوو، واتە: فعلی -مضارع-ی مەعلوم بوو، حەرفی -مضارع-ەکەمان لادا، وە ئەلفێك لە نێوان نون و صاد داندرا، وە عین الفعل مەکسور کرا بوو بە {ناصِرٌ} (**ناصران**) ئەمەش بۆ -تثنیة-ی -مذکر- لە حالەتی رەفعە، وە ئەلف ونون زیاد کراون (**ناصِرَیْنِ**) {یاء} و نون زیاد کراون لە حالەتی نەصبەو جەرە (**ناصِرونَ**) جەمعی -مذکر- لە حالەتی رەفعەی (**ناصِرِینَ**) ئەمەش لە حالەتی نەصبەو جەرە ئەمانە جەمعی سالمن (**والجمع المكسر للمذكر**) واتە: جەمعی موکەسەر بۆ نێرینەکان ئەم هەشت وەزنەی هەیە، یەکەم: (**نُصَّارٌ**) بە -ضمة-ی {فاء الفعل}و فەتحەی عین الفعل بە شەددەوە، وە لەگەڵ ئەلفێکی زیاد لە نێوان عین الفعل و لام الفعل. دووەم: (**نُصَّرٌ**) بە هەمان شێوەی پێشوو بەڵام بە بێ ئەلفە. سێیەم: (**نَصَرَةٌ**) بە -ضمة-ی {فاء الفعل} و سکونی عین الفعل، وەکو تەمیمیەکان دەڵێن، وە ئەگەر بە -ضمة-ی هەردووکیان بێت، وەکو {نُصُرٌ} ئەوە لەسەر بۆچوونی غەیری تەمیمیەکانە. چوارەم: (**نُصْرَان**) بە بۆری نون و سکونی عەین و ئەلف و نونەکی زیاد. پێنجەم: (**نِصَار**) بە کەسرەی نون و فەتحەی صاد، بە سووکیو لەگەڵ ئەلف. شەشەم: (**نُصُور**) بە -ضمة-ی هەردووکیان لەگەڵ واوی زیاد. حەوتەم: (**نُصَرَاء**) بە -ضمة-ی نون و فەتحەی صاد و وە ئەلف و هەمزەی زیاد لە دووا. هەشتەم: (**نُصْرٌ**) سێ فەتحە لە دوای یەك. ئەم هەشت وەزنە لە ئەصلدا {ناصِرٌ} بوونە، بەڵام بە زیاد کردن و

کەمکردنی حەرف و حەرەکە گۆڕاوە. لێرەوە دێتە سەر باسی ئیسمی فاعیل بۆ -مؤنث-ان، (**ناصِرَة**) بۆ موفرەدی -مؤنث-ە غائیب و موخاتەب و موتەکەلیم، ئەصلەکەی {ناصِر} بوو، {ت}ی -تأنیث- زیادکرا بوو بە {ناصرة} (**ناصِرَتانِ**) ئەمەش بۆ -تثنیة- لە حالەتی رەفعە (**ناصِرَتَيْنِ**) ئەمەش بۆ حالەتەکانی نەصبەو جەڕیە (**ناصِرات في السالم**) واتە: {ناصرات} جەمعی -مؤنث-ی سالمە، ئەصلەکەی {ناصِرة} بوو، نیشانەی جەمع بۆ -مؤنث-ان ئەلف وتێیە زیادکران بوو بە {ناصِرَتات} جا دوو نیشانەی -تأنیث- بەیەکەوە کۆبوونەوە، یەکەمیان حەزف کرد، چونکە تەنها بۆ -تأنیث-ە، ئەویتر بۆ جەمع و -تأنیث-ە، بوو بە {ناصِرات}.
یەکێك پرسیار دەکات و دەڵێت: ئەم جەمعە بوو بە موکەسەر، چونکە دەستکاری کرا حەزفکردنی حەرفێك کە تێیە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**إذ حذف تاء المفردة ليس لبناء الجمع**) واتە: حەزفکردنی {ت}ی موفرەدەکەی کە {ناصرة} بوو، لەبەر ئەوە نەبووە کە بیکەین بە جەمع، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە دوو نیشانەی -تأنیث- پێکەوە کۆببونەوە، کەوایە ئەمە بە جەمعی سالم دادەندرێت نەك بە مکسر (**وفي المكسر نَواصِرُ**) واتە: جەمعی تەکسیر لە {ناصرة} بۆ -مؤنث-ەکان {نواصر} دەبێت، ئەمە جەمعی {ناصرة}ە، ئەلفێك زیادکرا لەدوای ئەم ئەلفە، جا ئەلفی یەکەم کرا بە واو پاشان حەزفی {ت} کرا بوو بە {نَواصِرُ}.

**بێداری :**

بزانە جەمع چەند جۆرێکە، یەکەم: جەمعی سەلامە بۆ نێرینە، کە نیشانەی واو نونە لە کاتی رەفعە، وە {یاء}و نونە لە کاتی نەصبەو جەڕە، وەکو {مُسْلِمُونَ، مُسْلِمِيْنَ، وطالِبُونَ، طالِبِيْنَ، وزيدون، زيدين}. دووەمی: جەمعی سەلامە بۆ مێینە، ئەمیش هەموو کاتەك ئەلفێك لەگەڵ {ت}ی بۆ زیاد دەکرێت، وەکو {مسلِمات، طالِبات، معلِمات..}. سێیەم: جەمعی قیللە، کە بە ژمارەی سێ دەڵێن تاکو دەگاتە نۆ ئەگەر هیچ قەرینە نەبێت، ئەمەشیان چوار وەزنی هەیە: {أَفْعُل، أَفْعَال، أَفْعِلَة، فِعْلَة}. چوارەم: جەمعی تەکسیر، کە بەو جەمعە دەڵێن: موفرەدەکەی تێك درابێت و

دەستکاری وەزنەکەی کرا بێت، وەکو {رجال، زیود...} بە پێچەوانەی جەمعی سەلامە، کە ئەمیان دەستکاری موفرەدەکەی نەکرابوو. وە جۆرە جەمعێك هەیە کە پێی دەڵێن: صیغەی مونتەهای جەمعان، واتە: گەیشتۆتە ئاستێك کە دروست نییە جارێکی دیکە بە تەکسیر جەمع بکرێتەوە، چونکە هەندێکیان دوو کەڕەت جەمع کراونەتەوە، وە کۆتایی بە جەمعکردنی بە تەکسیر هاتووە وەکو {أكاليب و أناعيم} بەڵام بەجەمع سەلامەت دەتوانی جارێکی دیکە جەمع بکرێت وەکو{أكاليبات و وأناعيمات...هتد} جاباسی ئیسمی مەفعول دەکات و دەفەرمووێت (**واسم المفعول منه على مفعول**) واتە زۆرتر ئیسمی مەفعول لە-ثلاثي- مجرد لەسەر وەزنی مەفعول دەبێت (**مثل منصور**) ئەمە ئیسمی مەفعولە لە-ثلاثي- مجرد لەفعلی -مضارع-ی بینا مەفعول وەکو{يُنْصَرُ} وەرگیراوە، چونکە ئەصلەکەی {يُنْصَرُ}بوو هەریەکەلەبینا مەفعولەکانی -مضارع- بهێنە غائیب بێت یان غائیب نەبێت جا حەرفی -مضارع-ی لادە وەمیمێکی بۆ دانێ بە مەفتوحی پاشان واوێك زیادبکە لەنێوان {عين الفعل و لام الفعل} ئەم واوەش حەرفی پێش خۆی بۆر دەکات و، دەبێتە {منصور} دەشتوانی بڵێیت بووبە {مَنْصُر} جائەم وەزنە لەزاراوەی عەرەب دانییە مەگەر بەشاز، جاصادمان زیاتر لەحەدی خۆی حەرەکە دار کرد واوێکی لێ پەیدا بوو، جابۆزیاتر زانیاری لەم ئیعلانە تەماشای شەرحی مامۆستای ڕێزدار بکە، جەنابی مامۆستای مودەریس خودا دەست بەتەمەنی بگرێت (**منصوران، منصورَيْنِ**) -تثنية- لە هەرسێ حالەت (**منصورون، منصورين**) جەمعی سەلامە لە هەر سێ حالەت (**واستغنى فيه بالتصحيح عن التكسير**) واتە: بە هۆی جەمعی سەلامە کە جەمعی صەحیحە لە ئیسمی مەفعول پێویستیمان بە جەمعی تەکسیر نەماوە، بەڵگەش بۆ نەهێنانی ئەو تەکسیرە لەوەدا ئەوەیە: چونکە ئیسمی مەفعول پەیوەندی بە فعلەوە هەیە لە لەفزو مانادا، وە جەمعی تەکسیریش تایبەتە بە ئیسم بۆیە نەهاتووە، بەڵام ئەم دەلیلە بۆ ئەوانی دیکەش هەر وایە (**مَنْصُورة، مَنْصُورتان، مَنْصُورَتَيْنِ، مَنْصُورات**) ئەمانەش بۆ -مؤنث-ن،

هەر سێك جۆر بە هەرسێك حالەت (**وفي التكسير مَناصِر**) جەمعی تەكسیر بۆ مێینەكان لەسەر وەزنی {مناصِر} دێت، ئەصلەكەی {منصورة} بووە، ئەلفی تەكسیر زیاد كراوە، وە عين الفعل مەكسور كرا، جا واو و{ت} لادران، بوو {مناصِر}. یەكێك رەخنە دەگرێت دەڵێت: بۆ ئەم جەمعە تەكسیرە بۆ نێرینەكان نەبوو، تەنها بۆ ئافرەتان هەیە؟ لە وەڵامدا دەڵێت: تاكو جیاوازی لە نێوان -مذكر ومؤنث- بكرێت، بڕوانە كتێبی {القطف النظيف}. یەكێك دەڵێت: بۆ مصنف فەرمووی: {فالأكثر}؟ جا لە وەڵامدا دەفەرموێت (**قال فالأكثر**) واتە: مامۆستای بەڕێز لەسەرەتای ئەم باسە فەرمووی {فالأكثر} واتە: بە زۆرتر ئەم دووانە لەسەر ئەم وەزنە دەبن (**لمجيئهما على غير الوزنين**) لەبەر ئەوە فەرمووی زۆرتر لەسەر ئەو وەزنە دێن، چونكە جاری وا دەبێت ئیسمی فاعیل و ئیسمی مەفعول لەسەر غەیری ئەم دوو وەزنەش دەبن بەڵام كەمتر (**كضَرَّابٍ**) {ضَرَّاب} بە فەتحەی {ضاد}و {ر}ی بە شەددە لەگەڵ ئەلفی زیاد (**وضَرُوب**) بە فەتحەی {ضاد}و -ضمة-ی {ر} لەگەڵ واوێكی زیاد بە سووكی (**مِضْرَاب**) میم كەسرەی هەیە، زەنەی {ضاد}و ئەلفی زیاد، هەرسێك ئەم وەزنانە بۆ موبالەغەی {ضرب} هاتوون (**وحليم**) بۆ موبالەغەی {حِلْم} هاتووە، واتە: لەسەرخۆیی (**وحَذِر**) بۆ موبالەغەی {حَذَر} هاتووە، واتە: ترس و بە ئاگایی (**في اسم الفاعل**) ئەم وەزنانە هەر پێنجیان بۆ موبالەغەی ئیسمی فاعیل هاتوون، وە هیچیان لەسەر وەزنی فاعل نینە (**وقَتيل، وحَلوب في اسم المفعول**) ئەم دوو وەزنەش بۆ ئیسمی مەفعول هاتوون، {قتيل} بە مانا مەقتولە، وە حەلوب بە مانا مەحلوبە، وە ئەم دووە بۆ موبالەغەی ئیسمی مەفعولن كەچی لەسەر وەزنی مەفعولیش نینە، جا بەڕێزیان بۆ زیاتر زانیاری عیبارەتی {المراح الأرواح} نەقل دەكات بە تەواوی ئەگەرچی هەندێك دووبارە دەبنەوە، دەفەرموێت (**قال في المراح ويجئ للمبالغة**) واتە: مامۆستا ئەحمەد كە دانەرە كتێبی {المراح الأرواح}ە لە كتێبی ناوبراو دەفەرموێت: ئیسمی فاعیل دێت بۆ موبالەغە لەسەر چەند وەزنێك كە زیاتر لەم پێنجانەی گوتمان (**نحو صَبَّارٍ**)

ئەمە وەکو {ضَرّاب}وایە، کەواتە دووبارەیە، واتە: زۆر ئارامگر کە زیاتر لە {صابر} (**وسيف مِجْذمٍ**) لەسەر وەزنی {مِفْعَل}ە بە کەسرەی میم و، زەنەی جیم، وە فەتحەی {ذال}، واتە: زۆر تیژو بڕندەیە، وە هاتووە {مِجْزَم} بە زای (**وفِسِّيقٍ**) بە کەسرەی {ف} لەگەڵ کەسرەی سین بە شەددەی، واتە: زۆر فاسق بوو وە لە ئەمر دەرچوو (**وكُبَّارٍ,وطُوَّالٍ**) هەردووکیان بە -ضمة-ی {فاء الفعل}و ئەلفی زیاد، بەڵام یەکێك لەم دووانە موشەددەدە، ئەم دووانە بە شەددەوبەبێ شەددەش دروستن بەڵام بە شەددە مەبالەغەی زیاترە، گەرچی لە پێشان ئەمەیان صیغەی جەمعی تەکسیر بوو وەکو {نُصَّار} ئەمەش بۆ موبالەغەی {كبير وطويل} هاتوون (**وعَلاَّمَةٍ ونَسَّابَةٍ**) {علامة} واتە زۆر زانا، {نسابة} واتە زۆر شارەزا بە نەژادو نەسەب، ئەم دووانە یەك وەزنن، بەڵام بۆیە دووی هێنانەوە چونکە ئەم جۆرە وەزنە گەلێك زۆر بەکار دێت (**ورِوَايَةٍ**) لەسەر وەزنی {فاعلة}یە بە کەسرەی عين الفعل واتە: زۆر ریوایەتان دەکات (**وفَرُوقَةٍ**) بەفەتحەی {ف} وە-ضمة-ی {ر} لەگەڵ واوی زیاد ئەگەر - ماضي-یەکەی لەسەروەزنی {فَرِق}ە بێت بەکەسرەی {ر} بەمانا زۆر ترسانە ئەگەر بەفەتحەی {فرَق} بێت واتە: زۆر جیاوازی کەر (**وضُحَكَةٍ**) {ضاد} بۆرو {ح} سەر یانی زۆر پێ دەکەنی (**وضُحْكَةٍ**) واتە: خەڵك بەوی پێ دەکەنی هەر لەبەر ئەمە گووتراوە نابێت ئەمە لێرە باس بکرێت، چونکە لەم کاتە {ضُحْكَةٍ} بەمانا ئیسمی مەفعولە(**ومِسْقَام**) واتە: نەخۆشی زۆرە (**ومِجْذامة**) واتە: زۆر بڕندە، وەئەگەر ئیسمی ئالەتیش بێت، واتە: ئامێری بڕین، وەئەگەر {ض}ودال بێت دیارە (**ومِعْطِيرٍ**) ئەمە هەرسێك بە کەسرەی {م} بخوێنەوە {مِعْطِر} واتە: زۆر بۆن خۆش (**ويستوي في التسعة الأخيرة المذكر والمؤنث لقلتهن**) واتە: یەك سانە لەنۆیەکانی دوایی نێرومێ چونکە کەم بەکاردێن، گوتراوە: مەبەست لەنۆیەکانی دوایی میسالەکانن، وەزنەکان نینە ئەگینا دەیگووت {الثمانية الأخيرة}. کەواتە بۆ ئافرەت وپیاو دەڵێت:{رجل علامة، أمرأة علامة}و{رجل مسقام، وأمرأة مسقام} بەڵام بابزانین ئەم نۆیە لەکوێ دەست پێ دەکات {قطف النظيف} دەڵێت لە{طُوّال}ی تاکو

{معطِر} کەواتە{ضُحْکة}لەگەڵ دانییە، چونکە ئەویان بۆئیسمی مەفعولە. وە{مراح الأرواح}دەڵێت لە {علامة}ی تاکو{مِعْطِر} واتە ئەمەش لەگەڵ دایە، وەبابزانین کەمەبەست میسالەکانن ئەگینا میزانەکان هەشتن، چونکە{علامة نسابة} یەك وەزنن. جا لێرەدا رەخنە گرێك دەڵێت: دەبینم مسکین وەکو {مِعْطِير} وایە جابەگوێرەی ئەم یاسایە بۆ ژن و پیاو وەك یەك بەکار دێت، لەگەڵ ئەمەشدا وانییە، چونکە بۆ پیاو دەگووترێت {مسکین} وە بۆ ژن دەگووترێت {مسکینة} بە تائی - تأنیث-؟ لە وەڵامدا دەفەرمووێت **(ومسكينة محمولة على فقيرة)** واتە: وشەی{مسکینة} حەمل کراوە بەسەر وشەی {فقیرة} بەڵێ گووتمان لە{معطیر}ی - مذکرومؤنث- یەك سانن جا{مسکین} وەك ئەوی وایە دەبوا بۆ ژن و بۆپیاو{مسکین} بگوترێت، وەئێستاش بۆژنان دەڵێین {مسکینة} بە {ت}. جا فەرمووی: ئەمە حەمل کراوە لەسەر وشەی{فقیرة} کە ئەویان وەکو{معطیر} نییە لە نۆیەکان نییە، وەهیچ ژن و پیاو لەوی یەکسان نین، بەڵام کە لەمانا دا وەکو یەك وان، لە بەکارهێنانیش با وەك یەك بن، چۆن لە{فقیر}ی جیاوازی هەیە لەنێوان نێرینەو مێینە لە{مسکین}یش با هەبێت. هەرچەندە لەم نۆیانەش بێت کەجیاوازی نێرینەو مێینە نەبوو لەوان دا **(إنتهى)** فەرموودەی {مراح الأرواح} لێرە دا کۆتایی هات. جا لێرەدا شتێکی دیکە باس دەکات، لەپێشان گووتومانە فعلی لازم بینا مەفعولی لێ دروست نابێت مەگەر بیکەی بە متعدی جاشتێکی روونە کە ئیسمی مەفعولیش هەموو کاتێك هەر لەفعلی بینا مەفعول دروست دەکرێت، جائەگەر ئەم فعلە لازم بێت چۆن دەیکەی بەئیسمی مەفعول، جا دەفەرمووێت: بۆ چارەسەری ئەم مەسئەلەیە **(وتقول ممرور به)** واتە: دەڵێیت: لەکاتی کەئیسمی مەفعول دروست بکەی لەفعلی لازم بۆ موفرەدی-مذکر-{ممرور بە} **(ممرور بها)** ئەمەش بۆ موفرەدی-مؤنث- **(ممرور بهما)** بۆ-تثنية-ی ئافرەت و پیاو، واتە: بۆنێرو بۆمێ **(ممرور بهم)** بۆ جەمعی -مذکر- **(ممرور بهن)** بۆ جەمعی -مؤنث- **(يعني إنما يبني من اللازم ألا بعد التعدية)** واتە: مەبەستی وایە بەم هەموو -ضمیر-

ئە بزانە ئیسمی مەفعول دروست ناکرێت لە فعلی لازم مەگەر لە دوای کردنی ئەم فعلە لازمە بە موتەعەدی، چونکە فعلی -مضارع- کە کرا بە مەجهول هیچ نییە ببێتە جێگری فاعیل، جا بە ناچاری بیکە بە موتەعەدی، وەك دەبینی کراوە بە موتەعەدی بە هۆی حەرفی جەڕ لەو هەموو میسالانە (**فتثنى وتجمع وتذكر وتؤنث الضمير**) واتە: تۆ دەستکاری صیغەکان ناکەی، وە تۆ کە دەیکەی بە -تثنية- و بە جەمع، هەروەها بە -مذکر- و-مؤنث- ئەو -ضمیر-ەی هەرواش دەمینێ، وە ئیسمە مەفعولە لازمەکەش پاڵ ئەدەی بۆ ئەم -ضمیر-ە (**فيما يتعدى بالحرف**) واتە: بەم شێوە هەڵسوکەوت دەکەیت هەر ئیسمە مەفعولێك کە تەعەدای بە حەرفە جەڕ کردووە، وە دەکات بەڵام لەوەی کە تەعەدا دەکات بە هۆیەکانی دیکە ئەویان وەها نییە (**لا إسم مفعول**) بەڵام دەستکاری ئیسمی مەفعول ناکرێت بەم جۆرەی کە تەعەدای بە حەرفی جەڕە، واتە: صیغەکە ناکرێتە -تثنية-و جەمع.... واتە: ناگووترێ {ممروران، ممرورن...} بەڵام لەوەی کە بە خۆی موتەعەدی بوو، یان بە هۆی نەقلکردن وە لای بابەکان بوو لەوان دەستکاری خودی صیغەکە دەکرێت، وەکو {منصور، منصوران ...}.

جا مصنف فەرمووی ئیسمی فاعیل هەندێك جار لەسەر وەزنی -فعیل- دەبێت وەکو {حليم} وە هەندێك جاریش لەسەر وەزنی -فعول- دەبێت وەکو {ضَروب}، وە ئیسمی مەفعولیش بە هەمان شێوە ئەم دوو وەزنەی هەیە، وەکو {قتيل و حَلوب} کە بە مانای {مقتول ومحلوب}ن، وە ئەم چوارەش هەندێك حوکمی تایبەتیان هەیە جا دەیەوێت دووبارە بە درێژی باس لەم چوارانە بکات، فەرمووی (**وفَعيل وفَعول قد يجيئان بمعنى الفاعل**) واتە: فەعیل و فەعول کە لە پێشەوە باسکران وا دەبێت بە مانا ئیسمی فاعیل بێن (**كالرحيم بمعنى الراحم**) ئێستا وشەی رەحیم کە فەعیلە بە مانا راحم د کە ئیسمی فاعیلە وە هەر دووکیان لە {يَرْحَمُ} وەرگیراون کە فعلی -مضارع-ی بینا مەعلومە (**والصبور بمعنى الصابر**) ئێستا {صبور} لەسەر وەزنی فەعولە وە بە مانا صابرە کە ئیسمی فاعیلە، وە هەردووکیان

لە {يَصْبِرُ} شەق کراون (**وبمعنى المفعول**) واتە: فەعیل و فەعول بە مانا ئیسمی مەفعولیش دەبن (**كالقتيل بمعنى المقتول والحلوب بمعنى المحلوب**) ئێستا قتیل لەسەر وەزنی فعیل یە وە بە مانای مەقتولە کە ئیسمی مەفعولە، وە حلوب لەسەر وەزنی فعول وە بە مانا مەحلوبە کە ئیسمی مەفعولە، جا براکانم گووتمان {رحیم} لە {يَرْحَمُ} وە {صبور} لە {یصبر} وەرگیراوە، نەقلی حەرەکەی حەرفە - مضارع-ەکەی بکە بۆ پاش خۆی پاشان عین الفعلەکەی هەردووکیان درێژ بکە بەکسەر {یاء} لەویان پەیدا دەبێت، وە لەوەی دیکە واو پەیدا دەبێت، دەبێتە {رحیم، وصبور} جا ئەوانی دیکەش لە بینا مەجهولەکەیان دروست بکە بە هەمان شێوەیە.

جا براکانم لەوە بۆمان بە دیار کەوت کە دوو فعیل وە دوو فعول پەیدا بوون، جا ئەگەر فعیل بە مانا فاعل بێت ئەوە ئەصلە، چونکە زووتر دەبێتە فاعل، بەڵام ئەگەر بە مانا مەفعول بێت ئەوە فەرعەو ئەصل نییە، چونکە زۆر ئیعلالی دەوێت تا دەبێتە مەفعول، بەڵام فعول بە پێچەوانەوە، واتە: ئەگەر بە مانا مەفعول بێت ئەصلە چونکە بە زیادکردنی تەنها یەك مەفعول دەبێتە مەفعول. ئەم باسەت لە بیر نەچێت چونکە وایی کارو ئیشت پێی دەبێت، جا مصنف دەیەوێت جیاوازی لە نێوان هەردووکیان بە ئەصل و فەرع بکات و باسیان لێوە بکات (**ويستوى في الفعول الأول الفعيل الثاني المذكر والمؤنث**) واتە: یەکسانەیە لە فعولی یەکەم کە بە مانا فاعیلە کە دەکاتە صبور، وە لە فعیلی دووەمیش کە دەکاتە بە مانا مەفعول وەك رحیم، کە هەردووکیان ئەصل نەبوون، واتە: لەم دووانە نێرو مێ موساوینەووەکو یەك هەردووکیان بەکار دێت، وەکو دەگووترێت {رجل قتيل وامرءة قتيل} بەڵام وەش بزانە کە ئەم یەکسانییە واجب نییە دەتوانی وەکو یەکیان لێ نەکەی، کە بۆ مێینە بلێی {امرأة قتيلة} وە بۆ نێرینە بلێی {رجل قتيل} (**إذا ذكر موصوف**) واتە: لە کاتێکدا -مذکر ومؤنث- لەم دوو صیغەیەدا وەك یەك دەبن کە مەوصوفەکەیان گووترابێت وەکو {رجل قتيل وامراة قتيل}، بەڵام کە

مەوصوفەکە نەگووترا ئەوە دەبێت بۆ -مؤنث-ان تائی پێوە بندرێت و وەکو یەك نابن وەکو {جاء قتيل زيد} ئەوە بۆ پیاوان، بۆ ئافرەتانیش وەکو {جائت قتيلة زيد}، یان دەگووترێت {رأيت قتيلة} بۆ ئافرەتان، وە {رأيت قتيلا} بۆ پیاوان. **(إن لم يكونا صفة مشبهة)** واتە: بەو مەرجە صیغەی نێرو مێ لەم دوو فعيل و فعول ەی رابردوو یەکسان دەبن کە صیغەی موشەبەهە نەبن، بەڵام ئەگەر صیغەی موشەبەهە بن ئەوە دەبێت جیاوازی لە نێوان نێرو مێ بکرێت وەکو {غيور} ئێستا غیور لەسەر وەزنی فعولە بەڵام صیغەی موشەبەهەیە، پێویستە هەموو کات جیاوازی هەبێت لە نێوانیان، بۆ نێرینە دەگووترێت {رجل غيور} وە بۆ مێینە دەگووترێت {امرأة غيورة}. پوختەی ئەم باسە ئەوەیە کە لە فعیلی بە مانا مەفعول و فەعولی بە مانا فاعل نێرو مێ یەکسانن بەڵام بە دوو مەرج: یەکەم ئەوەیە کە دەبێت مەوصوفەکە ناوبرابێت، دووەم نابێت صیفەی موشەبەهەش بن. بەڵام لێرەدا مامۆستای قەرەداغی دەفەرموویت: مەرجی دووەم تەنها بۆ فعولی بە مانا فاعلە چونکە هەر ئەویان بە صیفەی موشەبەهەو بە ئیسمی فاعل هاتووە، بەڵام فعیل بە صیفەی موشەبەهە نەهاتووە، کەواتە: ئەو مەرج دانانە بەم شێوەیە لە شوێنی خۆی نییە چونکە فعیلی ناگرێتەوە.

**رونکردنەوە :**

ئەگەر یەکێك بپرسێت لەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموویت ﴿**إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ**﴾ قریب فعیل ی بە مانا فاعیلە، واتە: بە مانا قاربە کە لە دوای رەحمەت هاتووە وە -تأنيث- نەکراوە لەبەر ئەوەیە کە فعیل ی بە مانا فاعلە لەوەش وەك یەکن نێرو مێ هیچ جیاوازیان لە نێوان ناکرێت. بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: نەخێر لەبەر ئەوە وەك یەکن چونکە لێرەدا قریب مەصدەرە لە مەصدەریشە نێرو مێ وەك یەکن، کەواتە: لێرەدا لەبەر مەصدەرایەتی وەك یەکن، نەك لەبەر ئەوە بێت کە فعیلەو جا هەردووکی تێدا موساوی بن. یان دەڵێین: لەبەر ئەوەیە کە لێرەد

مەحزوفێك هەیە، جا لەبەر ئەم مەحزوفە بە -مذکر-ی هاتووە، وەك ئەوەی بلێین: ئەصلەکەی {شَئٌ قريبٌ}.

**(ولا يجمعان جمع السلامة)** یانی: ئەم فعولە فعیلە ناوبراوانە بە جەمعی سەلامە جەمع ناکرێنەوەو، تەنها بە جەمع تەکسیر جەمع دەکرێنەوە، چونکە ئەصل نینە. ئنجا مامۆستا دێتە سەر باسی فعیلی یەکەم کە بە مانا فاعل بوو وە ئەصلیشە **(تقول في مثال الفعيل الأول)** تۆ دەڵێی لە میسالی فعیلی یەکەم کە ئەصلەو، لەمەدا جیاوازی لە نێوان نێرو مێ هەیە، وە هەروەها بە جەمعی سەلامەش جەمع دەکرێتەوە **(نَصيرٌ نَصيرانِ نَصِيرَيْنِ نَصِيرونَ نَصيرِيْنَ)** لێرەدا ئەم نصیرە بە مانا ناصرە، ئەمە میسالی موفرەدو -تثنية-و جەمعی سەلامەن، وە -مذکر-ان لە حالەتی رەفع و نەصب و جەڕن. جا دێتە سەر باسی جەمع تەکسیرەکان کە {١٠} دە وەزنی هەیە **(نُصَراء)** نون بۆری هەیە، وە صاد لەسەری هەیە لەگەڵ ئەلفی درێژ، ئەصلەکەی {نصیر} نون لەسەری هەبوو کردمانە بۆر، وە صاد لەسەری بۆ کرا، وە {یاء} لادرا، وە ئەلفی درێژ کە ئەلف و هەمزەیە زیاد کرا بوو بە {نصراء}، جا براکەم ئەوانی دیکەش بەم شێوەیە ئیعلال بکە **(نِصار)** نون لەژێری هەیە، وە صاد لەسەری هەیە، لەگەڵ ئەلفەکی زیاد، ئەم دوو وەزنە بۆ جەمعی تەکسیری ئیسمی فاعیلیش هاتبوون، بڕۆ بزانە **(نُصُر)** بە دوو -ضمة- لە دوای یەك **(نُصْران)** بە -ضمة-ی یەکەم و زەنەی دووەم، لەگەڵ ئەلف و نون **(نِصْران)** ھەروەھا تەنھا کەسرەی ئەوەلی **(أَنْصَار)** بە فەتحەی ئەوەڵیو سکونی دووەمی، وە ئەلفێك لەسەر پیتی صاد **(أَنْصِراء)** سکونێك لە نێوان فەتحەو کەسرە، لەگەڵ ئەلفی درێژ **(أَنْصِرَة)** هەروەها بەڵام ئاخیرەکەی تێیە **(نُصُور)** بە دوو -ضمة- لەگەڵ واوی زیاد، ئەمەشیان لە جەمعی ئیسمی فاعیل هەبوو **(نُصْرَى)** بە -ضمة-ی نونیو سکونی صادی وە ئەلفی کورت. جا دێتە سەر باسی -مؤنث-ان **(نَصِيرَة نَصِيرَتانِ نَصِيرَتَيْنِ نَصِيرَات)** بۆ مێینەکانە بە مەفرەدو -تثنية-و جەمع، وە جەمعی تەکسیریشی لەسەر دوو وەزنان دێت، کە ئەمانەن **(نَصائِر)** بە فەتحەی {فاء الفعل}

(**نِصار**) بە کەسرەی {فاء الفعل}، ئەمەی باسمان کرد فعیل بە مانا فاعیل بوو، ئەوجارە دێتە سەر باسی فعیل بە مانا مفعول، کە ئەصل نییەو فەرعە، جا دەفەرمووێت (**والثانی لهما**) تۆ دەڵێیت لە هی دووەم کە فعیلی بە مانا مفعولە بۆ ژن و پیاوان دەگووترێت (**قَتیل قتیلان**) ئەمانە موفرەدو -تثنیة-ن بۆ مێینەو نێرینە وەکو یەك بە کار دێن، وە جەمعی سەلامەشیان نییە، بەڵام سێ وەزنی جەمعی تەکسیری هەیە کە ئەوانەن (**قَتْلَی**) بە فەتحەی ئەوەڵی‌و سکونی دووەمی، لەگەڵ ئەلفێکی کورت، وە ئەصلەکەشی قتیل بووە (**قُتَالَی**) بە -ضمة-ی ئەوەڵی و فەتحەی دووەمی‌و ئەلفێك لە نێوان عین الفعل وە لام الفعل، لەگەڵ ئەلفێکی کورت لە کۆتایی (**قُتَلاء**) بە -ضمة-ی ئەوەڵی‌و فەتحەی دووەمی وە ئەلفێکی درێژ لە کۆتایی (**ویتوافقان في الجمع کما یتوافقان في المفرد والتثنیة**) واتە: نێرو مێ صیغەیان یەکسانە لە فعیلی بە مانا مەفعول هەروەك هەردووکیان لە موفرەدو-تثنیة- یەکسان بوون، تۆ دەڵێیت: {رجل قتیل رجلان قتیلان رجال قتلی، امرأة قتیل امرأتان قتیلان نسوة قتلی} ئەم فەرموودەیەی مامۆستا وەك تەئکید کردنەوەیەك بوو، ئەگینا ئەم یەکسانییە باسکرا بوو ئەوە بوو فەرمووی {والثانی لهما} واتە: بۆ ژن و بۆ پیاو، دەشگونجێ ئەم دووبارە کردنەوەیە بۆ ئەوە بێت کە ئەم یەکسانییە لە موفرەدو -تثنیة- بەو مەرجە بوو کە مەوصوفەکە گوترابێت، بەڵام لە جەمعدا بەبێ مەرجەو گووتنی مەوصوفی ناوێت. جا باسی فعیلی بە مانا فاعیل ومەفعول تەواو بوو، ئەوجارە دێتە سەر باسی فعول بە هەردووك بەشەوە، بۆیە فەرمووی (**وفي فعولٍ بمعنی الفاعل لهما**) تۆ دەڵێی لە میسالی فعولی بە مانا فاعیل بۆ نێرینەو مێینە، کە ئەمەشیان ئەصل نییەو جەمعی سەلامەشی نییە (**نَصُور نَصُورَانِ**) ئێستا ئەم دوو وشەیە بۆ ژن و پیاو بەکار دێن، وەکو {رجل نصور وصبور} یان {امرأة نصور وصبور} وە وەکو {رجلانِ نصوران، وامرأتان نصورَتانِ} وە سێ جەمعی تەکسیریشی هەیە کە ئەمانەن (**نُصُر بضمتین**) ئەم صیغەیە بە دوو -ضمة- کە نون و صادە (**نُصَرَاء بضم ففتحتین**) ئەم صیغەیەش بە -ضمة-ی

ئەوەڵێو وە دوو فەتحە كە صادو رائە، وە لەگەڵ ئەلفی درێژ (**أَنْصَار بسكون بين فتحتين**) واتە: ئەم صیغەیە بە زەنەیە كە هی نونە لە نێوان دوو فەتحەدا كە هی هەمزەو صادە، وە لەگەڵ ئەلفی زیاد لە نێوان صادو رائدا (**يتوافقان في هذا أيضا إفرادا وتثنية وجمعا**) واتە: -مذكر ومؤنث- یەكسانن لەم فعولەی بە مانا فاعیل، هەر وەك یەكسان بوون لە فعیلی بە مانا مەفعول لە موفرەدو -تثنیة- جەمعدا، بەڵام لە موفرەدو -تثنیة- بە مەرجی باسكردنی مەوصوفەكەیە، وە لە جەمعدا بەبێ ئەم مەرجەیە وەكو {رجل صبور، وامرأة صبور، رجلانِ صبّوران، امرأتانِ صبورانِ، رجال صُبُرٌ، نِساء صُبُرٌ} لێرەدا ئەمەش بگوترێت چاكە بۆچی فعولی بە مانا فاعیلە وە پێش خست خۆ هی بە مانای مەفعول ئەصلترە؟ لە وەلامدا دەگووترێت: ئەمە راستە بەڵام چونكە لەگەڵ فعیل ی بە مانا مفعول هاوبەشە لە هەموو ئەم حوكمانەدا جا لەبەر ئەوە لە دوای ئەوی باسی كرد. جا هاتە سەر باسی فعولی بە مانا مفعول كە ئەصڵە، دەفەرمووێت (**وفعول بمعنى المفعول قياسه أن يجمع جمع سلامة لهما**) واتە: فعولی بە مانا مفعول قیاس و قاعیدە وا دەخوازێت كە بە جەمعی سەلامەت جەمع بكرێت بۆ ژن و پیاو وەكو فعیلی بە مانا فاعل كە هەردووكیان ئەصلن، وەكو {حلوب حلوبانِ حلوبونَ حَلوبة حلوبَتانِ حَلوبات} وە هەروەها {نصور} ئەگەر بە مانا منصور بێت دەڵێت: نصور {نصوران نصورون نصورة نصورتان نصورات} بەڵام ئەگەر بە مانا فاعبل بێت جەمعی سەلامەی نییە، وە نێرو مێ یەكسانن وەكو باسكرا، بەڵێ جا ئەم فعولە لەبەر ئەوەی كە ئەصلە گووتمان وەكو فعیلی بە مانا فاعل وایە، پێویستە جەمعی سەلامەی بێت بۆ ژن و بۆ پیاوان، جا با بزانین جەمع تەكسیری ژن و پیاویش هەر لەم فعولەی بە مانا مفعول دیاری بكەین (**وجمع تكسير الذكور له**) واتە: جەمع تەكسیری -مذكر-ان لەم فعولەی بە مانا مفعول (**ما ذكرنا في الذي بمعنى الفاعل**) ئەو سێ جەمعەیە كە لە فعولی بە مانا فاعل هەبوون كە ئەمانەن {نُصُور، نُصرَاء، أَنْصَار} بەڵام لەوێ بۆ نێرو مێ وەكو یەك بوو، كەچی لێرەدا تەنها جەمعی تەكسیرە بۆ نێرینەكان (**والإناث**

**نحو عَجُوزَة)** واتە: جەمعی تەکسیری بۆ -مؤنث-ان لە فعولی بە مانا مفعول {عجوزة} کە لەسەر وەزنی فعولە، وە بە مانا {معجوزة} **(عَجَائِز)** یانی جەمع تەکسیرەکەی {عَجائِز} دەبێت کە لەسەر وەزنی {فَعَائِل}ە. بەڵام ئەوەش بزانە هەندێك دەڵێن: عجوز بە تێ بۆ ژن و پیاوان دەگووترێت. گووتمان نێرو مێ یەکسانن لە فعیلی بە مانا مفعول و لە فعولی بە مانا فاعل بە مەرجێك کە مەوصوف گووترابێت، وا دەرکەوت ئەگەر مەوصوف باسکراو نەبێت پێویستە لەوانیش جیاوازی لە نێوان نێرو مێ هەبێت، جا بەڕێزی دەفەرمووێت **(وإذا لم يذكر الموصوف في الذي بمعنى الفاعل)** واتە: هەر کاتێك کە مەوصوف باس نەکرابێت لەم فعولەی کە بە مانا فاعلە وە ئەصلیش نییە، وە هەروەها لەم فعیلەی کە بە مانا مفعول، کەچی بەڕێزیان لێرەدا باسی ئەوەی نەکردووە، بەڵام وا پێدەچێت پێکەوە بن **(فالظاهر أنه كالذي بمعنى المفعول)** وا دیارە کە ئەم فعولەی بە مانا فاعل وە هەروەها فعولی ناوبراویش لەو کاتەی کە مەوصوفەکەی باس نەکرا وەکو فعولی بە مانا مفعول بێت **(في جَمْعَي الذكور والإناث سلامةً وتكسيراً)** لە هەردووك جەمع کە جەمعی سەلامەو تەکسیرە بۆ -مذکر و مؤنث- کەواتە: لە وشەی {نصور}دا کە فعولە وە بەمانا فاعلە بۆ-مذکر- دەڵێت:{نصور، نصوران، نصورون} بەجەمعی سەلامەت. وە بۆ-مؤنث- دەڵێت:{نصُورة، نصورتان، نصورات} بە جەمعی سەلامەت، بەڵام جەمعی موکەسەری پیاوان ئەم سێ جەمعەیە کەلە{فعول}ی بەمانا مەفعول هەبوون کەئەمانەن{نُصُر، نُصَراء، أنصار} وەجەمعی تەکسیری -مؤنث-ان کەبۆ فعولی بەمانا مەفعول هەبوو وەکو{عجوزة، عجائز} دەڵێ:{نصورة، نصائر} . پوختەی ئەم باسە ئەوەیە: کە فعولی بەمانا فاعل جەمعی سەلامەی نییە، وە سێ جەمعی تەکسیریشی هەیە بۆ نێرو بۆمێ، بەڵام هی بەمانا مفعول جەمعی سەلامەی نێرو مێی هەیە وەجەمعی تەکسیریشی بۆپیاوان ئەم سێ جەمعەیە کە لە هی بەمانا فاعل هەبوون بۆ نێرو بۆ مێ، بەڵام لێرەدا تایبەت بوون بەنێر وە هی مێینە وەکو{عجوزة، نصورة، عجائز، نصائر} کەلەسەر وەزنی

{فعائل}ە. جا دێینەوە سەر فعولی بەمانا فاعل و فعیلی بە مانا مفعول لەکاتێك کە مەوصوف باس نەکرابێت جا فەرمووی لەم کاتەدا ئەم فعولەی بەمانا فاعل هەر وەکو فعولی بەمانا مەفعول وایە، واتە: جەمعی سەلامەی نێرینەو مێینەی هەیە وەتەکسیرەکانی نێرینە ئەم سێ صیغەیە کەباس کراون{نُصُر......هتد} وە بۆ مێینە بە هەمان شێوە{عجوزة، عجائز}هەوە، بەڵام لێرەدا هەندێك لە زانایان تێبینیان هەیەو دەڵێن ئەمە جێگای بیر لێکردنەوەیە، چونکە بەڕێزی فەرمووی: جەمع تەکسیرەکانی فعولی بەمانا مفعول وەکو جەمع تەکسیرەکانی فعولی بەمانا فاعل وان کە سێیەکانن، وەئێستاش دەفەرمووێت: جەمع تەکسیرەکانی فعولی بەمانا فاعل وەکو جەمع تەکسیرەکانی فعولی بەمانا مفعول وان، جادەڵێن ئەوە شوبهاندنی شتێکە بە{نفسي} خۆی وەکو بڵێیت: زید وەك زید وایە جائەگەر وەڵام بدەیتەوە کە جیهەتەکە جودایە، لەبەر ئەوە کە ئەویان لەکاتی موصوف باس نەکراو بێت و وەئەوی تریان لەکاتی موصوف باس کراوبێت. وەخودای باڵادەست لەهەموو کەس زاناترە.

(**وما ذكرنا من فعول بمعني مفعول إلي هنا**) واتە: ئەوەی کە گووتمان و باسمان کرد لە فعولی بە مانا مەفعولەوە هەتا ئەم شوێنە، کە دەکاتە {سلامة وتكسيرا} کە باسکراوە کە ئەوەیە گووتمان ئەم فعولە جەمعی سەلامەی هەیە، هەروەکو فعیلی بە مانا فاعیل، وە تەکسیرەکانی -مذكر-ەکان ئەم سێیەکانن، وە هی -مؤنث-ەکان {فَعائِل} هەروەکو {عجائز}ەوە، لە کاتێك کە مەوصوف نەگوترابێت لەم فعولی بە مانا فاعل وەکو هی بە مانا فعولی بە مانا مەفعولە لە هەموو حوکمەکانی. جا ئەم باسکراوە لە وێندەر تاکو {سلامة وتكسيرا} (**ما رأينا فيه شيئاً**) لە باس و بەیانی ئەم باسەی رابراو لە هیچ کتێبێك وە لە هیچ گوتراوێکی ئەو زانایانەمان نەدیوون بە شێوەیەکی صەریح و راستەوخۆ (**لكن استظهرته من قواعدهم**) بەڵام دەرم خستووە لە یاساو قانونی زانایانی عیلمی صەرف لەو شوێنانەی کە ئەوان ئاماژەیان بۆ کردبوو، وە منیش تەصریحم پێکردووە (**والله أعلم**) وە خودای باڵا

دەست لە هەموو کەس زاناو داناترە هەر ئەو بە تەواوی راستیو هەڵەی لەلا ئاشکرایە.

جا لە کاتێك بەرێزیان رزگاری بوو لە باسی دروستکردنی ئیسمی فاعل وە مەفعول لە -ثلاثي مجرد- هاتە سەر باسی دروستکردنیان لە غەیری -ثلاثي مجرد- کە دەکاتە -ثلاثي مزید- وە رباعي مجردو مەزید جا فەرمووی (**ومما زاد علی الثلاثة**) واتە: ئەو ئیسمە فاعیلەو ئەو ئیسمە مەفعولەی کە دروست دەکرێت لەو فعلانەی زیادن لەسەر سێ حەرفان (**فالضابط فیه أن تضع المیم المضمومة موضع حرف المضارعة**) قانون و یاسا وایە بۆ دروستکردنی ئیسمی فاعیل و مەفعول لەم جۆرە فعلانە کە تۆ میمەکی بۆ دابنێیت لە شوێنی حەرفە -مضارعة- کە لە دوای لادانی ئەم حەرفە -مضارعة- (**وتکسر ما قبل آخره في الفاعل وتفتحه في المفعول**) جا کە میمەکەت دانا، ئنجا ئەو حەرفە مەکسور بکە کە دەکەوێتە پێش ئاخیری لە ئیسمی فاعل، وە مەفتوحی بکە لە ئیسمی مەفعول (**نحو مُکْرِم ومُکْرَم ومُدَحْرِج ومُدَحْرَج**) ئێستا {مُکْرِم} کە ئیسمی فاعیلە لە بابی ئیفعالە ئەصلەکەی {یکرم} بووە، وە حەرفی -مضارعة-کەی لادراوەو میمی -مضموم-ی لە شوێنی داندراوە، وە ئاخیرەکەشی بە مەکسوری ماوەتەوە، وە {مُکْرَم} کە ئیسمی مەفعولە بە هەمان شێوە تەنها پێش ئاخیرەکەی مەفتوح بکە، وە دەشتوانی بڵێیت: ئەومان لە فعلی بینا مەجهول دروست کردووە کە {یُکْرَم} بووە، وە ئەو حەرفەی پێش ئاخیرەکەی بە مەفتوحی ماوەتەوە جا بە هەر حاڵ جیاوازی هەر دەبێت لە نێوان ئیسمی فاعیل و مەفعول، ئەمەیان میسالی -ثلاثي مزید-ە، وە {مُدَحْرِج} وە {مُدَحْرَج} بە هەمان شێوە ئیعلال بکە کە ئەمەش میسالی رباعي موجەرەدە، وە میسالی رباعي مزید {مُحْرَنْجِم ومُحْرَنْجَم} (**وکذا نظائره**) واتە وەکو ئەم ئیسمە فاعل و مفعول باسکراوە وایە، هەموو هاووێنەکانیان لەهەموو بابەکانی تر لە -ثلاثي- مەزیدو رباعي مجردومەزید، واتە بەم شێوەیە حەرفی -مضارع-ەکە لادەو میمێکی بۆر لەشوێنی دابنێ جا پیتی پێش پیتی ئاخری لەژێر

بکە بۆ ئیسمی فاعل و لەسەر بکە بۆ ئیسمی مەفعول، وەکو{مستخرَج، متدحَرِج.....هتد}. رەخنەگرێك پرسیار دەکات و دەلێت: تۆ گووتت لەغەیری -ثلاثي-مجرد حەرفی پێش ئاخیری لەژێر دەکرێت بۆ ئیسمی فاعل و، لەسەردەکرێت بۆئیسمی مەفعول وەئێستا {مُسهَب} وهەندێکی تر -ثلاثي-مەزیدن وەلە ئیسمی فاعل و حەرفی پێش ئاخیری مەکسور نەکراوە بەلکە مەفتوحە، جا دەفەرمووێت **(وشذّ مُسْهَب ومُحصَن ومُلْفَج بفتح ما قبل آخره في إسم الفاعل)** واتە شازە ولەقانون دەرچوونە ئەم سێ وشەیە کەئیسمی فاعلن وەحەرفی پێش ئاخیرەکەیان لەسەرە وەهەموو قانون و یاسایەك لەسەر غالبە، بەشی کەم یاسا لکەدار نابێت، جا{مسهَب} ئەگەر بەم کەسە بلێیت کە زۆر قسە دەکات بە قسەی پروپوچ ئەمە بەفەتحەی هاتووە شازە وەکو گووتمان، بەلام ئەگەر بەقسەکەری رێك بلێین ئەوا بە{مسهِب} هاتووە بەکەسرە وەلەسەر یاسایە وەشازنیە. وە{محصَن} واتە: خۆی پاراستووە لەزینا وەخۆی{حیفظ}کردووە بەهۆی نیکاحی شەرعی. وە{مُلْفَج} میم بۆر و لام زەنەو فی لەسەر واتە: مفلس و هەژار، پوختە ئەوەیە کە ئەم سێ وشەیە -ثلاثي- مەزیدن لەبابی {أفعال}وئیسمی فاعلن قانون وابوو بەکەسرەی پێش ئاخیری یان وەئێستا بەفەتحەی پێش ئاخیری هاتوون لەیاسا دەرچوونە، **(وكذا عاشب و وارس ويافع فيه)** هەروەها شازە لە یاسا دەرچووە ئەم سێ وشەیە کە{عاشب، وارس، یافع}ن چونکە ئەوانە ئیسمس فاعلن وەلەغەیری -ثلاثي- مجردن وەلەسەر وەزنی ئیسمی فاعیلی - ثلاثي- مجرد هاتوون قانون وابو یەم شێوە بن{مُعشِب ومُورِس ومُوفِع} جا{عاشب} فعلەکەی {أعْشَب}ە واتە: شوێن کە گیای شین کردووە {وارس} فعلەکەی {أوْرَسَ}ە واتە: ئەم شوێنە کە ئەم گیایەی شین کردووە کە پێی دەلێین{وَرَسْ} وە{یافع} عەرەب دەلێین {أيفع الغلام} واتە: ئەم منالە لەسەر هاورێیەکانی پێش کەووتووە بەرزبووە **(كلها من باب الأفعال)** ئەم شەشە هەمووی لە بابی{أفعال}ن یاسا وابوو کە لە سەر وەزنی {مُفْعِل}بانە، بەلام کە سێیەکانی ئەوەلی حەرفی پێش ئاخیریان مەفتوحە وە سێیەکانی دوایی لەسەروەزنی

ئیسمی فاعیلی مجرد هاتوون هەموویان شازن و ریزپەرن، ئەو جارە هاتە سەر ئەم صیغانەی کە ئیسمی فاعل و مەفعول لەوان یەکسانە جا فەرمووی (**وقد يستوي لفظ إسم الفاعل والمفعول**) واتە: کەم جار لەفزی ئیسمی فاعل ومەفعول وەك یەك دەبێت لەبەر چەند شتێك کە باسیان دەکات (**في كل ماكان قبل آخره مدغماً**) واتە لەهەموو ئیسمە فاعل و ئیسمە مەفعولێك کە حەرفی پێش ئاخیرەکەی دەغم کرابێت لە حەرفی ئاخیرەکەی وەکو{مُعْتَدٌّ} (**ولم يكن قبله ساكن**) بەلاّم بەو مەرجەی کە لەپێش ئەم دەغم کراوە هیچ حەرفی ساکن نەبێت وەکو میسالمان هێنا بەلاّم ئەگەر ساکن هەبێت لەو کاتە دەتوانین جیاوازی بکەین بۆ وێنە وەکو{مُعِدٌّ} ئەسلەکەی {مُعْدِدٌ} بوو لێرەدا نەقلی حەرەکەی دالی یەکەم دەکەین بۆ عەین وە دەغمی دەکەین، بۆ ئیسمی فاعل دەگووترێت{مُعِدّ} بەکەسرەی عەینی وەبۆ ئیسمی مەفعول{مُعَدٌّ} بە فەتحەی عەین (**أو كان وكان ألفا**) واتە حەرفی ساکن لە پێش حەرفی دەغم کراو هەبێت، بەلاّم ئەو حەرفە ساکنە ئەلف بێت جا لەم کاتەش وەك یەك دەبن وەکو{محابٌّ} کە خۆی میسالەکان باس دەکات. (**أو كان ماقبل آخره واواً أوياءً وما قبله مفتوحاً**) وەهەروەها هەردوکیان یەکسانن لە هەر صیغەیەك کە حەرفی پێش حەرفی ئاخیری واو بێت یان{ی}بێت، وەئەم واو و {ی}ەش حەرفی پێش خۆیان لەسەر بێت جا قەلبی ئەم واو و {ی}ەش دەکرێت بە ئەلف، وە ئەلفیش حەرەکە قەبول ناکات ویەکسان دەبن وەکو{مختارّ} بەلاّم ئەگەر حەرفی پێش واو و{ی} مەفتوح نەبوو لەم کاتەدا جیاوازی دەکرێت، وەکو{مقیم ومقام} کە ئەسلەکەیان {مقوِم و مقوَم} بوونە، واو کراوە بە ئەلف لە ئیسمی مەفعول وە کراوە بە{ی} لەئیسمی فاعل، ئەمە لە ئەجوەفی باس دەکات{إنشاء الله}، ئەو جار میسالەکان دەهێنین (**كمحاب ومتحاب**) {محاب} لە بابی {مفاعل}ە وە {متحاب} لە بابی {تفاعل}ە ئەسلەکەیان{محابِبٌ و متحابِبٌ} بە فەتحەو کەسرەی {ب}ی یەکەم حەزفی حەرەکەی ئەم {ب}ی یەکەم کراوە دەغم کراوە لە هی دووەم بەلێ لەپێش ئەم حەرفە ساکنێك هەیە بەلاّم ساکنە ئەلفە وە قەبولی حەرەکە ناکات،

وە بەناچاریەوە ئیسمی فاعل وەمفعول وەك یەك دەبن (**ومختار**) ئەمەش بابی إفتعالە وە معتل العینە، ئەصلەکەی {مُخْتَيِر} بووە لە ئیسمی فاعیل، وە {مُخْتَيَر} لە ئیسمی مەفعول، جا بە هەر حالْ ئەم یائە قەلب کرا بە ئەلف جا ئیسمی فاعیل و مەفعول وەك یەك بوون (**ومُضْطَرٌّ، ومُعْتَدٌّ**) ئەمانەشیان هەر لە بابی إفتعالن، ئەصلەکەیان {مُضْطَرِرٌ، ومُعْتَدِدٌ} بووە لە ئیسمی فاعیل بە کەسرەی حەرفی پێش کۆتایی، یان ئەصلەکەیان {مُضْطَرَرٌ ومُعْتَدَدٌ} بووە لە ئیسمی مەفعول، ئنجا رائەکە لە هی یەکەم وە دال لە هی دووەم ساکن کران و لە پیتی دووەمی وەك خۆیان دەغم کران، ئەو حەرەکەی کە جیاوازی لە نێوان ئیسمی فاعیل و ئیسمی مەفعول دەکرد حەزف کراو نەماو هەردووکیان لە صیغەدا یەکسان بوون (**ومُنْصَبٌّ ومُنْصَبٌّ فیە**) ئەم دووانەش لە بابی إنفعالن، ئەصلەکەیان {مُنْصَبِبٌ} بووە لە ئیسمی فاعیل وە {مُنْصَبَبٌ} لە ئیسمی مەفعول، ئنجا پیتی یەکەم لە دوو بائەکان حەزف کراو لە هی دووەم دەغم کرا (**ومُنْجابٌ ومُنْجابٌ عنە**) ئەم دووانەش هەر لە بابی إنفعالن، ئەصلەکەیان {مُنْجَوِبٌ، ومُنْجَوَبٌ} بووە واوی متحرك ماقبل مەفتوح قەلب کرا بە ئەلف بوو بە {مُنْجابٌ} لێرەش بە هەمان شێوە ئیسمی فاعیل و ئیسمی مەفعول وەك یەك وابوون. براکەم: دەرکەوت کە ئیسمی فاعل و ئیسمی مەفعول لەم نۆ میسالەو هاووێنەکانیان وەك یەك وانە، جا ئەمەیان لەبەر ئیدغامە وە یان لەبەر قەلبە چونکە ئەم حەرەکەی کە لەسەر حەرفی پێش کۆتاییە واتە سەرو ژێر نەماوە، هەر ئەمەش بوو کە لێکی جودا دەکردنەوە بە ژێر دەمانزانی ئیسمی فاعیلە وە بە لەسەر دەمانزانی ئیسمی مەفعولە (**ویختلف التقدیر**) بەڵێ گووتمان لە لەفزدا هەر دووکیان یەکسانن بەڵام لە تەقدیروو فەرزدا جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە، چونکە دەڵێین: ئیسمە فاعیلەکا بە کەسرەی حەرفی پێش کۆتایین لە ئەصڵداوەکو گووتمان {ومُعْتَدِدٌ، مُخْتَيِر....} وە زۆر جاریش لە مانایەکەی دەردەکەوێت و دەزاندرێت ئەمە کامەیانە. یەکێك پرسیار دەکات و دەڵێت: لە صیغەکانی ئاخیری {منصبّ..هتد} جاوازی هەیە بەم جارو مەجرورە بۆچی لەواندا

ئیسمی فاعیل و مەفعولی بە یەکسان داناوە؟ لە وەڵامدا دەگووترێت: لەوانیش خودی صیغەکان بۆ هەردووکیان وەك یەك وان بەڵام مەرجە بۆ دروستکردنی ئیسمی مەفعول لە فعلی لازم کە بکرێت بە متعدی، کەواتە ئەم جارو مەجرورە پارچە نین لەم وشانە بەڵکە مەرجن بۆ دروستکردن وەکو دەڵێن {شَرْطٌ لاشَطْرٌ}.

## باسی صیفەتی مشبّهە

جا مصنف خوای لێ رازی بێت لە باسی ئیسمی فاعیل و مەفعول وە لەگەڵ هەردوو فعیل و فعولی تەواو کرد، ئەوجارە هاتە سەر باسی صیفەی مشبهە، ئەگەرچی زەنجانی باسی نەکردووە بەڵام لەبەر ئەوەی کە قوتابی زۆر پێویستی پێی دەبێت لێرەدا باسی لێوە دەکات، وە خۆشی لە سەرتای ئەم کتێبە فەرمووی {وأزید علیه...إلخ} واتە: من هەندێك بابەت و میسال لەسەر زەنجانی زیاد دەکەم، جا ئەمەو چەند بابەتی دیکەی زیاد کردووە جا فەرمووی (**الصفة المشبهة**) واتە: لەم جۆرە میسالانەیە کە لە مەصدەری مجرد دروست دەکرێت، ئەم صیفەتە موشەببەهەیە واتە تەشبیهکراوە بە ئیسمی فاعیل لەوەدا وەکو ئەوی -تذکیر وتأنیث وتثنیة- وە جەمع دەکرێت، وەك بڵێیت {حَسَنٌ حَسَنانِ حَسَنونَ حَسَنَةٌ حَسَنتانِ حَسَنات} وەکو لە ئیسمی فاعل دەگووترێت {ضارب ضاربان ضاربون ضاربات ضاربتان ضاربات} جا پێناسەی ئەم صیفەتە لە زاراوەی زانایانی عیلمی صەرف لەفزێکە کە موشتەق بێت لە مەصدەری فعلی لازمی -ثلاثی مجرد- بێت یان غەیری -ثلاثی مجرد- وە دەلالەت بکات لەسەر مانەوەی ئەم صیفەتە وەکو {حَسَن وشُجاع وجَبان} ئێستا ئەم شتانە کە جوانیو غیرەت و ترسناکی لە خاوەنەکەیان دەمینن وە فعلەکەی هەمووشیان لازمەو -ثلاثی مجرد-ە، وە ئەگەر ویستت صیفەی موشەبەهە لە فعلێکی متعدی دروست بکەیت یەکەم جار بیکە بە لازم ئەوجا بیکە بەم صیفەتە وەکو {رَحِمَ} لە بابی چوارەم بیکە بە {رَحُم} وەکو {حسُن} جا بیکە بە {رَحیم} (**وصیفتها من الثلاثي المجرد سماعیة**) بەڵێ سیفەتی موشەبەهە لە-ثلاثي-ی مجرد لە غەیری

-ثلاثـي مجـرد-يـش دروسـت دەکرێـت، بەڵام صیفەکانی لە-ثلاثـي مجرد- سەماعینە واتـە: بیسـتراون وەهـیچ یاسـایەك نیە وەکو ئیسمی فاعل و مەفعول کە وەزنەکەیان دیاری بکات، بەڵکە لەسەر زۆر وەزنی جۆراو جۆر دین مەگەر بۆ ئەلوان و عیوب کە بـۆ پـیاوان{أفعـل} دێـت، وە بـۆ ئافرەتان{فعلاء} دێت وەکو {أحمر و حمراء} جا بەرێـزی دەیەوێـت وەزنەکانی کەمێك کۆبکاتەوە ئەگەر چی بەتەواویش نەکرێت وەکو گووتـراوە {مـا لا بدرك کله لا يترك جله أو کله} جا لە کتێبی شافیە دانراوی زانای بـەناوبانگ شـێخ ابن الحاجبی کوردی نەقل دەکات دەفەرمووێت(**قال ابن الحاجب في شافية هي من نحو فَرِحَ على فَرِحٍ غبالباً**) واتە: ابن الحاجب فەرموویەتی لە کتـێبی شافیە کە کتێبێکی صەرفیە واتە عیلمی صەرف ئەم سیفەتی موشەبەهە لەم فعلـە -ماضـی-ەی لەسـەر وەزنـی {فَعِـلَ} بـە کەسـرەی عـین الفعل لەسەر وەزنی {فَعِـلٌ} دەبێـت بـە زۆری وەکو {فَرِحَ} ئێستا ئەمە فعلی -ماضی-ە لەسەر وەزنی {فَعِـلَ}یـە واتە لە بابی چوارەمە، صیفەتی موشەبەهە لێرەدا لەسەر وەزنی {فَعِلٌ} دەبێت وەکو {فَـرِحٌ} لەگەڵ هاووێنەکانی، هەروەها هاووێنەکانی وەکو {حَزِنٌ} وە بۆ -مؤنث- تائێك زیاد بکە {فَرِحَةٌ وحَزِنَةٌ} جا بزانە {فَرِح} بە کەسرەی عەین العفل و فەتحـەی حـەرفی ئاخیری فعلی -ماضی-ە وە ئەگەر ئاخیرەکەی تەنویندار بکەی ئەوە دەبێـتە صـیفەتی موشـەبەهە وەکـو {فَرِحٌ} وە ئەگەر رائەکە فەتحەی بۆ بکەی ئەوە دەبێـتە مەصـدەر وەکو {فَرَحٌ} (**وقد جاء الضم في بعضها**) وە کەم جار -ضمة- ش دروست دەبێت لە هەندێك لەم میسالانەی کە بە کەسرە هاتبوون (**كَنَدُسٍ وحَذُرٍ وعَجُلٍ**) ئێسـتا ئەم سێ وشەیەو زۆرتریش -ماضی-ەکەیان {فَعِلَ}ەی مەکسورە وە صـیفەتەکە بە کەسرەی عین الفعلە بەڵام -ضـمة-شیان لێی دروستە، کەچی لەژێرەکە هـی خۆیانـە {نَـدُس} واتـە ژیـر {حَذُر} ترسـناك و وشیار {عَجُـل} پەلە دەکات (**وجائت على سَليمٍ وشَكْسٍ وحُرٍّ وصِفْرٍ وغَيُورٍ**) واتە: ئەم صیفەتە هاتووە لەسـەر ئـەم پێـنج وەزنـەش لەگـەڵ دووەکـانی پێشوو لە -ماضی-ەکەی هەموویان {فَعِـل}ەی مەکسـورە {سَـليم} -ماضـی-ەکەی {سَلِمَ} بووە، وە {شَكْس} لەسەر

وەزنــی {فَعْـل}ە بــە ســکونی عــین الفعلەکەی {حُرّ} لەسەر وەزنی {فُعْل}یە بە -ضمة-ی فاء الفعل وە سکونی عین الفعل چونکە ئەصلەکەی {حُرْر} بووە بەڵام دەغم کـراوە، وە {صِـفْر} لەسـەر وەزنــی {فِعْـل} بە کەسرەی فاء الفعل وە سکوتی عین الفعلەکەی وە {غَـيُور} وەکو {فَعول} فەتحەی یەکەمی وە -ضمة-ی دووەمی لەگەڵ واوی زیــاد لــە پــێش کۆتــایی (**ومن الألوان والعيوب والحِلَى على أَفْعَلٍ**) واتە: صــیفەتی موشــەبەهە لەو فعلەی کە دەلالەت دەکات لەسەر رەنگ و عەیب و جوانی لەســەر وەزنی {أَفْعَل} دەبێت بۆ نێرینە -مذکر-، وە مێینە -مؤنث- لەسەر وەزنی {فَعْلآء} دەبێــت وەکــو {أَسْـوَدِ} بــۆ نێریــنە وە {سَوْداء} بۆ مێینە ئەمە نمونەی رەنگە، وە میسالی عەیبیش وەکو {أَعْـرَج، عَرْجآء} واتە: شەلە، وە نمونەی جوانیش وەکو {أَبْلَج بَلْجآء} بە کورتی وەزنەکانی صیفەتی موشەبەهە لە فعلی مەکسور بوو بــە {٩} نـۆ وەزن (**ومن نحو كَرُمَ على كَريمٍ غالباً**) صــیفەتی موشەبەهە لە {كَـرُمَ} وە هاووێنەکانی کە لەسەر وەزنی{فَعُلَ}ەی -مضموم-ن زۆرتر لەسەر وەزنی {فَعيل} دەبێت وەکو {كَريم} کە -ماضی-ەکەی {كَرُمَ}ەیە (**وجائت على خَشِنٍ وحَسَنٍ**) صیفەتی موشەبەهە هاتووە لە {فَعُلَ}ەی -مضموم- لەسەر وەزنی {فَعِلٌ وفَعَـلٌ} بــە فەتحــەی ئــەوەلی لە هەردووکیان وە کەسرەی عین الفعل لە هی یەکەم وە فەتحــەی دووەم لــە هی دووەم (**وصَعْبٍ وصُلْبٍ**) لەسەر ئەم دوو وەزنەش هاتووە بە فەتحــەی یەکــەم لــە یەکــەمی وە بــە -ضمة- لــە دووەمی وە سکونی عین الفعل لە هەردووکــیان (**وجَبَانٍ وشُجَاعٍ**) بــە فەتحــەی حەرفی یەکەم لە هی یەکەم، وە بە -ضمة-ی حەرفی یەکەم لە هی دووەم، وە ئەلفێك لە هەردووکیان زیاد کراوە (**ووَقُورٍ**) بە فەتحەی حەرفی یەکەم و -ضمة-ی دووەمی بە واو (**وجُنُبٍ**) بە -ضمة-ی یەکەم و دووەم. بۆمان دەرکەوت کە صیفەتی موشەبەهە لەمەشدا {٩}نۆ وەزنی هەنە، وە لە هەندێکیان {فَعِلَ}ەی مەکسور لەکەڵ {فَعُلَ}ەی -مضموم- هاوبەشن وەکو سلیم وە کـریم وە غەیــری ئەوانــەش، وە هەندێکیشــیان تایــبەتن (**وهى من فَعَلَ قليلة**) صــیفەتی موشەبەهە لە {فَعَلَ}ەی مەفتوح زۆر کەم دێت، چونکە ئەم بابەیان کەمتر

دەلالەت لەسەر مانەوە دەکات، وە هەروەها ئیسمی فاعیلیش شوێنەکەی پڕ دەکاتەوە (**وجائت على حَرِيصٍ وأَشْيَبَ وضَيِّقٍ**) واتە لەگەڵ ئەوەشدا کە گووتمان صیفەتی موشەبەهە لەم بابە کەم دێت بەڵام لەسەر ئەو سێ وەزنە هاتووە، یەکەم: {فَعِيل} وەکو {حَرِيص} فعلە -ماضی-کەی {حَرَصَ}دیە، دووەم: {أَفْعَلَ} وەکو {أَشْيَب} فعلی -ماضی- {شابَ}دیە، سێیەم: {فَيْعِل} وەکو {ضَيِّق} -ماضی-ەکەی -ضاق-یە یائی لێ زیادکراوە وە لە یائی ئەصلی دەغم کراوە، ئەمانە هەرسێکیان لە بابی دووەمن کە {فَعَلَ يَفْعِلُ} وەرگیراون، لەم سێیانە هی ئاخیریانە تایبەتە بە {فَعَلَ}ەی مەفتوح، بەڵام دووەکانی ئەوەلی لە دووەکانی ئەوەلیش هاتبوون، واتە: لە {فَعِلَ، وفَعُلَ} هاتبوون چونکە {حریص} وەکو {سليم وكريم} وایە، وە {أشيب} وەکو {أحمر} وایە کە دروستە لە هەردوو بابەکان بێت، یانی {حَمِرَ وحَمُرَ} (**ويجئ من الجميع بمعنى الجوع والعطش وضديهما على فَعْلان**) واتە: صیفەتی موشەبەهە دێت لە هەرسێ بینایەکان کە دەکاتە {فَعَلَ، فَعِلَ، فَعُلَ} لە کاتێکدا ئەم فعلە بە مانا {جوع وعطش} واتە: برسیەتیو تینوەتی بێت یان بە مانا {ضد} دژەکانیان بێت، کە دژی برسیەتی تێریاتیە، وە دژی تینوێتی تێراویە، صیفەتی موشەبەهە لەم جۆرە فعلانە لەسەر وەزنی {فَعْلان} دەبێت، ئەمە بۆ نێرینەکان وە بۆ مێینەکان لەسەر وەزنی {فَعْلى} (**نحو جَوْعان**) ئەمە لە بابی یەکەمە واتە {جاعَ يَجُوعُ جَوْعان} بۆ نێرینە، وە بۆ مێینە دەگووترێت {جَوْعَى} ئەمەیان بە مانای برسیەتییە (**وشَبْعان**) لە بابی چوارەمە ئەمەش دژی برسیەتییە واتە تێریەتی، وە بۆ مێینە دەگووترێت {شَبْعَى} (**وعَطْشان وريَّان**) ئەمانەشیان هەر لە بابی چوارەمن، یەکەمیان بە مانای تینوێتیە، وە دووەمیان بە مانای تێراوی دێت، ئەمە بۆ نێرینەکان بەم شێوەیە دەگووترێت، وە بۆ مێینە دەگووترێت {عَطْشَى وريَّا} وە میسالی {فَعُلَ}ەی -مضموم- بەم مانایە نەهاتووە، جا لەبەر ئەمە نمونەی ئەمیانی نەهێناوە (**إنتهى**) فەرموودەی شێخ إبن حاجیب کۆتایی پێ هات کە لە شافیەی وەرگرتبوو، جا ئەمانەی گووتمان صیفەتی موشەبەهە

بوون لە -ثلاثی مجرد- جا دێتە سەر باسی صیفەتی موشەبەهە لە -ثلاثی مزید- وە هەردوو رباعی واتە مجردو مەزید، جا دەفەرمووێت (**ومن غیره علی زنة اسم الفاعل فتکون منه قیاسا**) صیفەتی موشەبەهە لە غەیری -ثلاثی مجرد- کە دەکاتە -ثلاثی مزید- وە رباعی مجرد وە رباعی مزید لەم سێ فعلانە لەسەر وەزنی ئیسمی فاعیلی ئەم فعلە دەبێت، وە ئەمەشیان قیاس و قانونە وەکو -ثلاثی مجرد- سەماعی نییە، کەواتە دەتوانی بڵێی {مُنْطَلِق} ئیسمی فاعیلە وە صیفەتی موشەبەهەشە وەکو بڵێی {زیدٌ منطلِق اللسان} وە ئەمە نمونەی -ثلاثی مزید فیە- یە، وە هەروەها {زید مُطْمَئِنُ النفس والقلب} وشەی {مُطْمَئِنُ} کە فعلە -ماضی- ەکەی {إطمئن} بووە رباعی مزیدە لە بابی {إفعِلال}ە، دەتوانی بڵێی ئیسمی فاعیلە هەروەها دەتوانی بشڵێی صیفەتی موشەبەهەیە.

## باسی مُضَاعَف

لە کاتێك مصنف رزگاری بوو لە باسی سالمی جا هاتە سەر باسی {مضاعف} بە فەصل دەستی پێکرد کە پوختەکەی ئەم بابەتانەیە. ١- پێناسەی {مضاعف} لە لوغەت و لە ئیصطیلاحدا. ٢- هەر فعلێك {ماضی}ەکەی مەفتوح العین بێت وە متعدی بێت واجبە عین الفعلی لە {مضارع}دا {مضموم} بێت مەگەر بە کەمی. ٣- بۆچی {مضاعف} لەگەڵ موعتەلەکان ژمێردراوە، هەڵبەتە لەبەر دوو شتە: أ/ لەبەر ئەوەی کە ئیبدالی دێتە سەر. ب/ حەزفی تێدایە. ٤- حروفی ئیبدال چینەو وە چەندن؟. ٥- {مضاعف} ئیدغامیشی دێتە سەر کە سێ جۆری هەیە کە دەکاتە واجب و جائزو مومنوع. ٦-ئایا ئەصل لە سوککردنی {مضاعف} چییە لەوسێیانە کە ئیبدال وَ حەزف و ئیدغامن؟ بێگومان ئیدغام ئەصلە. ٧-ئایا ئیدغام لە کوێ واجبەو لە کوێ قەدەغەیەو لە کوێ دروستە؟ ٨-قاعیدەی واجب بوونی ئیدغام کە یەکێك لەوانە ئەوەیە کە نابێت ئیلتیباسی ببێت. ٩-چۆن دەزانی کە ئیلتیباس نییە لەو فعلانە {مَدَّ، فَرَّ عَضَّ} کە هەر یەکێك لەمانە لە بابێکن؟ وە لە دوای ئیدغام

وەکو یەکتر دێنە بەرچاو. ١٠-حوکمی {مضاعف}ی مەجزوم و ئەمری بە صیغە چۆنە لە {مضاعف}؟ ١١-حوکمی ئیسمی فاعیل و مەفعول چۆنە لە {مضاعف}ی لە رووی ئیعلالەوە؟ ١٢-لە کۆتاییدا صیفەتی موشەبەهە لەسەر چ وەزنەکی دێت لە {حَبَّ وشَحَّ}.

**تێبینی :**

هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئیسم و فعل سێ جۆری هەیە: کە ئەمانەن {سالم وە صەحیح وە معتل} یەکەم: سالم ئەوەیە کە حەرفە ئەصلیەکانی خاڵی بن لە حروفی عیللەو هەمزەو دووقات بوونەوە. دووەم: صحیح ئەوەیە کە حروفە ئەصلیەکانی خاڵی بن لە پیتەکانی عیللە بەس. سێیەم:معتل ئەوەیە کە یەکێك لە حەرفە ئەصلیەکانی حەرفێك بێت لە حەرفەکانی عیللە، کەواتە {نَصَرَ} سالمەو صحیحە. وە {سأل ومدد} صحیحن بەلاّم سالم و معتل نین، وە {عَدَّ ویسر} نە سالم و نە صحیحن بەڵکو معتلن.

بێگومان ئەو صیغانەی وەك -ماضی مضارع.....- هەروەکو بۆ سال بەکار دێن بەهەمان شێوە بۆ غەیرە سالمیش بەکار دێن کە -مضاعف ومعتلّ ومهموز-ن، بەلاّم لەبەر ئەوەی هەندێك حالەتی تایبەت بەوان هەیە مصنف ویستی باسیان لێوە بکات، جا فەرمووی (**فصل في بيان المضاعف**) واتە: ئەم فەصلە باس و بەیانی {مضاعف}ی دەکات جا -ماضی- یان -مضارع- ....هتد بێت (**وهو في اللغة اسم مفعول من ضاعف بمعنى جعل الشئ اثنين فصاعداً**) وشەی {مضاعف} لە زمانی عەرەبیدا کە ئیسمی مەفعولە لە {ضاعف}ە وەرگیراوە بە شتێك دەڵێن: کە دوو چەندانە کرابێتەوە (**ويقال له الأصم لشبدته**) هەروەها {مضاعف} پێشی دەگووترێت ئەصەم یانی کەڕ لەبەر ئەوەی کە گوێچکەی کەڕ پڕ دەبیَو شت نابیستێ، ئەم {مضاعف}ەش چونکە دەغم کراوە پڕ بووە، هەروەها پیاوی کەڕ پێویستی بە دووبارە کردنەوەی وشە هەیە، ئەم {مضاعف}ەش حەرف دووبارە دەکاتەوە. جا یەکێك دەڵێت: چۆن توندی دەبێتە هۆی ئەوەی کە پێی یلێن

ئەصەم؟ جا لە وەلاّمدا دەفەرموویّت (**لأنه يقال حجر أصم أى صلب**) چونکە لە زمانی عەرەبیدا دەگووترێت: {حجر أصم} واتە بەردی توووند، دیارە ئەصەم بە مانای توووند هاتووە، جا لەبەر ئەوە کە {مضاعف ثلاثی} جیایە لەگەڵ {مضاعف} لە رباعیدا، هەر یەکەو پێناسەی تایبەتی خۆی هەیە، فەرمووی (**وهو في الإصطلاح من الثلاثى المجرد والمزيد فيه**) واتە {مضاعف} لە زاراوەی صەرفیان لە -ثلاثی مجرد ومزید فیه- (**ما كان عينه ولامه من جنس واحد**) لەفزێکە جا ئیسم یان فعل کە عین الفعل و لام الفعلی وەك یەك بن واتە: هەردووکیان دوو پیتی وەك یەك بن وەك ئەوەی هەردووکیان دال بن یان صاد یان هەر پیتێکی دیکە بن (**كرَدَّ وأعَدَّ**) {رَدَّ} -ثلاثی مجرد-ە وە {أعدّ} -ثلاثی مزید فیه- لە بابی إفعاله عین الفعل وە لام الفعل لە هەردووکیان یەك نەوعە حەرفن (**فإن أصلهما ردد وأعدد أسكن الأول وأدغم في الثاني**) واتە: ئەصلی {ردّ}ەی {ردد} بووە دالی یەکەم ساکین کرا بە حەزفی حەرەکەی پاشان لە دالی دووەم دەغم کرا بوو بە {رَدَّ} وە {أعدّ} ئەصلەکەی {أعدد} بوو وەکو {أكرم} بووە نەقلی حەرەکەی دالی یەکەم کرا بۆ لای {فاء الفعل}ەکەی ئنجا لە دالی دووەم دەغم کرا بوو بە {أعدّ} (**ومن الرباعى ما كان فائه ولامه الاولى من جنس واحد وكذا عينه ولامه الثانية**) واتە: {مضاعف} لە رباعی ئەوەیە کە {فاء الفعل} وە لام الفعلی یەکەم یەك جۆرە حەرف بن وە هەروەها عین الفعل وە لام الفعلی دووەم وەکو {زلزل} (**ويقال له المطابق أيضا**) {مضاعف}ی رباعی پێی دەگووترێ {مطابق} هەروەکو پێی دەگووترێ {أصم ومضاعف} (**لأنه مطابق فيه بين الفاء واللام الأولى والعين واللام الثانية**) چونکە {مطابق}ەی پێ کراوە لە نێوان {فاء الفعل} وە لام الفعلی یەکەم، وە لە نێوان عین الفعل وە لام الفعلی دووەم وەکو {زلزل} . یەکێك پرسیار دەکات: ئەدی لە {ثلاثی}ش {مطابق} نییە؟ ئەویش لە وەلاّمدا دەفەرموویّت (**وهذا أقوى مما في الثلاثى**) واتە: ئەو موتابەقەی کە لە رباعی هەیە بەهێزترە لەو موتابەقەی کە لە {ثلاثی} هەیە، چونکە لە {ثلاثی}

موتابەقە تەنها یەك لایە کەچی لە رباعی موتابەقە لە نێوان دوو جۆرە پیتە نەك یەك. جا لێرە هەندێك شت زیاد دەکات لەسەر تەصریفی زەنجانی، بۆیە دەفەرمووێت (**واعلم أن ما ماضیه مفتوح العین من الثلاثی المجرد یجب ضم عین مضارعه إن کان متعدیا**) بزانە قوتابی گیان: بەڕاستی هەر فعلێك لەهەر رباعێك کە{ماضی}ەکەی مەفتوح العین بێت وە {ثلاثی مجرد} بێت و {مضاعف} بێ واجبەو پێویستە عین الفعلەکەی {مضارع}ی -مضموم- بێ، بە مەرجێك ئەم فعلە موتەعەدی بێت تاکو نەقل لە -ضمة- بۆ -ضمة- بێت نەك لە کەسرە بۆ -ضمة- (**وجاء الکسر في بعضها کالضم**) واتە: کەم جاریش کەسرەش هاتووە لە هەندێك فعلاندا وەکو -ضمة-ش هاتبوو، یانی لە کاتی کەسرەشدا -ضمة- هەر دروستە (**نحو یَشُدُّهُ ویَعُلُّهُ ویَنُمُّهُ ویَبُتُّهُ**) ئێستا ئەم چوار فعلە کە هەر چواریان -ماضی-یەکەیان مەفتوح العینەو وە -ثلاثی مجرد-ن وە {مضاعف}ن وە هەمووشیان موتەعەدینە لەوانەدا کەسرەو -ضمة- دروستە، واتە: {یَشُدُّهُ ویَشِدُّهُ} بە -ضمة-و کەسرەی شینەکە، ئەوانی دیکەش بە هەمان شێوەن، وە ئەوانەی کە تەنها -ضمة-یان تێدا دروستە زۆرن بۆیە باسیان ناکات. یەکێك پرسیار دەکات: بۆ {حَبَّهُ یَحِبُّهُ} بەس بە کەسرەی هاتووە لە کاتێکدا تۆ گووتت هەموو شوێنەك -ضمة-ی تێدا دروستە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**وأما حَبَّهُ یَحِبُّهُ بالکسر فقط قلیل**) واتە: ئەم فعلە کە -ثلاثی مجرد-ە ...هتد کە بەس بە کەسرەی دروستە ئەمە کەمە، چونکە گووتمان لە هەر شوێنەك کەسرە دروست بێت ئەوا -ضمة-ش دروستە، کە ئەمەشیان بەس بە -ضمة-ی هاتووە ئەوە کەمە. یەکێك دەپرسێت و دەڵێت: لەبەرچی {مضاعف} لەگەڵ موعتەلەکان حیساب کراوە، لە کاتێکدا کە هیچ حەرفی عیللەشی تێدا نینە؟ لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**وإنما ألحق المضاعف بالمعتلات**) واتە: نییە حیساب کرا بێت {مضاعف} لەگەڵ موعتەلاتەکان (**لأن حروف التضعیف یلحقها الإبدال**) چونکە پیتەکانی {مضاعف} گۆڕانەوەی بە حەرفێکی دیکەی دێتە سەر، واتە: حەرفێك بە حەرفێك دەگۆڕدرێت هەروەکو

حروفەکانی عیللە دەگۆڕدرێن. ئنجا با بزانین کە ئەم گۆڕانە یان بۆ ئیدغامە یان بۆ غەیری ئیدغامە، وە ئەوەش بزانین ئەگەر گۆڕانەکە بۆ ئیدغام بێت چ جۆرە حەرفێکن؟ وە بۆ غەیرە ئیدغام چ جۆرە حەرفێکن؟ وە دەفەرمووێت (**وحروفه التى تبدل من حروف أخر إبدالا شائعاً**) واتە: ئەو حەرفانەی دەگۆڕێن و دەبنە بەدیل لە شوێنی هەندێکی دیکە بە زۆری بە مەشهوری بەلای زانایانی عیلمی حروف (**إنما يكون من حروف أنصت يوم جدّ طاه زلّ**) نابێت، تەنها لەم چواردانە دەبێت، وە هیچ حەرفێکی دیکە نابێت مەگەر بە شاز وەکو دەڵێن {زنديق} ئەصلەکەی {زنديّ} بوو یائی کراوە بە قاف وە لەم چواردانەش نییە، بەڵێ خیلاف زۆرە لەسەر حروفەکانی ئیبدال ئەمەی کە لەم کتێبەدا هەیە، بۆچونی إبن الحاجب دەڵێت: ئەم چواردەیەنە. وە زومەخشەری دەڵێت: پازدەنە وە سینی لەسەر ئەم چواردانە زیاد کردووە. کەچی ئیبن مالیك دەڵێت: نۆنە. وە هەندێکی دیکە دەڵێن: سێزدە پیتن {کە صادو نونیان} لەم چواردانە تەرك کردوون. بەهەرحاڵ ئەم چواردەیە مەشهورە (**إن كان لغير الإدغام**) واتە: بە مەرجێك لەم چواردە دەرناچێت کە ئەم گۆڕانە بۆ ئیدغام نەبێت بەڵکو بۆ شتێکی دیکە بێت وەکو تەخفیف (**وله يكون في الجميع غير الألف عند بعض**) واتە: ئیبدال بۆ ئیدغام بوو لە هەموو پیتێك دەبێت تەنها ئەلف هەرگیز نابێت بە یەکدەنگی زانایان ئەمە لەسەر بۆچوونی هەندێك لە زانایانە کە دەڵێن: تەنها ئەلف نابێتە بەدەل، وە ئەوانی دیکە دەبن بە جیاوازی (**وغير الضاد والفاء والشين والراء كما في الچارپردي**) وە هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: ڕاستە کە ئەلف نابێت بەڵام {ضاد وشين وفاء وراء} ئەم چوارەش وەکو ئەلف نابن، بەڵام غەیری ئەم پێنجە هەموو ئەوانی دیکە دەبن لە چواردەکان و غەیری چواردەکان (**ولكن المبدل من حروف التضعيف لايكون إلا الياء**) بەڵام وا مەزانە بۆ پیتەکانی {مضاعف}یش هەروایە، ئەمە بۆ حروفی {مضاعف} وانییە بەڵکە ئەو حەرفەی دەبێتە بەدەل لە جیاتی حروفی {مضاعف}ی نابێت تەنها یائیان دەبێتوەکو لەمەودوا میسالی پێ دەهێنینەوە. یەکێك دەڵێت: ئەی بۆچی {أُمدو}و

هاوێنەکانی بەدەلی {ی} نییە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**فواو أُمدو ويمدون وألف تَقَضّى مبدلتان من الياء**) واتە: واوی {أمدو، ويمدون} کە یەکەمیان ئەمری بە صیغەیە بۆ نێرینەکان، وە ئەوەی دووەمیان جەمعێ -مؤنث-ی غائیبانە، ئەصلەکەیان {أمدد ويمددن} بووە، وە لەگەڵ ئەلفی {تقضّى} ئەصلەکەی {تقضض} بووە هەردووکیان بەدیلی پیتی {ی}نە، چونکە {أمدد} دالەکەیان گۆڕاوە بە {ی} پاشان قاعیدەیە یائی ساکین ما قبل -مضموم- کراوە بە واو. {تقضّى} ئەصلەکەی {تقضّض} بووە {ضاد}ی ئاخیری کراوە بە یائو ئەوجار کراوە بە ئەلف چونکە قاعیدەیە یائی متحرك ماقبل مفتوح کراوە بە ئەلف، کەواتە: حروفی {مضاعف}ی تەنها دەکرێنە {یاء} لە پاشان یائیش دەکرێتە واو یان ئەلف ئەوە قاعیدەکی دیکەیە، جا با میسالی ئیبدال بهێنینەوە (**كقولك أمليت بمعنى أمللت**) وەکو دەڵێیت: {أمليت} بە مانای {أمللت} واتە: نووسیم، جا لە {أمللت} لامی دووەم کراوە بە {یاء} ئەمە میسالی -ثلاثی- بوو لە بابی ئیفعال (**ودهديت بمعنى دهدهت**) ئەمەش نمونەی رباعـیە ئەصلەکەی {دهدهت} بووە هائی لێ کراوە بە {ی} (**والحذف**) ئەمەیان حەزفە بەسەر ئیبدالی، واتە: حروفەکانی {مضاعف} هەروەك ئیبدال و گۆڕانیان دێتە سەر بە هەمان شێوە حەزفیشیان دێتە سەر وەکو موعتەلەکان (**كقولهم مِسْت وظَلْت بكسر الفاء وفتحها وأَحَسْت**) ئێستا ئەم سێ فعلانە لەبەر {ضمير}ەکانیان دەغمیان تێدا قەدەغەیە، جا کە بمانەوێت سووکیان بکەین ئەوە بە حەزف دەیکەین لەبەر ئەوەی دەغم نابێت، دەڵێین {مِسْت} ئەصلەکەی {مَسِسْت} بووە، وە {ظِلْت} ئەصلەکەی {ظَلِلْت} بووە، جا لە هەردووکیان حەزفی حەرەکەی یەکەم لە دووەکانی وەك یەك دەکەین ئنجا {إلتقاء السكنين} لە نێوان هەردووك سین پەیدا بوو لە هی یەکەم وە لە نێوان هەردوو لام لە هی دووەم حەزفی یەك لەم دووانە دەکەین بوو بە {مَسْت وظَلْت} بە فەتحەی حەرفی یەکەم لە هەردووکیان، یان نەقلی حەرەکەی عين الفعل بۆلای {فاء الفعل} دەکەین لە پاش لابردنی فەتحەی خۆی پاشان حەزفی یەکێك لەم

دوو سینه یان لەم دوو لامه دەکەین دەبێته {مِسْت وظِلْت} به کەسرەی حەرفی یەکەم له هەردووکیان، وه {أحَسْت} میسالی ئەو فعلەیه که لەسەر سێ حەرفان زیاد کراون، ئەصلەکەی {أَحْسَسْت} بو نەقلی حەرەکەی سینی یەکەم کرا بۆلای حائی ئنجا دوو ساکین به یەك گەیشتن که هەردوو سینەکانن لەبەر ئەوه سینێکمان حەزف کرد بوو به {أَحَسْت} **(أی مَسِسْت وظَلِلْت وأَحْسَسْت)** واته ئەمانه ئەصلی ئەم فعلانه بوونه، هەر یەکەیان حەرفێکی لێ حەزف کراوه بۆ تەخفیف و سووککردن **(والمحذوف الأول)** ئەو پیتەی که لەم دووانه حەزف کراوه حەرفی یەکەمه، واته: عین الفعل حەزف کراوه **(فوزن مِسْت فِلْت)** میزانی {مِسْت} هەروەها {ظِلْت} {فِلْت} بووه، چونکه میزان تابیعی مەوزونه له حەزفدا، جا له مەوزونی حەزفی عین الفعل کراوه له میزانیش به هەمان شێوه عین الفعل حەزف دەکرێت، وه میزانی {أَحَسْت} {أَفَلْت} بووه لەمیشیان عین الفعل نەماوه **(وقیل الثانی ففِعْت)** هەندێك له زانایان دەڵێن: ئەو حەرفەی که حەزف کراوه حەرفی دووەمه له هەرسێکیان، که دەکاته لام الفعل، جا میزانەکه {فِعْت}وه له {لِمِسْت وظِلْت} جا حەرفی ئەوەلی له هەردووکیان به فەتحەو به کەسره دەبێت، ئەم جارەیان لام الفعل له مەوزونی نەماوه، واته: {مست} وه له میزانی {فعت} به هەمان شێوه لام الفعل لابراوه، وه وەزنی {أحست}ی {أفعت} له میش به هەمان شێوه لام الفعل نەماوه.

**(والمضاعف یلحقه الإدغام)** هەروەها {مضاعف} ئیدغامیشی دێته سەر هەروەکو ئیبدال و حەزفیشی دەهاتنه سەر **(بتخفیف الدال وتشدیده بمعنىً واحد)** وشەی {أدْغام} به سووکی دالی به شەدە دەخوێندرێتەوه، هەردووك واته به شەدەو بەبێ شەدە به یەك مانا دێن، **جوو** به سووکی لەسەر بۆچوونی کوفیەکانەو دەبێته مصدەری بابی إفعال، وه به شەدە لەسەر بۆچوونی بەصریەکانه مەصدەری بابی إفتعاله چوونکه {إدّغام} ئەصلەکەی {إدتغام} بووەتائەکه کراوه به دال و ئنجا دەغم کراوه **(وهو في اللغة الإخفاء والإدخال)** ئیدغام له زامنی عەرەبیدا به مانای {إخفاء}: بزرکردن و شاردنەوه دێت، وه إدخال به مانای: شتێك له ناو

شتێك دابنێی (**وفي الإصطلاح أن تسكن الأول وتدرج في الثاني**) ئیدغام لە زاراوەی صەرفیەکان ئەوەیە: کە حەرفی یەکەمی ساکین بکەی ئنجا لە ناو حەرفی دووەمی دابنێی وە بە توندی بیخوێنیەوە تاکو هیچیان نە فەوتێن (**ویسمی الأول مدغما والثانی مدغما فیه**) جا حەرفی یەکەم کە ساکین کراوە ناوبراوە بە {مُدغم} واتە دەغم کراوە، وە حەرفی دووەم ناوبراوە بە {مدغم فیه} واتە تیایدا دەغم کراوە، جا دەرکەوت کە {مضاعف} بە سێ جۆر تەخفیف سووك دەکرێت با بزانین لەم سێ جۆرانە کامەیان باشترە؟ فەرمووی (**واعلم أن الأصل في تخفیف المضاعف الإدغام**) واتە: بزانە بەڕاستی ئەصلترو باشتر بۆ سووککردنی {مضاعف}ی لەم سێیانە ئیدغامە چونکە لە کاتی ئیدغام هەر پیتەکان بە زاتی خۆیان ماون، بەڵام لە کاتی حەزفکردن یەکیان هەر نەماوە، لە ئیبدالیش ماوە بەڵام وەکو خۆی نەماوە بەڵکو بە پیتێکی گۆڕاوە (**فلا یعدل عنه إلى الأولین إلاّ عند تعذره**) دروست نییە لابدرێت بۆ ئیدغام بۆ لای دووەکانی دیکە مەگەر ئیدغام قەدەغە بێت و نەکرێ وەکو {مِسْت} یان وەکو {زلزل} لەم شوێنانە ناچارین یان حەزف یان ئیبدال ئەنجام بدەین. یەکێك پرسیار دەکات: تۆ گووتت تاکو ئیدغام هەبێت ئیبدال و حەزف ناکرێن، وە لە {مضارع}ی مەجزوم و ئەمری بە صیغە ئیدغام رێك دەکەوێت لەگەڵ ئەمەشدا ئیبدال و حەزف کراون؟ لە وەڵامدا دەڵێت (**وهما في المجزوم والأمر إنما یکونان علی مذهب الحجازیین**) واتە: ئیبدال و حەزف لە فعلی {مضارع}ی مەجزوم و ئەمری بە صیغە دروست نییە، مەگەر لەسەر مەزهەبی حیجازییەکان چونکە ئەوان دەڵێن: لەم دوو شوێنە ئیدغام قەدغەیە جا ئیبدال و حەزفی تێدا دەکەین وەکو {أمدُدْ ، ولم یمدُدْ} لەم شوێنانە دالی دووەم بکە بە یائو ئنجا حەزفی بکە، بەڵام تەمیمیەکان ئیدغام لێرەش واجبەو قەدغە نییە، بەڵام کە تەماشای ئەم تەصریفە دەکەین مامۆستا دەڵی هیچیانی نەڕەنجاندووە دەڵێ ئیدغام لەم دوانە جائیزە، یانی کردن و نەکردنی دروستە وەکو لە مەودوا باسی دەکەین، جا ئەم مشت و مڕە لە کاتێکە کە ئەم دوو فعلە {ضمیر}ی ساکین و

متحرکەی پێوە نەلکابێت، ئەگینا لەگەڵ {ضمیر}ە ساکینەکان واجبە ئیدغام بکرێت وەکو {مُدَّا، مُدُّوا} وە لەگەڵ {ضمیر}ەکانی متحرك مەمنوعە ئیدغام بکرێت وەکو {أمدُدْنَ، ولم يمدُدْنَ} (**ونحو زلزل وتزلزل ومَدّدَ وتَمَدّدَ ليس فيه إلاّ الإبدال**) واتە:لە {زلزل} کە کە رباعی مجردەو {تزلزل} رباعی مزیده {مدد} کە -ثلاثی مزید- لە بابی تەفعیل {تمدد} لە بابی {تفعُّل} لە مانەو هاووێنەکانیان تەنها ئیبدال دروستە، چونکە دووەکانی ئەوەلی {زلزل ...هتد} فاصلی هەیە لەنێوان لامەکان وزییەکان لەم کاتە ئیدغام مەمنوعە، وە لەدووەکانی دوایی {مدّد...هتد} {إلتقاء الساكنين} دەبێ ئەگەر ئیدغام بکەین جارێکی دیکە چونکە جارێك کراوە (**ويلحق جميع صيغها غائبا وغيره**) واتە: ئیبدال تایبەت نییە بە بازی صیغە، بەڵکە ئەم ئیبدالە دێتە سەر هەموو صیغەکانی دیکە غائیب و غیرە غائیب وەکو موخاتەب وە-ماضي و مضارع- متکلم (**كتقضي ودهديت**) ئێستا {تقضي} فعلی -ماضي-دو غائیبانە ئەصلەکەی {تقضض} بووە {ضاد}ی ئاخیری کرا بە {یاء} وە {یاء} کرا بە ئەلف وە{دهديت} فعلی -ماضي- یە لە روباعی موجەرەد بووە موخاتەبە ئەصلەکەی {دهدهت} بووە و هائی دووەم کرا بە یائی دەشتوانین تائی لە {دهديت} مەفتوح و مەکسورو -مضموم- بکەین بۆ سێ میسال دەبێ (**وحكمها حكم الناقص**) ئەو -مضاعف-ی کە حەرفی ئاخیری حوکمی وەکو حوکمی {معتل اللام}ی وایە، چونکە کە حەرفی ئاخیری بووە بە یائی هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ ناقصی ئەصلی، ئێستا {زلزل} لامەکەی بکە بە یائی دەبێتە {زلزی} وە{يزلزل} دەبێتە {يزلزی} وە بە عامیلی جازم و بینای ئەمر حەرفی ئاخیری لادەچی. جا بزانە ئیدغام سێ بەشە واجب و دەبێت بکرێت {ممتنع} واتە: قەدەغەیە {جائز} واتە: دروستە و کردن و نەکردنی وەك یەك وایە. جا دەفەرمووێت (**وذالك واجب في نحو مد يمدُّ**) واتە ئیدغام واجبە لەم {مد يمد} و هاووێنەکانی ئێستا {مد} -ثلاثي- موجەردەدو بابی ئەوەلە ئەصلەکەی {مدد} بوو حەزفی حەرەکەی دالی یەکەم کراو دەغم کرا بوو بە {مَدَّ} وە {يُمُدُّ} ئەصلەکەی {يمْدُدُ} بووە، نەقلی

حەرەكەی دالی ئەوەلمان كرد بۆ حەرفی پێش خۆی بوو بە {يُمْدُدُ} ئەوەل ساكین، دووەم متحرك ئەوەل لە هی دووەم دەغم كرا بوو {يَمُدُّ} (**وأَعَدَّ يُعِدُّ، وانْقَدَّ يَنْقَدُّ، واعْتَدَّ يَعْتَدُّ، وتَمادَّ يَتَمادُّ، واسْتَعَدَّ يَسْتَعِدُّ**) بەم شێوە ئیدغام واجبە لەو فعلانەی كە چوار حەرفیو پێنج حەرفی شەش حەرفین، {أَعَدَّ} بابی إفعالە ئەصلەكەی {أَعْدَدَ} بووە، {يُعِدُّ} ئەصلەكەی {يُعْدِدُ} بووە، {انْقَدَّ} بابی إنفعالە ئەصلەكەی {إنقدَ يَنْقَدِدُ} بووە{اعْتَدَّ} لە بابی إفتعالە، ئەصلەكەی {إعْتَدَدَ يَعْتَدِدُ} بووە، {تَمادَّ} لە بای تفاعل، ئەصلەكەی {تَمَادَدَ يَتمادَدُ} بووە، وە {اسْتَعَدَّ} لە بابی إستفعالە، ئەصلەكەی {إسْتَعْدَدَ يَسْتَعْدِدُ} بووە، لە هەموویان حەرفی یەكەم ساكین كراو لە حەرفی دووەم دەغم كراوە، جا ئەگەر حەرفی پێشووی ساكین بێت ئەوە نەقلی حەرەكەی بۆ بكە وەكو {أَعْدَدَ} وە ئەگەر متحرك بوو ئەوە حەزفی حەرەكەی بۆ بكە وەكو {إعْتَدَدَ} لێرەدا نەقلی حەرەكەی بۆ ناكەی چونكە تائەكە بە خۆی متحركە چ جای حەرەكەی بدەیتێ حەرەكەشی رێك وەكو حەرەكەی دالەكە فەتحەیە (**ومما ليس مضاعفاً وجب الإدغام فيه مثله**) واتە: ئەو وشەیەی كە {مضاعف}ی ئیصتیلاحیش نەبێت وەكو {إحْمَرَّ} بێگومان تۆ لە پێشەوە زانیت كە لە ئیصتیلاحدا چیە؟ لە -ثلاثي مجرد-ئەوە بوو كە عين الفعل و لام الفعلی وەكو یەك بن، وە لە رباعی ئەوە بوو كە فائو لفعل و لام الفعلی یەكەم وە هەروەها عين الفعل و لام الفعلی دووەمی وەكو یەك بن، كەواتە هەریەكی بەم شێوە نەبی لە ئیصتیلاح بە {مضاعف} داناندرێت، بەڵام وەكو {مضاعف}ی ئیصتیلاحی دەغم دەكرێت (**نحو إسْوَدَّ يَسْوَدُّ واطْمَأَنَّ يَطْمَئِنُّ**) ئێستا {أسود} ئەصلەكەی {سود}یە {مضاعف} نییە، بەڵام نیشانەی ئەم بابە ئەوەیە كە لام الفعلی دووبارە بكرێتەوە جا بوو بە{مضاعف}، بەڵام نەك {مضاعف}ی ئیصتیلاحی بەڵكە لوغەوییە، وەهەروەها {إطمئِنَّ} ئەصلەكەی{طَمْئَنَ}یە وەكو {دحرج}ە روباعی موجەرەد بوو بەڵام كە كرا بە روباعی مەزیدی بابی {افعلال} وەكو {إقْشَعَرَّ} لام الفعل دووبارە كراوە بوو بە {مضاعف} بەڵام -مضاعف-ی

لوغەوی، جا بە هەر حاڵ ئیدغام لەوانەش هەر واجبە، ئەوە دال لە دالی دەغم کراوە لە {إسْوَدَّ} وە نون لە نون دەغم کراوە لە {إطْمَئِنَّ} (**وهكذا هذه الأفعال إذا بنيتها للمفعول**) واتە هەروەها ئەم فعلانە لە کاتی بکرێنە بینا مەفعولیش جا چ -ماضی- یان -مضارع- بێت ئەوا ئیدغامیان تێدا واجبە وەکو لە کاتی بینا فاعیلی واجبە دەغم بکرێن (**نحو مُدَّ يُمَدُّ**) {مُدَّ} بینا مەفعولی -ماضی-د وە {يُمَدُّ} بینا مەفعولی -مضارع-ە ئەصلەکەیان {مُدِدَ يُمْدَدُ} وەکو {نُصِر يُنْصَرُ} بوو بە -ضمة-ی‌حەرفی ئەوەلی، ئنجا دالی یەکەمی ساکین کرا وە دەغم کرا لە دالی دووەم (**وفي نحو مَدٍّ مصدراً**) واتە ئیدغام واجبە لە {مَدٍّ} وە هاووێنەکانی کە مەصدەر بن نەك ئیسمی مەصدەر بن، چونکە لە ئیسمی مەصدەر ئیدغام قەدەغەیە، وەکو لە قورئان دەفەرمووێت ﴿**وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَداً**﴾ ئەمە ئیسمی مەصدەرە ئیدغام ناکرێت، جا {مَدّاً} مەصدەرە ئەصلەکەی {مَدْدَاً} بوو راستەوخۆ دەغم کراوە (**وكذا إذا إتصل بالفعل ألف الضمير أو واوه أو ياءه**) هەروەها ئیدغام واجبە لە کاتی ئەم سێ زەمیرە بلکێن بەهەر فیعلێك -ماضي- یان -مضارع- یان ئەمر مەزید یان موجەردد بینا فاعل یان بینا مەفعول، چونکە ئەم سێ زەمیرە کە ئەلف و واو و یائن ئەم حەرفەی ئەمانەی لەسەرن حەرەکەداری دەکەن، کەواتە: مانیعی ئیدغام نین بەڵام هەندێك{ضمیر} وە{تَ، تُ، تِ}متحرك وە {ن}ی جەمعی -مؤنث- مانیعی ئیدغامن، وەکو لەمەو دوا باسی دەکەین، (**نحو مُدّ مُدّوا مُدّي**) ئێستا {مُدّ} کە ئەلفی -تثنية-ی پێوە لکاوە ئیدغام کراوە جا ئەگەر بە فەتحەی میمی بخوێنینەوە فعلی -ماضي-یە بەڵام ئەگەر بە -ضمة-ی بخوێنینەوە ئەوا ئەمری بە صیغەیە، {مَدوا} بۆ مەجهول -ماضي- دەبی کەوا واوی جەمعی -مذکر-ی پێوەیە و دەغم کراوە کە ئەسلەکەی {مَدَدوا} بوو وەکو{نصروا} ئەمەش دەتوانی بەفەتحەو -ضمة-ی میم بخوێنینەوە کە بۆ فعلی مەجهول ومەعلوم بەگوێرەی گۆڕانی میم -ماضي- وئەمری بەصیغە دەبی، {مُدّي} بوو موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەبە ئەمری بە صیغەیە ئەم {ی} ئیدغام نیيە بەڵکە ئیدغام کراوە،

**(لأن آخر المتجانسين في الكل متحرك)** ئیدغام لەم فعلانە واجبە چونکە ئاخیری حەرفی دووەم لەم دوو حەرفە هاو وێنانە حەرەکە دارە لەکاتی لکاندنی ئەم زەمیرانە **(فوجب الأدغام حيث وجد المقتضي)** کەواتە: واجبە ئیدغام چونکە ئەوەی کە ئیدغامی دەخوازی مەوجودە کە کۆبوونەوەی دوو حەرفی وەکو یەکە ود دووەمیان حەرەکە دارە **(ولا مانع)** واتە: لەهەر شوێن کە دەخوازی ئیدغام هەبێت وە هیچ رێگر و بەرگری نەبێت واجبە بکرێ. جا لێرەدا باسی یاسای واجب بوونی ئیدغام دەکات دەفەرمووێت **(وضابط وجوبه أن لا تفصل بين المتماثيلين وكانا في كلمة والثاني متحركاً ولا الحاق ولا لبس)** واتە: قانون ویاسای واجب بوونی ئیدغام ئەوانەنە: یەکەم: نابێت فصل هەبێت لەبەینی ئەم دوو حەرفە هاووێنە کەواتە: {زلزل} دەرچوو. دووەم: ئەم دوو حەرفە لەیەك وشە دابن کەواتە: {ضرب بكر} دەرچوو واجب نىیە. سێیەم: حەرفی دووەم متحرك بێت کەواتە: {لم يمدد} واجب نىیە . چوارەم: نابێت ئەم وشە بۆ {الحاق}بێت واتە: ئەم حەرفەی کە زیاد کراوە بوو{الحاق} بێت کەواتە: لە {جلبب}ی مەمنوعە چونکە مولحەقە بە {دحرج}ە. پێنجەم: نابێت ئیلتیباس رووبدات بە هیچ شتێك کەواتە: {مَدَداً} ئیدغام نابێت چونکە ئیلتیباس دەبێت بە{مدّ}ی فعلی -ماضي- کە ماناشیان جیاوازە {مدّ} واتە: رایکێشا، بەڵام {مَدَداً} واتە: زیادی، وەهەروەها {قووِل} کە مەجهولی {قاول}ە ئەگەر دەغم بکرێت ئیلتیباسی دەبێت بە بینا مەفعولی بابی تفعیل کە {قُوِّلَ}ە جا لەبەر ئەوە کە هەندێك شوێن هەن ئەم هەموو مەرجەی تێدایەو نەشکراوە، دەفەرمووێت **(وهذا الضابط لوجوب الأدغام أكثريّ)** واتە: ئەم یاسایە بۆ ئەنجام دانی ئیدغام زۆرەکەیە نەك گشتی بێت و بۆ هەمووشیان بێت **(إذ قليلا ما لا يدغم جامع هذه الشرائط)** بۆیە دەڵێم: عام نییە چونکە کەم جار وا دەبی کە ئەم هەموو مەرجەش هاتوونە جێو دەغمیش نەکراوە وەکو {إقتتل} یان وەکو {حَيِيَ} کە عين الفعل ود لام الفعل وەکو یەکن وە لەگەڵ ئەمەشدا واجب نییە دەغم بکرێت بەڵکو جائیزە، یەك دەڵێت: تۆ گووتت مەرج بوو بۆ ئیدغام کە نابێت

ئیلتیباس ببێت، ئەوەتە لەو فعلانە ئیلتیباس بووە؟ لە وەلامدا دەفەرمووێت (**ولا یلتبس في نحو مَدَّ وفَرَّ وعَضَّ**) ئیلتیباس نابێت لەم سێ فعلانە وە هاوێنەکانیان ئەگەرچی ئەمانە هەر یەکیان لە بابێکن، ئێستاش وەکو یەك هاتوونە بەرچاوان، چونکە هەڵبەتە قەرینەك هەیە لە یەکتریان جودا بکاتەوە (**لأن مَدَّ وفرَّ یعلم فتح عینهما من یَمُدُّ ویَفِرُّ**) چونکە دەزاندرێت کە {مَدَّ وفَرَّ} -ماضی- ەکەیان مەفتوحە بە -مضارع-ەکەیان دەزانم، بێگومان -مضارع- بۆ {مَدَّ}ەی کە -ماضی-ە -مضموم-ە وەکو {یمُدُ} جا -ماضی-ەکەش یان مەفتوحە {مَدَدَ} یان -مضموم- {مَدُدَ} یان مەکسورە {مَدِدَ} نابێ فعلی -ماضی- -مضموم- بێت چونکە هەردووك {مضموم} واتە -ماضی و مضارع مضموم- لە -مضاعف-ی نەهاتووە مەگەر بە شاز نەبێت، وە نابێ -ماضی-یەکە مەکسور بێ چونکە ئەم بابە هەر نەهاتووە -فَعِلَ یَفْعُلُ- لە هیچ شوێن مەگەر تەداخول بێت، کەواتە مەفتوح مایەوە وەکو {مَدَدَ یَمْدُدُ}. دووەم: {فَرَّ} بێگومان -مضارع-ەکەی مەکسورە {یَفِرُّ} جا -ماضی-ەکەی یان مەکسورە {فَرِرَ} ئەمەش نابێت چونکە هەرۆدووك مەکسور لە -مضاعف- نابێت، یان -مضموم-ە {فَرُرَ} ئەمەش لە هیچ شوێنەك نەبووە واتە {فَعُلَ یَفعِلُ} کەواتە تەنها فەتحەی بۆ مایەوە، واتە {فَرَرَ} جا {مَدَّ} لە بابی ئەوەلە {مَدَدَ یَمْدُدُ} وەکو {نصر}، وە {فَرَّ} لە بابی دووەمە {فَرَرَ یَفْرِرُ} (**لأن المضاعف لایجئ من فَعُلَ یَفْعُلُ بالضم فیهما ولا من فَعِلَ یَفْعِلُ بالکسر فیهما**) واتە: کە -مضارع- عین الفعلی -مضموم- لە {مَدَّ یَمُدُّ} زاندرا کە -ماضی- لەودا -مضموم- نییە چونکە ئەم جۆرە بابە لە -مضاعف- نابێت، وە -ماضی- مەکسورو -مضارع -مضموم- ئەمەشیان نییە مەگەر تەداخول نەبێت، {فَرَّ} بە هۆی {یَفِرُّ} کە مەکسورە زاندرا، نابێت {فَرَّ} مەکسور بێت چونکە هەردووك مەکسور لە -مضاعف-دا نابێت {فَرَّ یَفِرُّ} وە -مضموم-یش لێرەدا بۆ -ماضی- هەرنابێت {فَرُرَ یَفْرِرِ} چونکە ئەم نەوعە لە هیچ شوێن نەهاتووە مەگەر بە شاز (**ویعلم کسر عین عَضَّ من یَعَضُّ بالفتح لأنه لایجئُ المضاعف من**

**فَعَلَ يَفْعَلُ بالفتح فيهما كذا في المراح**) واتە: دەزاندرێت کە {عَضَّ} -ماضی- ەکەی مەکسور العینە بە هۆی -مضارع-ەکەی، چونکە بێگومان -مضارع-ەکەی مەفتوح العینەو لە بابی چوارەمە وەکو {يَعَضُّ} جا ئەم -ماضی-یەش یان مەفتوح العینە {عَضَضَ} ئەمەش لە -مضعف- نەهاتووە وەکو خۆی گووتی، یان {مضموم العين}ە واتە {عَضُضَ يَعْضَضُ} ئەمەش بە هەمان شێوە هەر نەهاتووە لە هیچ شوێنەك، کەواتە دەرکەوت کە -ماضی- مەکسور العینە ئە بەم شێوەیە مەراح فەرموویەتی کە کتابێکی صەرفیە لە وشەی {ولا يلتبس} تاکو ئەم جێگایە لە مەراحی نەقل کراوە، لێرەدا باسی واجب تەواو بوو. هاتە سەر باسی ئیدغامی مەمنوع واتە قەدەغە، وە فەرمووی (**وممتنع في نحو مَدَدْتُ ومَدَدْنا**) ئیدغام قەدەغەیە لە کاتێك کە -ضمیر-ی مەرفوعی موتەحەریکی بارز لکا بە فعل، وەکو {مَدَدْتُ ومددْنا} بۆ هەردووك متكلم، یان فعلی -ماضی- موخاتەب بۆ شەش میسالەکان وەکو (**مددْتَ إلى مَدَدْتُنَّ**) تەواوەکان ئەمانەن {مَدَدْتَ مَدَدْتُما مَدَدْتُم مَدَدْتِ مَدَدْتُما مَدَدْتُنَّ} ئەم شەش میسالە کە هەموویان فعلی -ماضی- موخاتەبە سێ بۆ پیاوان وە سێ بۆ ژنان، هەموویان مەمنوعن لە ئیدغام لەگەڵ دوو موتەکەلیمەکان ئەوە بوون بە هەشت وە شەش میسالەکانی غائیبەکان ماون لەوان واجبە بکرێت تەنها لە جەمعی -مؤنث-ی غائیب قەدەغەیە، هەروەکو بە خۆی هێناویەتیو فەرموویەتی (**ومَدَدْنَ**) ئەم جەمعی -مؤنث- غائیبە لە -ماضی- ئیدغام لەوی قەدەغەیە، بەڵام لە پێنج میسالەکانی دیکە وەکو {مَدَّ مَدّا مَدُّوا} ئەم سێ -مذكر-ە غائیبە {مَدَّتْ مَدَّتا} ئەمەش موفرەدو -تثنية مؤنث- غائیبن کە هەموویان -ماضی-نە، وە لە -مضارع-ەکانیش هەرچی نونی جەمعی -مؤنث-ی پێوە لکاوە قەدەغەیە وەکو دەڵێ (**ويمدُدْن وتمدُدْن وأمدُدْن ولا تمدُدْن**) ئەم چوار میسالە هەموویان جەمعی -مؤنث-ی یەکەم غائیب و دووەم موخاتەبە کە هەردوکیان -مضارع-ن {وأمددن} ئەمری بەصیغەیە، {ولا تمددن}نەهییە لەهیچیان دەغم نەکراوە (**لأن هذه الضمائر المتحركة أوجبت سكون**

**ماقبلها)** واتە: ئیدغام لەمانە مەمنوعە چونکە ئەم زەمیرە مەرفوعە موتەحەریکانە واجبیان کردووە کە حەرفی پێش خۆیان ساکین بێت، مەرجیشە بۆ ئیدغام یەکەم ساکین بێت وە، دووەم موتەحەریك بێت، وەناشکرێت چارەسەری بکەین وەکو -مضارع-ی مەجزوم بەم شێوەیە هی دووەم تەحریك بکەین، کەواتە: دەبێت ئەوها بمێنێتەوە، ئیدغامی مەمنوع تەواو بوو. جا باسی ئیدغامی جائیز دەکەین دەفەرمووێت **(وجائز إذا دخل الجازم علي فعل الواحد والغائبة)** ئەمە عەتفە بەسەر مومتەنیع واتە ئیدغام دروستە نەواجبەو نە قەدەغەیە لەکاتێك کە عامیلی جازم بخرێتە سەر فعلی -مضارع- بۆ موفرەدی -مذکر- جاغائیب یان موخاتەب وەهەروەها موفرەدی -مؤنث- غائبە لەگەڵ هەردووك موتەکەلیمەکان لەم پێنج شوێنانە ئیدغام دروستە، تۆ دەزانیت کەهەموو فیعلێك چواردە میسالی هەیە، جالەم پێنج میسالە دروستە وە لەحەوت میسالیش واجبە کە چوار -تثنية- و دوو جەمعی -مِذکر- موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەب وە لە دوو میسالیش قەدەغەیە، کە هەردووکیان جەمعی -مؤنث-ن غائیب و موخاتەب ئەمە بوونە چواردە، وەلەم پێنج میسالەش کە ئیدغام دروستە واتە بیکەی وە نەشی کەی هەر دروستە ئەمە لەسەر بۆچوونی هەندێك لەزانایان ئەگینا تەمیمی دەڵێن لەوانەش واجبە، وەحیجازیش دەڵێن قەدەغەیە، بەڵام هەندێك دەڵێن دروستە کە مصنیف یەکە لەوانە. جا یەکێك پرسیار دەکات و دەڵێت: چۆن ئیدغام لێرە دەکرێت خۆ مەرجی لێ نەهاتۆتە جێ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرمووێت **(بتحريك الساكن)** واتە: دەتوانین ساکینەکەی حەرەکە دار بکەین و حەرەکە داریش ساکین بکەین وەکو {لم يمدُدْ} ئێستا یەکەم موتەحەریك و دووەم ساکینە، یاسای ئیدغام بەپێچەوانەیە بەناچاری دالی یەکەم ساکین بکە {التقاءالساكنين} دەبێت و دالی دووەم تەحریك بکەودەغمی بکە لەدووەمی. یەکێك پرسیار دەکات و دەڵێت: بۆچی لە {مدَدْتَ، مدَدْتُ، مدَدْتِ} بەم شێوەیە ئیدغام ناکرێت؟ ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت: **(ولم يحرك في نحو مدَدْت وإن كان سكونه عارضا أيضاً)** واتە: ساکینی دووەم حەرەکە دار نەکرا لە

{مدَدْت}و هاووێنەکانی، ئەگەر چی سکونی دالی {مدَدْتُ}وش -عارضيە- لەلا هاتووە بەهۆی {ت}ی زەمیر هەروەکو سکونی دالی {لم يمدُدْ} -عارضيە- بەهۆی {لم}ی جازمە پەیدابووە (**لأن إسكان ماقبل هذه الضمائر ليدل علي إنها كالجزء فلا يفوت**) واتە: سکونی {مددت} زۆر جیاوازە لەگەڵ سکونی {لم يمدد} چونکە ساکین کردنی حەرفی پێش ئەم زەمیرانە، بۆ ئەوەیە کە ئەم سکونە دەلالەت بکات لەسەر ئەمە کە ئەم زەمیرانە وەك پارچەك و حەرفەك وانە لەم وشانە، جا کەواتە ئەم سکونە دەبێت بمێنێت و نابێ بفەوتێت بەلاّم سکونی {لم يمدد} بەم شێوە نیيە بش فەوتێت هیچ نابێت. (**وأيضاً لما كان السكون لأتصال ماهو كالجزء كان كأنه من تمام البنية وأصل**) واتە: لەبەر ئەم بەڵگەی کە گووتمان. دووەم بەڵگە وە ئەکاتێك کەسکونی ئەم حەرفەی کە لەپێش ئەم زەمیرانە کە دالە بۆ لکاندن و پێوە ناندنی شتێکە کە وەکو {جوزء} وایە لەم وشەیە کە فاعیلە، ئەم سکونە وای لێهات کە خۆی ئەسلەو تەواوی بینایە لەم وشەیە هەر وەکو حروفەکانی ئەسلی سکونیان هەیە وەبە ئەسل دەژمێردرێت ئەوەش بەم شێوە حیسابی بۆ دەکرێت کە ئەسلە، وەکو سکونی زەیدی وایە، بەڵێ لە دەلیلی یەکەم وتی ئەسل نیيە بەلاّم وەکو ئەسل وایە بەلاّم ئەم جارە حیسابی ئەسلە وەزعی بۆ دەکات وە لەپێش تر وتمان بۆیە ساکین کراپێش ئەم زەمیرە، تاوەکو {توالي} چوار حەردکە لەدوای یەکتر نەبێت دیارە ئەم زەمیرانە بەپارچەیەك دەژمێردرێن لەم وشەیە دا ئەمەش بەڵگەیە بۆ زەمیری مەنصوبەکە حەرفی پێش خۆی ساکین ناکرێت، وەکو {ضَرَبَك} چونکە ئەم کافە {كالجزء} نیە ئەم فعلە -مضارع-ەی کەجازمی دەخرێتە سەر سێ جۆرە: عەین الفعلی یان مەفتوحە یان مەکسورە یان -مضموم-ە. جا فەرمووی (**فأن كان مكسور العين كيفر أو مفتوح كيعض فتقول لم يفر ولم يعض بكسر اللام وفتحها**) ئەگەر ئەم فعلە -مضارع-ەی کە عامیلی جازمی بخەینە سەر، مەکسور العین وەکو {يَفِرُّ} کە لەبابی دووەمە یان مەفتوح العین بوو وەکو {يعض} کەلەبابی چوارەمە. تۆ دەڵێیت: {لم يفرِ ولم يعضِ} بەکەسرەی لام الفعل {ولم يفرَ ولم يعضَ} بە

فەتحەی لام الفعل (**ولم يفرِرْ ولم يعضَضْ بالفك على لغة الحجازيين**) وەدروستیشە بڵێیت: {لم يفرِرْ ولم يعضَضْ} بەکردنەوەی ئیدغام ئەمەش لەسەر زاراوەی حیجازییەکان، چونکە تەمیمیەکان گووتیان ئیدغام لێرەش واجبە (**وعليها يلحق الأبدال والحذف**) هەر لەسەر زاراوەی حیجازییەکان دەتوانین ئیبدالی حەزفیش بهێنینە سەر -مضارع-ی مەجزوم وەکو {لم يفرِ ولم يعْضَ} حەرفی ئاخیری کراوە بە {ی} جا دەتوانیت حەزفی بکەیت وەکو گووتمان دەشتوانی بیهێڵیتەوە. (**وهكذا حكم يقْشَعِرُّ ويَحْمرُّ ويحمارّ**) هەروەکو -مضاعف-ی ئیستیلاحی وایە حوکمی ئەم وشانە کە -مضاعفي- ئیستیلاحی نینە، بەڵام حەرفی ئاخیریان مەکروهە وەکو {يقشعِرُّ} ئەمە روباعی مەزید فیە {يحمرّ ويحمارّ} ئەم دوانەش -ثلاثي- مەزیدوفیە جا دروستە بڵێین {لم يقشعِرِ، لم يقشعِرَّ} بە فەتحەو کەسرەی ئاخیری، {ولم يقشَعْرِرْ} بەفەکی ئیدغام ئەوانی دیکەش بەهەمان شێوەن، بەڵێ ئەم -مضارع-ەی کە عەین الفعلی بەم شێوەیە بوو کە گووتمان. ئەم جارە نۆرەی -مضارعي مضموم العين-ە (**وإن كان العين مضموماً فيجوز الحركات الثلاثي مع الإدغام**) وە ئەگەر عين الفعل -مضموم- بێت لە -مضارع-ی مەجزوم دروستە لەم فعلە -مضارع-ەدا هەرسێ حەرەکە، واتە فەتحەو کەسرەو -ضمة- لە کاتی دەغم کردن (**وفكه**) وە دروستە فەکی ئیدغامیش، کەواتە لە -مضارع- مضموم العين- چوار لۆغەت دروستن، ئەوانی دیکە تەنها سێ لۆغەتیان تێدا دروست بوون (**فتقول لم يَمُدِّ بحركات الدال ولم يَمْدُدْ بالفك**) تۆ دەڵێیت: لە فعلی -مضارعی مضموم العين- لە کاتی عاملی جازمی بخەیتە سەر {لم يَمُدُّ} بە هەرسێك حەرەکەی دالی، وە دروستیشە {لم يَمْدُدْ } بە کردنەوەی ئیدغام (**وهكذا حكم الأمر**) بە میسلی فعلی -مضارع مجزوم- وایە حوکمی ئەمری بە صیغە، لە هەر -مضارع- کە سێ وەجهـ دروست بێت ئەو بە هەمان شێوە لە فعلی ئەمری بە صیغەش سێ جۆری دروستن، وە ئەگەر چوار جۆری دروست بن ئەوە لە فعلی ئەمریش بە هەمان شێوە چوار جۆری دروستن (**فتقول فَرَّ وعَضِّ بكسر اللام وفتحها**) دروستە {فَرِّ وعَضِّ} بە کەسرەو

فەتحەی لام الفعل لە هەردوکیان بەڵام فائوالفعل لە یەکەمیان هەر مەکسورە وە لە دووەمیان هەر مەفتوحە (**وإفْرِرْ وإعْضَضْ بالفك**) وە دروستیشە {إفرِرْ} وەکو {إضْرِبْ} وە هەروەها {إعْضَضْ} وەکو {إعْلَمْ} بە فەکی ئیدغام ئەمە سێ لوغەتەکەیان وەکو فعلەکەی خۆیان (**مُدِّ بحركات الدال وأُمْدُدْ بالفك**) تۆ دەڵێیت لە بینای ئەمری بە صیغە لە فعلی -مضارع مضموم- {مَدُّ} بە هەرسێ حەرەکەی دالەکە، وە دەشتوانی بڵێی {أُمْدُدْ} بە کردنەوەی ئیدغام لەسەر لۆغەتی حیجازیەکان، ئەی قوتابی بەڕێز بۆ ئیعلالی ئەم هەموو صیغە جۆراو جۆرانە سەیری کتێبی شەرحی مامۆستا مەلا عبد الكريم بکە بە کوردی کە لەوێ ئیعلال کراون. جا هاتە سەر باسی ئیسمی فاعیل و مەفعول لە -مضاعف- فەرمووی (**وتقول في إسم الفاعل مادٌّ مادّانِ مادُّونَ**) تۆ دەڵێی لە ئیسمی فاعیلی -مضاعف-ی -ثلاثی مجرد- {مادٌّ} ئەصلەکەی {مادِدٌ} بوو وەکو {ناصِرٌ} حەزفی حەرەکەی دالی ئەوەڵمان کردو دەغممان کرد بوو بە {مادٌّ} لێرەدا بە یەکگەیشتنی دوو ساکینان لەسەر حەدی خۆیەو دروستە، {مادّانِ} ئەمەش -تثنية-یە لە حالەتی رەفعە {مادَّيْنِ} ئەمەش لە هەردوو حالەتی نەصبەو جەررەیە، {مادّونَ} ئەمەش جەمعی -مذكر-انە لە حالەتی رەفعە، {مادّيْنَ} ئەمەش لە هەردوو حالەتی نەصبەو جەردیە، وە ئیعلالی هەمووان ئاسانە، وە جەمعی تەکسیری هەشت وەزنی هەیە وەکو جەمعی سالم کە ئەمانەنە (**مُدّادٌ**) بە -ضمة-ی میمو شەددەی دالی لەگەڵ ئەلفی وەکو {نُصّار} (**مُدَّدٌ**) بە -ضمة-ی میم و دالی بە شەددە وەکو {نُصَّرٌ} (**مَدَدَةٌ**) بە سێ فەتحەی لە دوای یەك وەکو {نَصَرَةٌ} (**مُدٌّ**) بە -ضمة-ی میم و شەددەی دالی وەکو {نُصْرٌ} (**مُدّان**) بە -ضمة-ی میم و شەددەی دالی لەگەڵ ئەلف و نون وەکو {نُصْران} (**مِدادٌ**) بە کەسرەی میم و ئەلفی زیاد لە نێوان هەردووك دال وەکو {نِصار} (**مُدُود**) بە دوو -ضمة- لەگەڵ واوێکی زیاد لە نێوان هەردووك دالەکە وەکو {نُصُور} (**مُدَداء**)بە -ضمة-ی میم و فەتحەی هەردووك دالەکان وە ئەلفی مەمدودە وەکو {نُصَراء} ئەمانە هەموویان بۆ -مذكر- بوون، ئەمجارە دێتە سەر

باسی -مؤنث-ان (**مادَّةٌ مادّتانِ مادَّتَيْنِ مادّاتٌ**) ئەمانەش بۆ -مؤنث-ان -تثنية-و جەمعی سالم لە هەمووان نیشانەی -مؤنث و تثنية-و جەمعیان بۆ زیاد بکە، وە دالیش لە دالی دەغم بکە تەواوە وەکو {ناصِرة ناصِرتانِ ناصِرَتَيْنِ ناصِراتٌ} (**مَوادٌّ**) ئەمەش جەمعی تەکسیری -مؤنث-انە، ئەصلەکەی {مادّة}بوو ئەلفی تەکسیرمان زیاد کرد لە پاش ئەلفی ئیسمی فاعیل ئیلتیقائو الساكئين لە نێوان هەردووك ئەلف روویدا جا ئەلفی ئیسمی فاعیل قەلب کرا بە واو پاشان حەزفی تائی تەئنیسمان کرد چونکە ئەم صیغە تایبەتە بە -مؤنث-ان بوو بە {مَوادٌّ} وەکو {حوائض} (**واسم المفعول مَمْدود كمنصور**) یانی تۆ دەڵێیت لە بینا کردنی ئیسمی مەفعول لە -ثلاثی مجرد مضاعف- **لە** بابی یەکەم {ممدود} وەکو منصور ئەمە وەکو سالم وایە ئیدغام نەکراوە چونکە واو لە نێوانیانە ئەمە میسالی موفرەدی موزەکەرە {ممدودان ممدودون هتد} هیچیان دەغم ناکرێن، ئەمانە ئیسمی فاعیل و مەفعول بوون لە -ثلاثی مجرد- بەڵام ئەمانە -واتە ئیسمی فاعیل هتد- لە -ثلاثی مزید فیه ورباعی مضاعف-ی غەیرە ئیصتیلاحی ئەمانە هەروەکو فعلی -مضارع-ی خۆیانن، لە هەر شوێنەك -مضارع-ەکەیان دەغم بکرێت ئەمانیش بە هەمان شێوە دەغم دەکرێن وەکو {محمرٌّ ومقشَعرٌّ}، بەڵام لە رباعی -مضاعف- ئیصتیلاحی وەکو {مزلزل} ئیدغام ناکرێ چونکە هەموو کات فەصل لە نێوان ئەو دوو حەرفانە پەیدا بوو کە لە وێنەی یەکن.

قوتابی بەڕێز: ئەمەی دێت فائیدەیەکە کە مصنف رەحمەتی خودای لێ بێت لەسەر ئەصلەکەی زەنجانی زیادی کردووە، دەفەرموویێت (**واعلم أن حَبَّ إن كان مضموم العين فيهما يجئ منه الصفة المشبهة على فَعِيلٍ**) بزانە بەڕاستی وشەی {حَبَّ} کە فعلی -ماضی-یەو -مضاعف-ە ئەگەر بە -ضمة-ی عین الفعل بێت لە -ماضی ومضارع- واتە {حَبُبَ يَحْبُبُ}لە بابی شەشەم صیفەتی موشەبەهەی لێ دروست دەکرێلەسەر وەزنی فەعیل بۆ -مذکران، وە بۆ -مؤنث-ان تائی بۆ زیاد دەکرێت (**كحَبيب حَبيبنِ حَبيبونَ**) ئەمانە موفرەدو -تەثنية-و جەمعی سالم بوون

میسالی دوو متکلمەکانن (**ولم یَخَفْ لم یَخافا الخ**) بە هەمان شێوە {لم یخف} فعلی -مضارع-ە لە بابی چوارەمەو هەروەها واوییە، ئەصلەکەی {یخاف} بوو کە عامیلی جازم هات لام الفعلی ساکین کرد جا التقائوالساکنین لە نێوان ئەو ئەلفەی کە کاتی خۆی واو بووە لەگەڵ لام الفعلەکەی کە فاتە پاشان حەزفی ئەلفەکەمان کرد بوو بە {لم یَخَفْ} لەسەر وەزنی {لم یَفَلْ} جا هەتا چواردە میسال تەواو دەبێت برۆ دوای، ئەنجا هەریەکە کە دروستت کرد تەماشای حەرفی دوای عین الفعلەکە بکە ئەگەر ساکین بوو ئەوە حەزفی عین الفعلەکە بکە کە ئەلفە، ئەگینا با وەکو خۆی بمێنێ (**وقس علیه الأمر**) واتە سەرجەم ئەمرەکان قیاس بکەوە سەر فعلی - مضارع-ی مەجزوم، جا لە هەر شوێنەك عین الفعلەکە لە -مضارع-ی بمێنێ ئەوە لە ئەمرەکانیشیان دەمێنێ، وە هەر شوێنەك لە -مضارع-ی بڕوات ئەوە لە ئەمرەکەشی بە هەمان شێوە دەڕوات (**نحو صُنْ صونا صونوا**) ئەمانە ئەمری بە صیغەن لە بابی یەکەم لە ئەجوەفی موفرەدو -تثنیة-و **جەمع** بۆ -مذکر-ی موخاتەب، {صُنْ} ئەصلەکەی {تَصُونُ} بوو حەرفی -مضارع-مان لابردوو ئاخیرمان مەجزوم کرد جا التقائوالساکنین پەیدا بوو لە نێوان عین الفعل و لام الفعل، جا حەزفی عین الفعل کرا بوو بە {صُنْ} لێرەدا واو نەماوە چونکە مابعدەکەی ساکینە، {صونا} ئەمەش - تثنیة-یە واو ماوە، {صونوا} ئەمەش جەمعە واو هەرماوە چونکە مابعدەکەیان متحرکە (**صونی صونا صُنَّ**) ئەمانەش نمونەی -موفرەدو تثنیة- وجەمعی - مؤنث- موخاتەبانن، لە {صونی صونا} واو هێشتا هەرماوە، بەڵام لە {صُنَّ}ی نەماوە، بەڵام نەمانەکەی لەبەر ئەمری نییە بەڵکو لەبەر نونی جەمعی -مؤنث-انە، پاشان نونی لام الفعل لە نونی جەمعی دەغم کرا بوو بە {صُنَّ} واتە ئەی کۆمەڵەی ئافرەتان ئەم شتە بپارێزن (**وبالتأکید بالثقیلة صونَنَّ بإعادة العین لزوال علةالحذف**) تۆ دەڵێیت لە کاتی تەئکیدکردنی ئەمری بە صیغە بە نونی گران {صُونَنَّ} بۆ موفرەدی -مذکر-ی موخاتەب، پێشان ئەصلەکەی {صُنْ} بوو بە بێ واو کە تەئکید کرا بەم نونە حەرفی پێشە خۆی مەفتوح کرد کە نونی لام الفعلە جا

واو کە عین الفعلە گەڕاوە چونکە حەرفی پاشە خۆی حەرەکەدار بوو (**صونانِّ**) پێشان {صونا} بوو کە تەئکید کرا بوو بە {صونانِّ} واوەکە وەکو خۆی هەرماوە (**صُونُنَّ**) ئەمەش بۆ جەمعی -مذکر-ی موخاتەبە، ئەصلەکەی {صونوا} بوو واوی یەکەم عین الفعلە وە واوی دووەمیش جەمعە کە تەئکید کرا التقائوالساکنین پەیدا بوو لە بەینی واوی جەمعیو نونی تەئکید چونکە نونی گران نونەکی ساکینی تێدا دەغم کراوە جا حەزفی واوی -ضمیر-مان کرد هەرچەندە فاعیلیشە، بەڵام -ضمة-ی لام الفعل دەلالەتی لەسەر دەکات (**صونِنَّ**) ئەمەش موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەبە، کە تەئکید کرا التقائوالساکنین لە نێوان یائی موفرەدی -مؤنث-و نونی تەئکیدی مودەغەم جا حەزفی یائەکە کرا بوو بە {صونِنَّ} (**صونانِّ**) وەکو خۆیەتی (**صُنَّانِّ**) ئەمەش جەمعی -مؤنث-ی موخاتەبانە بە چوار نون، یەکەم لام الفعلە دووەم نونی جەمعە وە نونی گرانیش بە دوو نون حیساب دەکرێت، ئەصلەکەی {صُنَّ} بوو پاشان تەئکید کرا بوو {صُنَّنِّ} پاشان ئەلفەکمان زیاد کرد لە نێوان نونی جەمع و نونی تەئکید بوو بە {صُنَّانِّ} (**وبالخفيفة صونَنْ**) واو هاتەوە (**صونُنْ**) واوی جەمعی حەزفکرا چونکە -ضمة-ی لە شوێن ماوە، ئەمە موفرەدو جەمع وە نونی خەفیفە بۆ -تثنية- نابێت (**صونِنْ**) ئەمەش بۆ موفرەدی -مؤنث-ی موخاتەب یائی لێ حەزفکراوە چونکە کەسرە دەلالەتی لەسەر دەکات، میسالی -تثنية-و جەمعی -مؤنث- نییە لە خەفیفەدا (**بِعْ بيعا بيعوا**) ئەمانەش ئەمری بە صیغەن لە ئەجوەفی یائی لە بابی دووەم، ئەصلەکەیان {تبيع تبيعان تبيعون} بووە موفرەدو -تثنية-و جەمع بۆ -مذکر-ی موخاتەب {بيعي بيعا بِعْنَ} ئەمانەش بۆ -مؤنث- موفرەدو -تثنية-و جەمع، ئەصلەکەیان {تبيعين تبيعان تبيعن} تەماشا بکە هەر میسالك مابعدی یائی متحرك بوو ئەوە بیهێڵەوە، ئەوەش کە مایعدی ساکین بوو تۆ حەزفی بکە (**وخَفْ خافا خافوا الخ**) {خافي خافا خفن} ئەمانەش شەش میسال بۆ ئەمری بە صیغە لە بابی چوارەمی واوی سێیانیان بۆ نێرینەو سێیانیان بۆ مێینەکان، ئەصلەکەیان {تخاف تخافان تخافون تخافين تخافان تخفن} جا

تەماشای حەرفی پاش ئەلفی بکە کە عین الفعلەو کاتی خۆی واو بووە ئەگەر حەرفی پاش خۆی کە لام الفعلە ساکین بوو ئەوە لای بەرە وە ئەگەر ساکین نەبوو بیهێڵەوە **(وبالتأكيد بيعَنَّ وخافَنَّ)** تۆ دەڵێیت لە کاتی تەئکید کردنی فعلی ئەمری بە صیغە لە {تبيع وتخاف} {بيعَنَّ وخافَنَّ} بە هێنانەوەی عین الفعل لە هەردووکیان کە یائو ئەلفە چونکە هۆی حەزفکردن سکونی لام الفعل بوو ئەویش نەما چونکە نونی تەئکید حەرفی پێشە خۆی حەرەکەدار دەکات. یەکێك رەخنە دەگرێت و دەڵێت: تۆ گووتت هەرکاتێك حەرفی پاش عین الفعل حەرەکەدار بوو ئەم مەحزوفە کە عین الفعلە دەگەڕێتەوە، کەچی لە {صُنِ الشَّئَ هتد} لەگەڵ ئەوەشدا کە دوای عین الفعلی حەرەکەدارە هەر نەگەڕاوەتەوە؟ ئەمیش وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە **(ولا تعاد في صُنِ الشَّئ وبعِ الْفرسَ وخفِ الْقومَ)** واتە عینیالفعل نەهێنراوەتەو لە {صُنِ الشئ} کە واوە، وە لە {بع الفرس} کە یائە، وە لە {خف القوم} کە ئەلفە کە رۆیشتبوو لەبەر التقائوالساکنین لەگەڵ حەرفی دوای خۆی کە لام الفعلە پاشان ئەم لام الفعلە تەحریك کرا لەبەر التقائوالساکنین لەگەڵ حەرفی دوای خۆی کە لامی {الشئ، القوم، الفرس} بوو، بەڵام کە ئەم عین الفعلە نەهاتۆتەوە **(لعدم الإعتداد بالحركة العارضة)** چونکە حەرەکەی ئەم لام الفعلە عاریزیەو لەلاوە هاتووە وە ئیعتیبار بە حەرەکەی لەلاراهاتوو ناکرێت، وە ئەم مەحزوفە ئەم حەرەکەیەی تازە هاتوو ناگەڕێتەوە، واتە: دروست نییە بڵێیت {بيع الفرس وخاف القوم} بە گێڕانەوەی عین الفعل. جا یەکێك دەڵێت: ئەی بۆ لەگەڵ نونی تەئکید مەحزوف هاتۆتەوە وەکو {صونَنَّ} ؟ بۆ حەرەکەی نون ئیعتیباری پێدەکرێت؟ ئەمیش لە وەڵامدا دەفەرموویت **(واعتدوا بالحركات مع نون التأكيد في الوحدات)** واتە صەرفیەکان بایەخیان بۆ ئەو حەرەکانە کردووە کە لەگەڵ نونی تەوکید پەیدا دەبن لە موفرەدەکان وەکو {صونَنَّ} ئێستا ئەم نونە تەوکیدە لەسەر ئەم میسالەیە کە موفرەدی -مذکر-ی موخاتەبە نونی لام الفعلی حەرەکەدار کردووە وە ئیعتیبار بەم حەرەکەیە کراوە، وە مەحزوف کە واوە هاتۆتەوە **(لأنها مع غير الضمير البارز كالمتصل الذي هو**

**ألف الضمير في عود المحذوف معه)** چونکە نونی تەئکیدی لە کاتێك کە لەگەڵ -ضمیر-ی غەیرە باریز دایە، واتە لەگەڵ -ضمیر- مستتر دایە وەکو {صونَنَّ} ئەم نونە لەوکاتەی وەکو ئەم -ضمیر-ە متصلە وایە کە ئەلفی -تثنية-یە بۆ گێڕانەوەی ئەم مەحزوفە لەگەڵ خۆی، یانی چۆن ئەلفی -تثنية- مەحزوفی دەگێڕێتەوە وەکو {صُونا} بە هەمان شێوە نونی تەئکیدیش لەگەڵ -ضمیر-ی مستترە ئەوهایەو مەحزوفی دەگێڕێتەوە وەکو {صونَنَّ} **(وكالمنفصل مع البارز)** واتە نونی تەئکید ئەگەر لەگەڵ -ضمیر-ی باریزە دابوو مەحزوفەکەی پێناگەڕێتەوە چونکە ئەم نونە وەکو {الشئ} منفصل و سەربەخۆو جیایە، ئێستا لە {صُنِ الشَّئ...} ئەم حەرەکەیە مەحزوفی نەگێڕاوەتەوە جا نونی تەئکیدیش لەگەڵ -ضمیر-ی باریزدا ئەوهایەو مەحزوفی ناگێڕێتەوە **(ومن ثم لم يعد اللام في نحو لاتَخْشَوُنَّ)** واتە لەبەر ئەوەی کە نونی تەئکید لەگەڵ -ضمیر-ی باریزەدا مەحزوفی ناگێڕێتەوە چونکە وەکو منفصل وایە لام الفعل نەهاتۆتەوە لە {لاتَخْشَوُنَّ}ەی کە کاتی خۆی لام الفعلی خۆی کە {ی} بوو کرابووە ئەلف چونکە ئەصلەکەی {تخشیون} بوو یائی کراوە بە ئەلف وە ئەلفیش حەزفکرابوو لەبەر إلتقائوالساکنین وە ئێستاکە کە نونی تەئکیدی پێوە لکاوە ئەم مەحزوفەی نەهێناوەتەوە، وە نابێت بڵێیت {لا تخشاون} چونکە نونی تەئکید لێرە لەگەڵ -ضمیر-ی باریزە دایە کە واوی جەمعی -مذکر-ە وەکو شتی سەربەخۆ وایە **(وبالحركات مع الضمائر المتصلة)** ئەمە عەتفە بەسەر {بالحرکات} واتە صەرفیەکان ئیعتیباریان کردووە بەو حەرەکاتانەی کە پەیدا دەبن بەهۆی ئەو -ضمیر-ە متصلانەی کە ئەلف و واوو یائن، واتە ئەم حەرەکەی بەهۆی ئەوان پەیدا دەبێ مەحزوفی پێ دەگەڕێتەوە **(كصونا صونوا صوني)** ئێستا واو هاتۆتەوە لەم سێ شوێنە لەگەڵ ئەلفی -ضمیر- لە {صونا}ی، وە هەروەها لەگەڵ واوی صونوا، وە هەروەها لەگەڵ یائی صونی، ئەمانە هەرسێکیان إعادەی مەحزوفیان کردۆتەوە.

**روونکردنەوە :**

ئێرە پێویستی بە درێژتر هەیە، بەڵێ نونی تەئکید یان لەگەڵ -ضمیر-ی مستتر دایە یان لەگەڵ -ضمیر-ی باریزە واتە (دیار)دایە، جا ئەگەر لەگەڵ مستتر دابوو مەحزوفی دەهێنێتەوە وەکو {صونَنَّ}، وە ئەگەر لەگەڵ باریزە دابوو ئەوا نای گێڕێتەوە وەکو {لا تَخْشَوُنَّ} لێرە ئەلفی نەگێڕاوەتەوە چونکە لەگەڵ باریزەی دایە کە واوە، چونکە وەکو شتی جیاو منفصل وایە وەکو {بِع الْفرسَ} جا فەرمووی وە {هو ألف الضمیر} دیارە واو {ي} لە هەموو شوێنێك ناهێتەوە، بەڵێ ئەوان لە معتل اللام مەحزوفی ناگێڕنەوەو وەکو {أغزوا} جەمعە {أغزی} موفرەدی -مؤنث-ە لەم دوو شوێنە هەر یەکەو واوێکی نەماوە، واو لەگەڵ {ي} نەیانگێڕاوەتەوە، بەڵام بیکە بە -تثنیة- وەکو {أغزوا} ئەمە -تثنیة-یە لێرە واو هاتۆتەوە، ئەمە یەك. دووەم: ئەلفیش لەگەڵ -تاء التأنیث- مەحزوفی ناگێڕێتەوە وەکو {صانتا} کەس ناڵێت {صاناتا} وە {رَمَتا} کەس ناڵێت {رَماتا}. (**لأنها لما كانت كالجزء كانت الحركة الحاصلة لأجلها كالأصلية**) واتە لەبەر ئەوەی کە ئەو -ضمیر-انە وەکو پارچە وانە لەم وشەیە وە ئەم حەرەکەی بە هۆی ئەوانیش پەیدا دەبێ وەکو ئەصڵ بێت وایە، واتە حیسابی عاریزی بۆ ئەم حەرەکانە ناکرێ، وە مەحزوفەکە لەگەڵیان دەگێڕدرێتەوە (**ومزید الثلاثی لا یعتل منه إلا أربعة أبنیة**) ئەمە عەتفە بەسەر {مجرد الثلاثی} لە لاپەڕە {٥٢}، واتە {ثلاثی مجرد} بەم شێوەیە بوو کە باسمان کرد، وە {ثلاثی مزید فیه} ئیعلال ناکرێ تەنها چوار باب نەبێت کە بابی إفعال و إستفعال و أنفعال وإفتعال (**وهی أجاب یجیب إجابة**) ئەوانەی کە ئیعلال دەکرێن یەکەمیان بابی إفعالە وەکو {أجاب} ئەصلەکەی {أجْوَبَ} بوو وەکو أکرم نەقلی حەرەکەی واومان کرد بۆ ماقبلەکەی جا واو ئێستا ساکین لە ئەصلدا متحرك ما قبل متحرك کردمانە ئەلف بوو بە {أجاب} ئیعلالەکەی بە نەقل و قەلبە {یُجِیبُ} ئەصلەکەی {یُجْوِبُ} بوو وەکو {یُکرِمُ} کەسرە لەسەر واو گران بوو نەقلمان کرد بۆ حەرفی پێش خۆی، جا واوی ساکین ماقبل مکسور قەلب کرا بە {ی} بوو بە

{يُجِيبُ}، {إِجابَة} مەصدەرە، ئەصلەکەی إجوابا بوو وەکو إکراما، فەتحەی واومان نەقل کرد بۆ جیمی واو ئێستا ساکین لە ئەصل متحرك ماقبل مفتوح کرا بە ئەلف، دوو ئەلف لەگەڵ کۆبوونەوە ئەلفی مەصدەرو ئەلفی قەلبکراو لە بری واو، إلتقائوالساکنین بوو حەزفی یەك لەم دوو ئەلفانە کرا پاشان بە عیوەز هێنا بوو بە إجابە (**واستقام يستقيم استقامة**) دووەم بابی إستفعالە وەکو {استقام ...هتد} ئەصلەکەی {إستقوم} بوو وەکو استخرج {يستقيم} ئەصلەکەی وەکو يستخرج {استقواماً} وەکو أستخراجا، وە ئیعلالەکەی وەکو إجابە وایە، یەکێك دەڵێ: خۆ ئەم دوو بابانە هۆیەکانی ئیعلالکردنیان لێ نەهاتۆنەتە جێ تۆ بۆچی ئیعلالت کردن؟ لە وەڵامدا دەفەرمووێ (**وأعلا وان لم يكن العين فيهما متحركا مفتوحا ماقبله حملاً على المجرد**) واتە: ئەم دوو بابە ئیعلالکران ئەگەرچی عين الفعل لەوان متحرکی ماقبل مفتوح نەبوو بەڵام بە حەمل وەسەر ئەصلەکەیان کە مجردەکانیانن کە جاب وقام بوون، چونکە مەرجی ئیعلال لە مجردەکان مەوجودە بەڵام لە مزیدەکانیان مەوجود نییە، ئێستا أجوب بەڵی واوی متحرکە بەڵام ماقبل مفتوح نییە ئەوەی دیکەش بە هەمان شێوە (**والمحذوف ألف المصدرية عند سيبويه والعين عند الأخفش**) بەڵێ گووتمان لە إجابە ئەلفێك حەزفکراوە بەڵام نازانم کامیانە، جا سیبویە وخلیل دەفەرموون حەزفکراوەکە ئەلفی مەصدەرییەیە نەك عين الفعل بێت چونکە ئەلفی مەصدەری زیادە ئەویتر ئەصلە، جا زیادەکە باشترە بۆ حەزفکردن. بەڵام ئەخفەش دەفەرمووێت: مەحزوفەکە عين الفعله چونکە ئەلفی مەصدەری نیشانەی مەصدەرییە نابێت لابچێت، جا ئێمە چەند جار گووتومانە میزان تابیعی مەوزونە لە حەزفدا، با بزانین لەسەر ئەم دوو رایە میزانی أجابە چییە؟ (**فالوزن إفَعْلة إستفَعْلة على الأول**) واتە: میزانی إجابە {إفعله}یە بە کەسرەی هەمزەییو فەتحەی فائولفعل و سکونی عين الفعل و فەتحەی لام الفعل، وە وەزنی إستقامة {إسْتِفَعْلَة}یە بە کەسرەی هەمزەو سکونی سین و وە کەسرەی تائو سکونی عين و فەتحەی لام، ئەمە لەسەر مەزهەبی سیبویە یە کە فەرمووی ئەلفی مەصدەر

حەزفکراوە وە حەرفە ئەصلەکان ماون (**وإفالة وأستفالة علي الثاني**) واتە میزانی {إجابة} {إفالة} بە حەزفی عەین چونکە لە مەوزونی عەینوالفعل لاچووە لە میزانیش بەهەمان شێوە وەوەزنی {إستقامة}{إستفالة} بە حەزفی عەین الفعله ئەمەش لەسەر بۆچوونی ئەخفەش رەحمەتی خوا لەهەمویان بێت. یەك دەڵێت تۆ گووتت بابی {إفعال وإستفعال} ئیعلال کردن ئێستا بۆ ئەوانە ئیعلال نەکراون، ئەویش دەفەرموویێت (**وشذَّ نحوَ أخيَل وأطيب ونحو استحوذ واستصوب**) ئەم چوار فعلەو هاووێنەکانیان شازن کە ئیعلال نەکراون موجەرەدەکانیان ئیعلال کراوە جا {أخيل وأطيت} بابی {إفعال}و یائیە، و{إستحوذ وإستصوب} بابی {إستفعال}ە وواوینە بەڵام لەم دووانە بیستراوە {إستحاذ وإستصاب} بەقیاس، (**وإنقاد ينقاد إنقياداً**) بابی سێهەم لەم چوار بابەی کە ئیعلال دەکرێن لە -ثلاثي- مەزید فیە بابی {إنفعال}ە وەکو إنقاد ئەصلەکەی إنقود بوو واو موتەحەریك ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف بوو بە إنقاد ئیعلالی ئەمە بەس بە قەلبە ينقاد ئەصلەکەی ينقود بوو وەکو ينكسر واو موتەحەریك ماقبل مەفتوح قەلب کرا بە ئەلف بوو بە ينقاد، {إنقياداً} مەصدەرە ئەصلەکەی {إنقواداً}بوو وەکو {إنكسارا} قەلبی واوەکەمان کرد بە {ي} بوو بە إنقيادا، یەك دەڵێت چۆن ئەم واوەت کرد بە {ي} ؟ جا دەفەرموویێت (**قلبت الواو ياءً لأن الواو المكسورة ما قبلها تقلب ياءً في المصادر لإعلال فعلها**) واتە: قەلبی واو کرا بە {ي} لە إنقوادا، چونکە قانونە واو لە مەصدەرەکان قەلب دەکرێتبە {ي} بە هاتنەدی دوو مەرج، یەکەم: ماقبلی مەکسور بێت. دووەم: فعلەکەشی ئیعلال کرابێت، جا ئەگەر ئیعلالەکەشی لەگەڵ مەصدەری هەردوو رستە جیا بێت وەکو إنقوادا ئەمە لە فعلەکەیدا واو کراوەتە {ي}، وە قوام. ئەگەر یەکێك بڵێت: بۆچی {حِوَل} نەکراوە؟ ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: ئەمە مەصدەر نییە بەڵکە ئیسمی مەصدەرە، وەکو لە پێشان باسکرا، وە دەشتوانی بڵێیت ئەمەیان شازە. (**ومن ثمه لم يقلب في لِوازا لصحة لاوز**) لەبەر ئەوەی کە گووتمان بە دوو مەرج دەکرێت، یەکەیکیان ئەوەبوو کە لە فعلەکەی ئیعلال

کرابێت. دووەم: ماقبلی مەکسور بێت. کەواتە لە {زَوالاً} کە مەصدەری {زال} ئیعلال ناکرێت، هەرچەندە فعلەکەشی کراوە. جا واو لە {لِوازا} نەکرا بە {ی} کە بڵێیت{لیازا} چونکە لە فعلەکەی نەکراوە کە {لاوز}دیە وەکو قاتل، بەڵام ئەگەر {لیازا} مەصدەری {لاز}ەی مجرد بێت ئەوە خۆییو فعلەکەی ئیعلال کراون، وەکو قام وقیام، کە ئەصلی ئەو مەصدەرەی {قِوام} بوو (**وفي المجموع لإعلال المفرد**) یانی واوی ماقبل مەکسور دەکرێتە {ی} لە جەمعەکان بەو مەرجەی موفرەدەکەی ئیعلال کرابێت (**كجِياد لإعلال جيّد**) وەکو {جِیاد} کە جەمعی {جَیِّد} ئێستا {جِیاد} ئەصلەکەی {جِواد} قەلبی واوەکەی کراوە بە {ي} چونکە لە موفرەدەکەشی کراوە کە {جَیِّد}ە ئەصلەکەی {جَیْوِد} بووە، چونکە قاعیدەیە إجتماعی یائو واو بوو سابق لەم دووانە ساکین قەلبی واوی دەکەین بە {ی}، وە دەغممان کرد بوو بە {جَیِّد}، (**وصح في طِوال لصحة طويل**) ساغ و سەلامەتە عين الفعل لە {طِوال} هەرچەندە ماقبلیش مەکسورە، بەڵام چونکە موفرەدەکەی کە {طَویل}ە ئیعلال نەکراوە. لێرەدا بە دەرکەوت کە کاتێك واو لە مەصدەری قەلب دەکرێت بە {ي} ئەگەر ئیعلالی فعلەکەی کرابێت، وە لە جەمعیش بەو مەرجەی لە موفرەدەکەی کرابێت (**واختار يختار إختيارا**) ئەمە بابی إفتعالە هی چوارەمیشە لەو چوار بابانەی کە ئیعلال دەکرێن لە -ثلاثي مزيد فيه- ی ئەجوەفی. وە ئەمەشیان عەتفە بەسەر ئەوانەی پێشە خۆی، {إختار} ئەصلەکەی {إخْتَیِر} بوو وەکو إجتمع، یائی متحرك ماقبل مەفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف {يختار} ئەصلەکەی {يَخْتَیِر} بوو وەکو يجتمع، یائی کراوە بە ئەلف، {إختیارا} مەصدەرە وەکو إجتماعا، هەروەکو خۆی ماوەتەوە. جا یەکێك دەپرسێت: بۆچی ئەم دوو فعلانە ئیعلال نەکراون لەگەڵ ئەوەشدا کە قاعیدەشیان لێ هاتۆتەدی؟ ئەمیش لە وەڵامدا دەفەرموو (**وصح اجتوروا واحتوشوا لأنهما بمعنى تفاعلوا للمشاركة**) سەلامەتن لە ئیعلالدا {اجتوروا واحتوشوا } وە هاووێنەکانیان چونکە ئەمانە بە مانای بابی تفاعل هاتوون و بۆ موشارەکەنە، واتە: بە مانای {تجاوروا وتحاوشوا} ئەم بابەش کە بابی تفاعلە لە

ئەجوەفی إعلال ناکرێت، وە ئەو بابەش کە مانای ئەو بێت بە هەمان شێوە ئیعلال ناکرێت، تاکو بزاندرێت ئەمانە بە مانای تفاعلن وە بۆ موشارەکەن (**وإذا بنيتها للمفعول قلت أُجِيبَ يُجابُ وأُسْتُقِيمَ يُسْتَقامُ وأُنْقِيْدَ يُنْقادُ وأُخْتِيرَ يُخْتارُ**) واتە هەر کاتێك ئەم چوار بابە مەزیدە بکەیتە بینا مەفعول، ئەڵێیت {أجيبَ} ئەصلەکەی {أجوِب} بوو وەکو اکرم کەسرەی واوی بدە ماقبلی، جا واو ساکین ماقبل مەکسور کردمان بە یاء بوو بە {أجيبَ}، يجاب -مضارع-ەکەیەتی ئەصلەکەی يجوب بوو وەکو يكرم نەقلی حەرەکەی واو کرا بۆ ماقبلی وقەلب کرا بۆ ئەلف. {أسْتُقيمَ} بینا مەفعولی بابی {إستفعال}ە وەکو استخرج ئەصلەکەی {أسْتُقْوِم} بوو {يُسْتَقام} -مضارع-ەکەیەتی ئەصلەکەی {يُستقوَم} بوو وەکو يستخرج ئیعلالەکەی وەکو ئەوەی پێشەوەیە بەنەقل وقەلب. {أنْقُوِد يُنقَوَدُ} وەکو انكسر ينكسر لە أنقوِد دا کەسرەی واو بدە قافی لەپاش حەزفی حەرەکەی خۆی جا قەلبی بکە بە یائی، ينقود واو موتەحەریك ماقبل مەفتوح بیکە بە ئەلف -ماضي- بەنەقل وقەلب و-مضارع- بەس بەقەلبە. {أخْتير} ئەصلەکەی {اختُيرَ} بوو کەسرەی {ي} بدە ماقبلەکەی لەدوای حەزفی -ضمة-ی خۆی دەبێتە اختير، {يُختار} ئەصلەکەی يختير بوو وەکو يجتمع، {ی} قەلب کرا بە ئەلف ئەوە بەکورتی ئیعلالی -ماضي-و-مضارع-ی مەجهولی ئەم چوار بابەیە، هەندێك بەنەقلو قەلب وە هەندێك تەنها بەنەقلە. کە اختير وە هەندێك بەس بەقەلبە کە ئەمەی دوایی (**ويجري في الأخرين لُغاتُ صين لضم ماقبل العين اصلا فيهما أيضاً دون الأولين**) واتە دروستە لە -ماضي- مەجهولی دووەکانی ئاخیری کە {اختيرو انقيد}دنە ئەم سێ لوغەتەی کە لە {صين وبيع}ەی دروست بوون یەکیان -ضمة-بوو{اخْتُورَ، انْقُودَ} وەکو صون وبوع. دووەم کەسرە بوو وەکو اختير وانقيد. سێهەم ئیشمام کە زانیت ئیشمام چیيە جا کە ئەم سێ لوغەتە دروستە چونکە لە ئەصلدا واتە پێش ئەوەی ئیعلال بکرێن حەرفی پێش عين الفعل لە هەردووکیان -مضموم-بو وەکو لە صين بيع -مضموم- بوو ئەصلی صين وبيع {صُيون وبُيع} وە ئەصلی ئەم دووانیش {انقودو اختير} بوو لە

پێش هەردوو واوەکانوهەردوو یائەکان لە هەمووان -ضمة-یە کەواتە حوکمیان وەکو یەکە وەئیعلالەکان دیارن (**والأمر أجِبْ أجيبا أجيبوا**) ئەمری بە صیغە لەم چوار بابە دروست ئەکرێت بەم شێوەیە: {أجِبْ} ئەصلەکەی تجیب بوو حەرفی -مضارع-مان لاداو ئیعادەی هەمزەی قەتعمان کردووەو ئاخیرەکەمان مەجزوم کرد بوو بە {أجیبْ} بەیەکگەیشتنی دوو ساکین لەنێوان عین ولام روویدا، وە حەزفی عەین الفعلەکەمان کرد بوو بە {أجِبْ، أجیبا، تجیبان} بوو {أجیبوا} ئەصلەکەی تجیبون بوو، حەرفی -مضارع-ی لادەو هەمزە بێنەوە ئاخیرەکەی مەجزوم بکە بە حەزفی نونی عەین الفعل لەم دووانە ماوە، چونکە پاش عەین الفعلی حەرەکە دارە ئەمە گوترا ئەگەر لەیادت مابێت. ئەمە بۆ -مذكر-ی موخاتەب. میسالی -مؤنث-ان {أجیبي، أجیبا، أجِبْن} لەم میسالەش عین الفعل نەماوە بەڵام نەك لەبەر بینای ئەمر بەڵکە لەبەر نونی جەمعی -مؤنث-ن عین الفعل نەماوە، کەواتە لە دوو میسال نەماوە لەم شەش میسالانە و لەچوار میسالەکانی دیکە ماوە،(**واستقم واستقيما**) استقیموا استقیمی استقیما استقمن (**وإنْقَدْ وإنْقادا**) انقادوا.....هتد. (**واختر واختار**) اختاروا....هتد. ئەصلەکەیان تستقیم، تستقیمان، تستقیمون. لەهەر هەمووان حەرفی -مضارع-ی لادە وهەمزەی وەصلی مەکسورە بهێنەوەو ئاخیرەکەی مەجزوم بکە، یان بەحەزفی حەرەکەی لەسندەکـان یان بەحەزفی نونی لە-تثنیة-وجەمعەکان تەنها لەجەمعی -مؤنث- نەبێت. جا بەیەکگەیشتنی دوو ساکن دەبێ لەم میسالانەی کە حەرفی پاش عین ساکینە، عین الفعل حەزف بکە وەئەوانەی کەپاش عین الفعل حەرەکەدارە عین سابت دەبێت بۆ زیاتر زانین بڕوانە شەرحی مامۆستای مدەریس{رەحمەتی خوای لێ بێت} (**وأجيبَنّ وأسْتَقيمَنَّ وانْقادَنّ واخْتارَنّ**) ئەمەش لەکاتی تەئکید کردنیان بە نونی -ثقیلة- کە لەهەمووان عین الفعل هاتووەتەوە چونکە گوتمان نونی تەئکید لەگەڵ -ضمیر-ی موستەتیرە وەکو ئەلفی -ضمیر- وایە کە مەحزوفی دەگێڕیتەوە. خولاسەی باس ئەوەیە ئەم چوار بابە لەهەموو مشتقاتەکانی وەکو موجەرەد وایە لە حەزفو لەمانەوەی عین الفعل (**ويصح قوَّل**

**وَقاوَل وتَقَوَل وزَيّن وتزيّن سايَرَ وتسايَرَ واسوَدّ واسوادّ وابْيَضّ وابْياضَّ)** واتە: ئەوانە هیچیان ئیعلال ناکرێن کە هەموویان معتل العینن، بەڵام مەرجی ئیعلال کردن لە هیچیان ناهێتە جێ، جا {قَوَّلَ} لە بابی تفعیلە، وە قاول لە بابی مفاعلە، وە {تَقَوَّلَ} لە بابی {تَفَعُّل}ە، وە تقاول لە بابی تفاعلە، وە هەموویان واوینە. وە {زَيَّنَ} وەکو {قَوَّلَ}، وە {تزيّن} وەکو {تقوّل}. وە سایر وەکو قاول وایە، وە تسایر وەکو تقاول وایە، بەڵام ئەمانە یائینە، وە {إِسْوَدَّ} لە بابی إفعلالە، وە {إِسْوادَّ} لە بابی إفعیلالە، هەردووکیان واوینە. وە {إِبْيَضَّ} وە {إِبْياضَّ} بە هەمان شێوە تەنها ئەمانە یائینە. **(وكذا سائر تصاريفها)** واتە: هەروەکو ئەم -ماضی-ە وایە هەموو جۆرە موشتەقاتی دیکەیان، وەکو -مضارع-و ئیسمی فاعیل و ....هتد، واتە هیچیان ئیعلال ناکرێن، وە حوکمەکەیان حوکمی صەحیحە. جا یەکێك دەپرسێت: بۆ ئەم شەش بابەش حەمل ناکەیتە سەر مجردەکانیان وەکو دووەکانی پێشوو؟ ئەمیش لە وەڵامدا دەفەرموویت **(ولم تحمل على المجرد مثل أَقام وإستقام)** واتە ئەم شەشانە حەمل نەکرانەوە سەر مجردەکانیان بۆ ئیعلال کردن وەکو ئەوەی أقام وإستقام و حەمل کرانە سەر مجردەکانیان **(للبس فيها دونهما)** چونکە ئەگەر ئەمانە ئیعلال بکرێن بە حەمل بەسەر مجردەکانیان ئیلتیباس لەم شەشانە دەبێت، بەڵام لە دووەکانی دیکەیپێشوو ئیلتیباس نابێت، بۆ وێنە {قاوَل} دەڵێن: واو متحرکە بەڵام ماقبلی مەفتوح نییە چونکە ئەلفی لە پێشە، بەڵام بە حەمل بەسەر قال کە مجردەکەیتی، واومان کرد بە ئەلف، جا دوو ئەلف کۆدەبنەوە یەکمان حەزف کرد بوو بە {قال}ە، لێرەدا إلتباسی -ثلاثی مزید-ی بە -ثلاثی مجرد-ی بوو، وە هەروەها {قَوَّلَ} پێش ئیدغام ببێت {قَوْوَلَ}ە بوو واوی دووەم متحرکە بەڵام ماقبلی مەفتوح نییە، کەواتە مەرجەکانی قەلبی تێدا نەهاتنە دی، وە ئەگەر حەمل بکرێت بەسەر مجردی ئەوا ئیلتیباس دەبێت بەم شێوەیە: فەتحەی واوی دووەم نەقل کرا بۆ واوی یەکەم، وە قەلب کرا بە ئەلف دەبێت قوال، جا إلتباس بوو بە {ذَهاب} کە مەصدەری -ثلاثی مجرد-ە. جا ئەوانی دیکەش بەم شێوەیەنە،

هەریەکەو إلتباسی بە شتێك دەبێت، کەواتە ئەوانە ئیعلال ناکرێن بە حەمل وەکو هەردووەکانی پێشوو. جا یەکێك دەڵێت: باشە مەرجەکانی ئیعلال نییە لە {إِسْوَدَّ} کە -ثلاثی مزید-ە بۆیە ئیعلال نەکراوە، بەڵام خۆ مەرجەکانی ئیعلال لە مجردەکەی هاتووتمنەدی کە {سَوِدَ}یە، ئەی بۆچی لە مجرد نەکراوە؟ ئەمیش لە وەڵامدا دەفەرموو (**ولما لم يُعَلَّ نحو إسوَدَّ واسْوادَّ وكان الأصل في الألوان والعيوب المزيدات**) واتە: لە کاتێکدا کە ئیعلال نەکرا {إِسوَدَّ واسْوادَّ} کە یەکەمیان لە بابی إفعلاله وە دووەمیان إفعيلاله کە هەردووکیان بۆ موبالەغە هاتوون، وە حال وایە لە هەموو شوێنێك مجرد ئەصلترە لە مزید، تەنها لە ئەلوان و عیوب مزیدەکانیان ئەصلترن لە مجردەکانیان (**لم يعل المجرٰدات مثل سَوِد وعوِر حملاً عليها**) واتە مادام ئەصلەکان کە مزیداتن ئیعلال نەکراون چونکە مەرجیان تێدا نەبووە مجردەکانیش ئیعلال نەکران وەکو {سَوِد وعَوِر} ئەگەر چی مەرجەکەشیان تێدایە، بەڵام حەمل کران بەسەر ئەصلەکانیان کە مەزیدەکانن ئەگەر نا لەوان واو متحرکە وماقبل مفتوحە حەقی هەیە ئیعلال بکرێت (**وكل ما لم يُعلَّ لا يُعلّ تصاريفه**) وەهەر صیغەیەك کە ئیعلال نەکرابێت جا لەبەر ئیلتیباس بێت یان لەبەر شتێکی دیکە، موشتقاتەکانی تریش ئیعلال نەکرابێت وەکو -مضارع-...هتد. (**مثل أعْوَروعاوِرٌ**) وەکو اعور ئێستا ئەمە یان -ماضي- بابی إفعاله وەکو أکرم، یان صیفەتی مشبهەیە. وعاور یان -ماضي- بابی مفاعلەیە وەکو قاتل یائیسمی فاعلە {عاوِرٌ} وەکو{ناصِرٌ} بەهەر حال هیچیان ئیعلال نەکراون چونکە -ماضي- ەکەیان نەکراوە (**وصحّ أيضاً ما أصْوَنَ هذا وأصْوِن به فعلا التعجب**) یانی سەلامەتە لە ئیعلالدا وەکو ئەوانەی باسکراوە، ئەم دوو فعلە کە یەکەمیان {ما أَصْوَنَ}، وە دووەمیان {أَصْوِنِ بِهِ} کە هەردووکیان فعلی تەعەجوبیان پێ دەڵێن، جا ئەم دوو فعلە ئەگەر تەماشا بکەین مەرجی ئیعلالیان تێدا نییە، کەواتە دەبێت حەمل بکرێنە سەر مجردەکانیان وەکو صان، وە ئەمەش ناکەین (**لعدم قبول التصرف**) چونکە ئەم دوو فعلە قبولی گۆڕانکاری و ئیعلال ناکەن، جا چۆن حەمل

دەکرێنە سەر مجردەکەیان، ئەمانە میسالی واوی بوون، وە میسالی یائیش {ما أَبْيَعَ هذا وأَبْيِعْ بِهِ} (**وأفعل التفضيل نحو هذا أصون حملاً عليهما**) واتە: ئیعلال ناکرێت -أفعل التفضيل-یش وەکو {هذا أصون من ذاك} چونکە حەمل کراوە ئەم -أفعل التفضيل-ە بەسەر فعلەکانی تەعەجوب لەبەر ئەوەی کە هەردووکیان هاوبەشن لە دروستکردنیان لەو فعلەی کە دەبێت -ثلاثی مجرد- بێت، وە لە ئەلوان و عیوبان نەبێت، (**ولو بني مما يُعَلُّ**) بەڵێ ئەم سێیانە ئیعلال ناکرێن ئەگەر دروستیش بکرێن لە فعلێك کە خۆی ئیعلال کرابێت، وەکو صان وباع... هتد. جا هاتە سەر باسی دروستکردنی ئیسمی فاعیل لە معتل العينى، دەفەرمووێت (**واسم الفاعل من الثلاثي المجرد يعتل عينه بالهمزة**) واتە: ئیسمی فاعیل لە -ثلاثی مجرد-ی معتل العين ئیعلالی دەکرێ بە قەلبکردنی بە هەمزە، جا ئەم عين الفعله چ واوی چ یائی بێت، وە قەلبەکەش یان راستەوخۆیەو یان نا (**كصائِن وبائِع أصلهما صاوِن وبايِع**) وەکو صائن وە بائع ئەصلەکەیان صاون بە واو، وە بايع بە یائی بووە (**قلبتا همزة إبتداء لخفتها هنا**) قەلبی واوو یائی کرا بە هەمزە هەر لە ئەوەڵەوە، واتە: پێش ئەوەی کە بیان کەین بە ئەلف چونکە هەمزە سووکترە لە واوو یائی لێرەدا، واتە: لە دوای ئەلف ئەگەرچی لە زاتی خۆیدا لەوان گرانتر بێت، جا گووتمان ئەم قەلبە یان راستەوخۆیە یان نا (**أو قلبتا ألفا**) یان پێشەکی واوو یائمان قەلب کردن بە ئەلف، چونکە یائو واوی متحرك ماقبل مفتوح دەکرێن بە ئەلف. جا یەکێك دەڵێت: ماقبلەکەیان مفتوح نییە بەڵام ساکینە، چۆن دەبێت ئەم ئیعلالە بکرێت؟ ئەمیش لە وەڵامدا دەفەرموو (**لأن الألف حاجز غير حصين فكأن ما قبلها مفتوح**) چونکە ئەم ئەلفە پەردەیەکی بێ هێزەو بێ توانایە رێگری لە قەلبی واوو یائی ناکات بە ئەلف لە صاون وە بايع، وابزانە ما قبلەکەیان مەفتوحەو قەلب دەکرێن، جا لێرەدا دوو ئەلف کۆدەبنەوەو، جا دەفەرمووێت (**ثم حُرِّكت العين لإلتقاء الساكنين**) لە پاش قەلبکردنیو بوونی إلتقائوالساكنين، ئەلفی دووەم کە عين الفعله حەرەکەمان پێدا بوو بە صائن وبائع (**والأخير أصحّ**) واتە: ئیعلالی

دووەم لە هی ئەوەل باشترە، ئەگەرچی مانیبوونیشی زیاترە، چونکە هی دووەم وەکو -ماضی-ەکەیەتی کە قەلبی عين الفعلەکەی کراوە بە ئەلف لە هەردووکیان. لێرەدا بۆ ئەوەی کەوا تێنەگەی کە هەرگیز هیچیان حەزف ناکرێن فەرمووی (**وقد جاء حذف ألف العلامة**) کەم جار هاتووە کە حەزفی ئەم ئەلفەی دەکرێ کە نیشانەی ئیسمی فاعیلە لە کاتی کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەلفی عين الفعل (**والراجح أن المحذوف الثانية**) بەڵام قسەی راست و رێکتر ئەوەی کە ئەلفی حەزفکراو لەم دووانە هی دووەمە کە عين الفعلە، چونکە ئەمەیان هەرچەندە ئەصلیش بێ بەڵام حەرفی عیللەیە هەقی حەزفکردنی هەیە، وە ئەم گرانیەو إلتقائوالساكينينە هەمووی بە هۆی ئەم ئەلفی دووەمە پەیدا بووە، جا دەیەوێت میسالەك بهێنێت کە یەك لەم دوو ئەلفە لادراوە، وە میزانەکەی دەکاتە شاهید داخۆ کامیان لادراوە دەفەرمووێت (**فعلى الأول نحو شاكٍ فَعِلٌ**) واتە: لەسەر بۆچوونی یەکەم کە حەزفی ئەلف نیشانەیە، وەزنی شاك لەگەڵ هاووێنەکانی {فَعِل} بوو، چونکە {شاك} ئیسمی فاعیلی شاك يشوك يە وەکو صان يصون، وە ئەصلەکەی {شاوِك} بووە، واوی قەلب کراوە بە ئەلف، دوو ئەلف کۆبوونەوە حەزفی ئەلفی نیشانەمان کرد بوو بە شاك، لەسەر وەزنی -فَعِل- چونکە فاعل حەزفی ئەلفەکەی بکەین دەبێتە {فَعِل} (**وعلى الأصح فالٍ**) وەزنی شاك لەسەر بۆچوونی راستر کە حەزفی عين الفعل بوو، وەزنی دەبێت {فالٍ} چونکە هەرکاتێ عين الفعل لە فاعل حەزف بکرێت دەبێتە فال (**ومنهم من يؤخر العين فيُعِلّ مثل غازٍ**) بازێ لە زانایانی عیلمی صەرف قەلبولمەکانی پێ دەکەن، عين الفعلی دەبەنە دواو لام الفعلی دەخەنە پێش، جا ئیعلالی دەکەن وەکو ئیعلالکردنی معتل اللام وەکو {غازٍ} ئەصلەکەی {غازِوٌ} بووە لە مەودوا باسی دەکەین -إنشاء الله- (**كهارٍ على فالٍ**) نمونەکەی وەکو هار، ئەصلەکەی هاور بووە وەکو شاوك، پاشان واومان خستە دواوە بوو بە {هارو} لەسەر وەزنی فالع، واو لە تەرەفی قەلب کرا بە {ی}، جا -ضمة- گران بوو لەسەریەو حەزفکرا، پاشان إلتقائوالساكنين لە نێوان تەنوین و لام الفعل، حەزفی لام الفعل کرا

بوو بە {هار} لەسەر وەزنی فال، چونکە ئەم واوە عین الفعلە کەوتوتە دواوەو حەزفکراوە.

**پاشکۆ :**

بزانە لە {شاكٍ} سێ بۆچوون هەیە، یەکەم شائك کە واو کراوە بە هەمزە کە ئەمەیان قانونی خۆیەتی. دووەم: قەلب مکان، واتە: شاوك دەکەینە {شاكِوٌ} جا ئیعلالی دەکەین وەکو {غازٍ} وە لە کاتی إعراب وەکو {قاضٍ وغازٍ} وایە. سێیەم: قەلبی واو دەکرێ بە ئەلف و حەزف دەکرێ، جا میزانی یەکەمیان فاعل، وە دووەمیان فال، وە سێیەمیان ئەگەر ئەلفی نیشانە حەزف کرابێ {فَعِلٌ}، وە ئەگەر عین الفعل حەزفکرابی ئەمجارەش {فالٍ} والله أعلم.

(**وكثر مجئ فَيْعِلٍ من هذا النوع مقام فَعِيل**) زۆرە هاتنی {فَيْعِل} لەم جۆرە معتل العین ەی لە شوێنی فعیل، واتە: زۆرە لە معتل العین کە ئیسمێك لەسەر وەزنی {فَعْيال} بە فەتحەی فائولفعل و کەسرەی عین الفعل وە یێیەکی ساکین، جا قەلب مکان بەم یائە بکەی بیهێنییە نێوان فائو لفعل و عین الفعل بۆ ئەوەی بتوانی ئەم قاعیدەیە ئیش پێ بکەی کە دەڵێ: کۆبوونەوەی یائو واو سابق لەوان ساکین قەلبی بۆ واو کراوەتە -یاء- وە دەغم کرا، چونکە ئەگەر ئەم قەلب مەکانەی نەکەی ئەم قاعیدەیەی لێ چاك نابێت (**كمَيِّتٍ**) ئێستا {میّت} ئەصلەکەی {مَويت} بووە، ئەم قاعیدەیەی لێ ناهێتەجێ جا قەلب مەکانمان کرد بەم یائە وە هاتە پێش واو بوو بە {مَيْوِت}، واتە: پێشان لەسەر وەزنی فعیل بوو وە ئێستا لەسەر وەزنی فیعلە، ئەمجارە ئەم قاعیدەیەی {إجتماع واو وياء} لێ هاتۆتەدی ئیعلال کرا بوو بە {مَيِّت}زۆر سووك بوو، وە هەروەها {جَيِّد وسَيِّد.....هتد}، بەڵام جاری واش هەیە کە ئەم قەلبە نەکراوە وەکو {طویل} (**ويجوز التخفيف بحذف إحدى اليائين**) واتە: دروستە لەم جۆرە وشانە حەزفی یەك لەم دوو یائانە بکرێت، بۆ سووککردنی، یانی بڵێیت {مَيْت وسَيْد}بە حەزفی یەکێك لەم دوو یائانە، جا یان زیادەکە حەزف بکە یان عین الفعلەکە، جا مصنف {رحمه الله} دەیەوێت میسالەکی لەم جۆرە

میسالانە لە صان بهێنیت بۆ زیادە زانین دەفەرمووێت (**تقول صَيِّن**) واتە تۆ دەڵێیت: لە میسالی {فَيْعِل} کە ئەصلەکەی فعیل بووە لە مادەی صان {صَيِّن} ئەمە بۆ موفرەدی نێرینەکانە، ئەصلەکەی صوین بووە وەکو فعیل، پاشان قەلب مەکانمان بە یائی کرد بوو بە {صَيْوِين} وەکو {فَيْعِل} جا قاعیدەی لیٚ هاتە جیٚ واومان کرد بە یائو دەغممان کرد بوو بە {صَيِّن} وەکو {مَيِّت} (**صَيِّنان صَيِّنَيْنِ**) ئەمەش -تثنية مذكر- لە حالەتی رەفعە {صَيِّنان} وە لە حالەتی نەصبەو جەرە {صَيِّنَيْنِ} (**صَيِّنون وصَيِّنِيْنَ**) ئەم دووانەش بۆ جەمعی -مذكر-ی سالم لە هەرسێك حالەتاندا، لە هەموان قەلب مەکان بە یائی کراوە، وە دەغم کراوە، جا شەش وەزنیش بۆ جەمعی موکەسەری نێرینە دێنێت، یەکەم: (**أَصْوان**) سکونێك لە نێوان دوو فەتحە، دووەم: (**صَوْنَى**) سکونێك لە نێوان دوو فەتحە لەگەڵ ئەلفی کورت، سێیەم: (**صِيان**) بە کەسرەی فائوالفعل و یائی سووك لەگەڵ ئەلف و نون، چوارەم: (**أَصْوِناء**) بە فەتحەی هەمزەو سکونی صادو کەسرەی واوو لەگەڵ ئەلفی درێژ، پێنجەم: (**صَوانا**) بە فەتحەی صادو واو لەگەڵ ئەلف، وە ئەلفی کورت لە ئاخیری وەکو تعالی، شەشەم: (**صَوائِن**) وەکو مساجد، وە بازیٚ لە زانایان دەڵێن: {صَيائِن} واتە: واوەکەی دەکەنە یائو وەکو بۆ -مؤنث-ان، ئەمە بۆ نێرینەکان بوو. جا بۆ مێینەکان دەفەرمووێت (**صَيِّنة صَيِّنتان صَيِّنَتَيْنِ صَيِّنات**) ئەمانەش میسالی مێینەکانن بۆ موفرەدو دووان و جەمعی سەلامە (**صَيائِن**) ئەمەش جەمعی تەکسیری -مؤنث-انە، وە ئەوەی کە ئیعلال کراوە بۆ خۆت بزانە، چونکە قاعیدەکان زاندراون، وە بەم شێوەیە برِۆ دووی لە باقی میسالەکانی دیکە لە معتل العين.

جا إسم فاعل لە -ثلاثی مجرد- تەواو بوو جا هاتە سەر باسی إسمی فاعل لە -ثلاثی مزید فیه- جا فەرمووی (**ومن المزيد فيه يعتَلُّ بما أعتلّ به المضارع**) إسمی فاعل ئیعلال دەکریٚ لە -ثلاثی مزید فیه- معتل العين بەم جۆرەی کە إعلالی عين الفعلی -مضارع-ەکەی دەکریٚ کە لە بازیٚ شوێن تەنها بە نەقلە، وە لە

هەندێکی دیکە بەس بە قەلبە، وە لە هەندێکی دیکە بە هەردووکیانە، وە لەم شوێنەی کە -مضارع-ەکەی نەکرابێت ئەمەشیان ناکرێ **(کمُجِیْبٍ ومُسْتَقِیمٍ)** ئێستا مجیب کە إسم فاعیلە لە بابی إفعال، ئەصلەکەی {مُجْوِب} بوو کەسرەی واومان بۆ لای جیمی نەقل کرد، جا واو ساکین ماقبل مەکسور قەلبمان کرد بە {ی} بوو بە {مُجیب}. وە هەروەها {مُسْتَقیم} إسم فاعیلی بابی إستفعالە وەکو {مُسْتَخْرِج} ئەصلەکەی {مُسْتَقْوِم} بوو، کەسرەی واومان نەقل کرد بۆ قافی کە فائول فعلە بوو بە {مُسْتَقِوْم} واو ساکین ماقبل مەکسور کردمانە {ی}، ئەم دووانە إعلالەکەیان بە نەقل و قەلبە وەکو -مضارع-ەکەیان کە {یُجیب ویستقیم} بوونە **(مُنْقاد ومُختار)** ئێستا {مُنْقاد} إسم فاعل بابی إنفعالە، ئەصلەکەی {مُنْقَوِد} بووە، وەکو {مُنْکَسِر}، وە {مُخْتار} لە بابی إفتعالە وەکو {مُجْتَمِع}، ئەصلەکەیان {مُنْقَوِد ومُخْتَیِر} بووە، جا واوو یائی متحرك ماقبل مەفتوح کران بە ئەلف بوونە منقاد ومختار، ئەمانەش إعلالەکەیان تەنها بە قەلبە، وە ئەمانە إسم فاعیل و إسم مەفعولیان لە دوای قەلب یەکسانن، وە ئەم میسالەی کە إعلالی بەس بە قەلب بێت وەکو {مُبیع} ئەصلەکەی {مُبْیِع} بووە وەکو {مُکْرِم}، کەسرەی یائمان بۆ ماقبلەکەی نەقل کرد بوو بە {مُبیع}، وە ئەوانەی کە إعلال ناکرێن {مُقاوِل ومقَوِل....هتد} چونکە -مضارع-ەکەیان إعلال نەکراوە **(وإسم المفعول من الثلاثی المجرد یعتلّ بالنقل والقلب)** لە کاتی إسمی فاعل تەواو بوو هاتە سەر باسی إسمی مەفعول، جا دەفەرمووێت: إسم مەفعول لە -ثلاثی مجرد- إعلال دەکرێت لە معتل العین بە نەقل و حەزف **(کمَصُون ومَبیع)** ئێستا مصون إسم مفعولە لە صان وەکو بابی یەکەمە، ئەصلەکەی {مَصْوُوْن} بووە وەکو منصور، -ضمة- لەسەر واوی گران بوو نەقل کرا بۆ ماقبلەکەی، جا إلتقائول ساکنین لە نێوان هەردوو واو پەیدا بوو بوو بە مصون. وە {مَبیع} إسم مفعولی بابی دووەمە، ئەصلەکەی {مَبْیُوع} بووە وەکو {مضروب} -ضمة- لەسەر یائی گران بوو نەقلمان کرد بۆ ماقبلەکەی جا إلتقائول ساکنین بوو لە نێوان عین الفعل کە یائە لەگەڵ واوی

زیاد، جا حەزفی واوەکەمان کرد بوو بە {مَبْيُع} بە فەتحەی میم و -ضمة-ی بائی وە سکونی یائی، پاشان بائمان مەکسور کرد بوو بە {مَبيع}، وەکو بە خۆی باسی دەکات، بەڵام ئەم إعلاله لەسەر فەرموودەی سیبویەیە رەحمەتی خوای لیّ بێت کە دەفەرمووێت لە هەردووکیان واوی زیاد حەزفکراوە وە عين الفعل ماوە، بەڵام ئەخفەش دەفەرمووێت: لە هەردووکیان عين الفعل حەزفکراوە، وە مصنف رحمه الله دەفەرموو (**والمحذوف واو مفعول عند سيبويه**) بەڵیّ مصون ئەصَلەکەی {مَصْوون} بووە بە دوو واو، وە {مَبيع} ئەصلەکەی {مَبْيُوع} بووە بە یائو واو لە هەردووکیان یەك حەزف کراوە، جا سیبویهی دەفەرمووێت: حەزفکرا وەکو واوی مەفعولە، واتە: واوە زیادەکەیە لەهەردووکیان (**والوزن مَفُعْل ومَفِعْل**) جا لەسەر فەرموودەی سیبویهی وەزنی مصون {مَفُعْل}ە بە فەتحەی میم و -ضمة-ی فائول فعل و سکونی عين الفعل، وە وەزنی مبيع {مَفُعْل} بە فەتحەی میم و کەسرەی فائو سکونی عین، کەواتە: واوی زیادەکە لە هەردووکیان حەزفکراوە (**وعين الفعل عند الأخفش والوزن مَفول ومَفيل**) واتە مەحزوفەکە لەسەر فەرموودەی ئەخفەش عين الفعله لە هەردووکیاندا، جا میزانی مصون مفوله چونکە عين الفعل حەزفکراوە، وە میزانی مبيع مفيله بە فەتحەی میم و کەسرەی فائو الفعل لەگەڵ یائی وە حەزفی عين الفعل، جا هاتە سەر إعلالی مبيع لەسەر فەرموودەی سیبویه (**وأصل مبيع مَبْيُوعٌ**) ئەصلی مبيع {مَبْيُوع} بووە وەکو {مضروب} لەسەر هەموو بۆچونەکان (**حذفت الواو عند سيبويه بعد نقل ضم الياء إلى الباء**) بەڵیّ ئەصلەکەی مبيوع بووە حەزفی واوەکە کرا لەسەر فەرموودەی سێبەویهی لەپاش نەقلکردنی -ضمة-ی یائی بۆلای{ب} چونکە کەنەقلی -ضمة-ی یائی کرا {التقاءالساكنين} پەیدا بوو لەنێوان واو و{ی} حەزفی واو کرا بوو بە {مَبُيْع} جا یائی ساکین ماقبل -مضموم- مەترسی هەیە قەلب بکرێت بەواو زوو بە زوو مەکسور کرا وەکو دەفەرمووێت (**ثم كسرت لئلا يلزم قلب الواو ياء فيلتبس بالواوي**) واتە لەدوای نەقل کردنی -ضمة-ی یائی بۆلای {ب} ئەم بێیە مەکسور کرا نەوەك قەلبی

یائی بکرێت بەواو جا ئیلتیباسی معتلی یائی ببی بە معتلی واوی بەڵام کە {ب} مەکسور کرا ئەم یائە قەلبی ناکرێت بە واو، ئەم ئیعلالە لەسەر فەرمودەی سیبویەی بوو بەڵام ئەخفەش دەفەرمووێت لەکاتیٚ کە-ضمة-ی یائی نەقل کرا بۆلای {ب} {التقاء الساكنین} بوو لەنێوان واو ویائی حەزفی یائی کرا کە عین الفعله بوو بە {مَبُوْع} جا -ضمة-ی یائی کرا بەکەسرە بوو بە {مَبِوْع} واو ساکن ماقبل مەکسور قەلب کرا بە یائی بوو بە {مَبيعٌ} کەواتە ئەم یائە واوی مەفعولی بووە کراوە بە یائو نەك هی ئەصلەکەیە یەك دەڵێت ئەم مەکسور کردنە وێنەی هەیە؟ دەفەرمووێت **(كما كسرت الفاء فِي فُعْلي وفُعْلٍ بضم فسكون صفتين يائيين)** واتە: لە مبیع فائو الفعلی مەکسور کرا تاوەکو قەلبی واوی نەکرێت بە {ی}، هەروەکو فائو لفعل مەکسور کراوە کە پێشان -مضموم- بووە لەم دوو وەزنانە، کە یەکەمیان {فُعْلَی}، وە دووەمیان {فُعْلَ} بە -ضمة-ی فائو الفعل سکونی عین الفعل لە هەردووکیان، وە ئەلفی کورت لە هی یەکەم، کە هەردووکیان صیفەتن وە یائینە، واوی نینە، إسمیش نینە بەڵکو صیفەتن **(كقِسْمَة ضِيزَى ومَشْيَةٍ حِيكَى)** وەکو ئەم دوو وشەیە کە {ضِيزَى و حِيكَى} کە هەردووکیان صیفەتن، بە بەڵگەی {قسمة مشية} وە هەردووکیان یائینە، ئەصلەکەیان {ضُيْزَى حَيْكَى} بوو، بە -ضمة-ی ئەوەڵیو سکونی دووەمی، جا لێرەدا ئەگەر فائو لفعل مەکسور نەکرێت دەڵێن: یائی ساکین ماقبل -مضموم- دەکرێتە واو، لەبەر ئەوە فائو الفعلەکە مەکسور کرا، بوو بە {ضِيزَى حِيْكَى} ئەمە میسالی {فُعْلَى} بوو، وە میسالی {فُعْلْ} ئەوەیە: **(وبِيْضٍ جمع أَبْيَضٍ)** {بِيض} جەمعی {أَبيض}ە، ئەصلەکەی {بُيْض} بوو، لەبەر ئەمە کە {ی} نەکریٚ بە واو فائو الفعل مەکسور کرا بوو بە {بِيضٌ}، کەواتە دەرکەوت کە زۆر جار وا دەبێت فائو لفعل مەکسور دەکرێت تاوەکو واوی إلتباسی بە یائی نەبێت (لا فُعْلَى إسما) فائولفعل مەکسور ناکرێت لەو ئیسمەی کەلەسەر وەزنی {فُعلي}ی بێت، (کطوبی)وەکو {طوبی} ئێستا {طوبی} کەناوی دارێکە لەبەهەشت، لەم ئیسمەی فائولفعلی مەکسور ناکرێت **(فتقلب ياؤه واواً)**

لەم جۆرە ئیسمە یائی قەلب دەکرێت بە واو جا دەڵێن {طوبي} ئەصلەکەی {طُيْبي} بوو یائی ساکن ماقبل -مضموم-قەلبمان کرد بە واو بوو بە {طوبي} (**وبنو تميم يشبون الياء فيقولون مبيوع**) بەنی تەمیمی کە هۆزێکی عەرەبن دەستکاری یائی ناکەن وبەڵکە دەیهێڵنەوە لەئیسمی مەفعولی یائی، دەڵێن مبیوع وەکو {مضروب} بەڵام واو حەزف دەکەن چونکە واو سەقیل ترە (**ورُوِي ثوب مصوون**) ئیسمی مەفعول لە -ثلاثی مزید فیە- لە معتل العینی ئیعلال دەکرێ بە قەلبی عین الفعلی بۆ ئەلف، بەو مەرجەی فعلەکەی ئیعلال کرابێ کە فعلی بینا مەفعولە لە چوار بابەکان، بەڵام لەم چوار بابە دووان ئیعلالی ئیسمی مەفعولیان دەکرێت بە قەلب، وە دووانی دیکە بە نەقل و قەلبە، (**كمُجاب ومستقام**) ئێستا مجاب ئیسمی مەفعولی بابی إفعالە، ئەصلەکەی {مُجْوَب} بووە، نەقلی حەرەکەی عین الفعل کرا بۆ ماقبلەکەی وە قەلب کرا بە ئەلف بوو بە مجاب. وە مستقام ئیسمی مەفعولی بابی إستفعالە، بە هەمان شێوە ئیعلال کراوە. دەرکەوت کە ئەم دووانە ئیعلال کراون بە نەقل و قەلب (**حملاً على فعلهما المجهول**) ئەم دووانە ئیعلال کران ئەگەرچی مەرجەکانی ئیعلال کردنیان تێدا نەبوون، بەڵام بە حەمل وە سەر فعلی بینا مەفعولی خۆیان کە {يُجاب يُستقام} بوون، جا وەکو زانیت خۆیان حەمل کرابوونە سەر مجردەکانیان کە جاب وقام بوون، ئەمەیان دەرۆزەیە لە دەرۆزەکەری.

(**ومُنْقاد ومُخْتار**) منقاد ئیسمی مەفعولی بابی إنفعالە، ئەصلەکەی {مُنْقَوَد} بوو، واو متحرك ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف. وە مختار ئیسمی مەفعولی بابی إفتعالە، ئەصلەکەی {مُخْتَيَر} بوو، یائمان قەلب کرد بە ئەلف، ئەم دووانەش بەس بە قەلب ئیعلال کراون، وە ئەم دوانە ئیسمی فاعیلو مەفعولیان وەکو یەك وایە وەکو لە پێشەوە زانیت. لە کاتێك مصنف باسی ئیعلالی هەموو جۆرە فعلەکانی کردو، باسی ئیعلالی ئیسمی فاعل و مەفعول و...هتد کردو، جا ویستی باسی ئیعلالی ئیسمێك بکات کە -ثلاثی مجرد- نەبێت، چونکە ئیسمی -ثلاثی مجرد- ئیعلال دەکرێت ئەگەرچی ئەم دوو مەرجەشی تێدا نەبێت، وەکو {باب وناب}

ئەصلەکەیان بوب وە نیب بوو، (**وشرط إعلال العين في اسم غير الثلاثي المجرد**) واتە: مەرجەکانی ئیعلالی عین الفعل لە ئیسمێك کە -ثلاثی مجرد- نەبێت، چونکە گووتمان: بۆ -ثلاثی مجرد- ئەم دوو مەرجەی ناوێت (**والجاری علی الفعل وهو اسم الفاعل والمفعول لاغیر**) وە ئەم ئیسمە غەیرە جاری بی بەسەر فیعل، واتە: موشتەقاتی فعلیٚ نەبێت، کە ئەمەش بریتییە لە: ئیسمی فاعیل و مەفعول و بەس، بەڵام لە راستیدا مەبەست لەم دوانە باقی موشتەقاتەکانی دیکەشە وەکو صیفەتی موشەبەهەو فەعیل و فەعول و....هتد، ئێستا بووینە {إجابة وإستِقامةً} کە مەصدەرن، ئەمانە -ثلاثی مجرد- نینە، وە ئیسمی فاعیل و مەفعولیش نینە، بەڵکو -ثلاثی مزید فیە-نە، لەگەڵ ئەمەش کە ئەم دوو شەرتەیان تێدا نییە ئەوجا ئیعلال کراون. دیارە مەبەست بە جاری {علی الفعل} هەمو موشتەقاتەکانن نەك تەنها فاعیل و مەفعول (**موافقة الفعل حرکة وسکونا ومخالفته بزیادة أو أبنیة مخصوصتین بالإسم**) یانی شەرتی ئیعلالی عین الفعل لەم جۆرە ئیسمەی کە -ثلاثی مجرد- نەبێت، واتە: -ثلاثی مزید- بێت، هەروەها جاری بەسەر فعلیش نەبێت وەکو گووتمان شەرتەکەی ئەم دووانەیە، یەکەم: ئەم ئیسمە موافق و یەکسان بێت لەگەڵ فعلیٚ لە حەرەکەو سکوندا، واتە: حەرەکەو سکونی وەکو حەرەکەو سکونی فعلیٚ بێت. وە دووەم: ئەم ئیسمە موخالیف و پێچەوانەی فعلیٚ بی لە یێکی لەم دوو شتە، یەکەم: زیادەی حەرفێك کە ئەم حەرفە تایبەت بیٚ بە ئیسمی. دووەم: لەسەر وەزنێك بیٚ کە ئەم وەنە تایبەت بیٚ بە ئیسمیٚ، واتە: لە فعلێدا نەبێت مەگەر بە خیلافی قیاس (**فلذلك لو بنیت من البیع مثل مَضْرِب وتِحْلِئٍ بکسر التاء واللام قلتَ مَبیع وتِبیع**) لەبەر ئەوە ئەم دوو وشە کە بە شەرتگیراوە ئەگەر بتەوێت دروست بکەی لە وشەی {البیع} کە مەصدەری -ثلاثی مجرد-ە لە ئەجوەفی شتێکی لەسەر وەزنی {مَضْرِب} بە فەتحەی میمیو کەسرەی رائی، یان لەسەر وەزنی {تِحْلِئ} بە کەسرەی تائو لامی، لەو کاتەی ئیعلالەکە دەڵێیت: {مَبِیع وتِبِیع} ئێستا یەکەمیان ئەصلەکەی {مَبْیِع} بووە بە فەتحەی میم و سکونی بائی وە

کەسرەی یائی، وەکو {مَضْرِب}. وە {تِبیع} ئەصلەکەی {تَبْيِع} بوو بە کەسرەی تائو سکونی بائو کەسرەی یائی وەکو {تِحْلِیء}، بێگومان مەصدەری هەردووکیان {البَيْع}ە (**معلاّ لعدم اللبس**) حاڵی توو وایە بۆ هەردووکیان کە ئیعلالت کردوون، چونکە ئیلتیباسی بە هیچ شتێکی دیکە نابێ. ئێستا بڕوانە: مەرجەکانیان لێ هاتوونەتە جێ، وە {مَبْيِع} موافقی فعلە لە حەرەکەو سکەن، وەکو {تَضْرِب} وایە، لە هەمان کاتدا موخالیفی فعلە بە زیادەیی میمی لە ئەوەلی، بەوەش دەزانین میم زیادە چونکە میم بۆ فعلی زیاد ناکرێت. وە هەروەها {تِبْيِع} موافقی فعلە لە حەرەکەو سکوندا چونکە وەکو {إضْرِب} وایە کە فعلی ئەمرە، وە موخالیفە بە کەسرەی تائی چونکە تائەکە ئەگەر لە فعلان زیادیش بکرێت مەکسور ناکرێت، تەنها بە شاز نەبێت وەکو {تِعْلِم وتِشْهِد} کەواتە ئەم دوو ئیسمە مافی ئیعلال کردنیان هەیە، کە نەقلی حەرەکەی عین الفعلەکەیان بۆ ماقبلەکەیان کراوە، کە لە {مَبْيِع وتِبْيِع} کەسرەی یائی بۆلای بائی نـقل کراوە بوون بە {مَبیع وتِبیع} (**ومثل تَضْرِب بفتح التاء قلت تَبْيِع مصححا إذ لو أعل لزم اللبس**) یانی ئەگەر بتەوێت ئیسمەك دروست بکەیت لە البیع کە لەسەر وەزنی {تَضْرِب} بە فەتحەی تائی بێت، ئەوا لە کاتی ئیعلال دەڵێی {تَبْيِع} ئەوە هەر بە ساغی دەیهێڵیەوەو ئیعلالی ناکەیت چونکە ئەگەر ئیعلالی بکەیت ئەوە إلتباسی بە فعلی -مضارع-ی دەبێت، چونکە {تَبْيِع} کە لەسەر وەزنی {تَضْرِب} بێت راستە کە موافقی فعلە لە حەرەکەو سکون، بەڵام موخالیف نییە نە بە زیادەو نە بە وەزنەکەی تایبەت بە ئیسمان، بەڵکو رێك لەسەر وەزنی فعلەو بەبێ هیچ شازییەك، کەواتە ناتوانین نەقلی حەرەکەی بۆ ماقبلەکەی بکەین، بەڵکە دەبێت یائەکە وەکو خۆی هەر بە مەکسوری بمێنێتەوە تاکو هیچ إلتباسی نەبێت بە {تَبیع} کە فعلی -مضارع-ە. ٢٠٠١/٨/٢٣

**پرسیار**

بۆچی {أبان ویزید} ئیعلال کراون ئەگەرچی موخالیفی فعلیش نین، چونکە هیچ وەزنی تایبەت بە ئیسمو زێدەیی خیلافی فعل نییە، بەڵکو أبان وەکو أجاب وایە، وە

هەروەها یزید وەکو یبیع وایە؟ ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: ئەمانە پێش ئەووەی بێنە ناو ئیعلال کراون، واتە لەوکاتەی کەوا فعل بوونە ئیعلال کراون.

## باسی ناقص

لە کاتێکدا مصنف رەحمەتی خوای لێ بێت لە باسی معتل العینی لە خۆبووەوە هاتە سەرباسی ناقص -معتل اللام-. جا کورتەی ئەو باسانەی کە مصنف لە معتل اللامی باسی دەکات ئەم باسانەی خوارەوەن:

١- ناوەکانی معتل اللام، وە لەبەرچی پێی دەڵێن {ذو الأربعة}

٢-مەرجەکانی قەلبکردنی واوو یائی بە ئەلف.

٣-لام الفعل حەزف دەکرێت لەو -ماضی- ەی لەسەر وەزنی {فَعِلُوا} بە بێ مەرج، وە لە {فَعَلَتْ وفَعَلَتا} بە مەرج.

٤-پاش حەزفکردنی لام پێشەکەی وەکو خۆی دەمێنێتەوە لە ماقبل مەفتوح و -مضموم-ی.

٥-حوکمەکانی فعلی -مضارع-ی لەو کاتەی ناصب و جازمی دەچنە سەری.

٦-یەکسانی جەمعی -مذکرو مؤنث-.

٧-ئیعلالی یرعو.

٨- ئیعلالی -تمطی-و براکانی.

٩-یەکسانی -مفردەی مؤنثەی مخاطبة- لەگەڵ جەمعەکەی لەو هەردوو بابەکانی {یرمی ویرضی.}

١٠- ئەمری بە صیغە لە ناقص.

١١-ئیسمی فاعل لە ناقصی لەگەڵ جەمعە تەکسیرەکانی.

١٢-فەعیلی بە مەعنا فاعل لەگەڵ جەمعە تەکسیرەکانی، هەروەها ئیعلالی غزایا.

١٣-فعیلی بە مەعنا مەفعول و قەلبی واوی بە یائو مەرجەکانی.

١٤- تنبیه لە باسی عدو ومغزو.

١٥-ئیسمی مەفعولی واویو یائی.

١٦-ئیعلالی -ثلاثی مزید فیه- لە معتل اللام.

(**الثالث المعتل اللام**) نەوعی سێیەم لەو حەوتانە معل اللامە، واتە:فعلێك یانە ئیسمێك لام الفعلەکەی حەرفی عیللەی بێت. (**ویقال له الناقص**) بەمعتل اللامی دەگووترێ ناقص لەبەر نوقصانی لە ئاخیرەکەی، چونکە ئاخیرەکەی ساغ نییە، وە هەروەها لە کاتی عامیلی جازمەی چووە سەر ئاخیرەکەی دەڕوا، وە هەندێك حەرەکەش قبول ناکات، جا لەبەر ئەم شتانە پێی دەگووترێت ناقص. (**وذوالأربعة لكون ماضيه على أربعة أحرف إذا أخبرت عن نفسك**) وە بەم معتەلە دەگووترێ {ذوالأربعة} واتە: خاوەنی چوار پیت، چونکە -ماضی-ەکەی لەسەر چوار پیتانە لەکاتی خەبەر لە بنی نەفسی خۆت بدەیت، وەکو {غزوت ورميت}، جا لەکاتی خەبەر لە بنی موخاتەب و موخاتەبەش دەدەیت هەروایە، بەڵام خۆی لە هەمووان لە پێشترە، ئەم فعلانە هەرچەندە خۆیان لەسەر سێ حەرفانن بەڵام بە هۆی ئەو -ضمیر-ە کەفاعیلەو وەکو جوزئی وایە بوون بە چوار پیت. جا یەکێك پرسیار دەکات خۆی هۆی ناونانەکە لە هەموو فعلێك مەوجودە وەکو أجوەفی, بۆچی تەنها بەوە دەڵێن چوار حەرفی؟ جا لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**وقد كان أولى بأن يكون على ثلاثة أحرف من الأجوف**) واتە: بەڕاستی ناقص شیاوتر بوو لە ئەجوەفی کە لەسەر سێ پیتان بووایە، چونکە حەرفی کۆتایی ناقصی لە جێی گۆڕانەو، هەروەها بە حەزف و قەلبیش دەگۆڕێت، بەڵام ئەجوەف ئاخیرەکەی حەرفی عیللە نییە (**فخرج عما هو الأولى به**) ناقص دەرچوو لەم ناوەی کە شایستەیەتی، واتە ناقیص شیاوی ئەوەی بوو کە پێی بگووترابا {ذوالثلاثة} نەوەك {ذو الأربعة} بەڵام ئەم ناوەی پێ نەگووترا، بەڵام ئایا ئەجوەفیش لەوە چۆتە دەر کە بۆی ئەصل بوو، بەوی پێی بگووترابا چوار پیتی نەك سێ پیتی، ئەمەشیان بە دوور مەگرە. جا لەوانەیە یەکێك بپرسێت ئایا ئەوانی دیکەی وەکو صحیح و مەهموزو موعتەلەکانی دیکە ئایا

ئەوانەش لە ناوی شایستەی خۆیان دەرچوونە؟ كە هەموویان چوار حەرفینەو پێیان ناگووترێت {ذوالأربعة}؟ جا لە وەڵامدا دەفەرموو (**دون غيره**) یانی غەیری ناقصی لە صحیح و ئەوانی دیكە، دەرنەچووینە لە ناوی شایستەیان، چونكە ناقص كە ناوبراوە بە چوار پیتی شتێكی غەریبە، چونكە هەموو جۆرە نوقصانیەكی دەهێتە سەر، ئەوجاریش (**ذوالأربعة**)، بەڵام ئەوانی دیكە هیچ نوقصانیان ناهێتە سەر تاكو ناوێكی نامۆیان لێ بندرێت، كورتەكەی وەكو ئەوە وایە كە پیاوێكی هەژارو شپرزە ببینیت ئەوجارەش پێی بڵێی ئاغا، ناقیصیش هەمان ئەو دەردەی بەسەر هاتووە (**وأيضا لايلزم التسمية من وجهها**) ئەمەشیان بەڵگەكی دیكەیە بۆ ئەوانەی چوار پیتینەو پێیان ناگووترێت چوار حەرفی، واتە: مەرج نییە هەركاتەك بەڵگەو نیشانەی ناوێك هاتە جێ تۆ هەمان ئەو ناوەی لێ بنێی، بەڵێ راستە نصرتُ چوار پیتیە بەڵام واجب نییە ناوی بنێی {ذو الأربعة} وەكو دەگووترێت هەریەك سمێڵ سوور بێت هەمزاغا نییە. جا لەبەر ئەوەی ئیعلالی ناقیص بە زۆر جۆرە دەیەوێت بە درێژی باسیان لێوە بكات، دەفەرمووێت (**فالمجرد**) واتە -ثلاثی مجرد- لە ناقیصی جا ئیسم بێت یانە فعل (**تقلب واوه وياءه ألفا**) لام الفعلەكەی قەلب دەكرێت بە ئەلف جا واو بێت یانە -یاء- بێت، بەڵام بە چەند مەرجێك (**اذا تحركتا وانفتح ماقبلهما**) واتە یائو واو دەكرێنە ئەلف لە كاتێك كە ئەم یائو واوە حەرەكەدار بن و ماقبلەكەشیان مەفتوح بێت، وەكو غزا ئەصلەكەی -غَزَوَ- بووە، بەڵام -غَزَوْتُ- ناكرێت چونكە واو ساكینە موتەحەریك نییە، هەروەها -لن يَغْزُوَ- ناكرێت چونكە پێش واوەكە لەسەری نییە بەڵكو بۆری هەیە (**ولم يكن بعدهما موجب فتح ماقبله**) مرجی دیكە بۆ قەلبكردنی واوو یائی بە ئەلف ئەوەیە كە لە پاش ئەم واوو یائە شتێك نەبێت كە فەتحەی پێشەخۆی بووێت وەكو ئەلفی -تثنية- كە لە مەودوا باسی لێوە دەكات (**ولا مشبهة به**) وە هەروەها لە پێش ئەم واوو یائە شتێك نەبێت بە وێنەی ئەو شتانەی كە واجبە ماقبلەكەی مەفتوح بێت، وەكو نوونی تەئكید، ئێستا ئەم نونە ئەگەرچی واجب نییە هەموو كات ماقبلەكەی مەفتوح بێت، بەڵام

موشابەهەی هەیە لەگەڵ ئەلفی -تثنیة-ەی لەوەی کە هەردووکیان پیتی حەزفکراو دەهێننەوە وەکو لە پێشەوە لە باسی ئەجوەفی باسمان لێوە کرد، جا لەم کاتەشدا واوو یائەکە ناکرێن بە ئەلف، وە هەروەها یائی موشەددەدیش ڕێ لەم قەلبە دەگرێت وەکو {علویّ} ئنجا دێتە سەر میسالەکان (**کغزا**) ئێستا -غزا- فعلی -ماضی ثلاثی مجرد-ە لە بابی یەکەمە، وە واوەکەشی ئەصلیە، چونکە ئەصلەکەی -غزو- بووە، واو لێرەدا کراوە بە ئەلف چونکە هەموو مەرجەکانی لێ هاتوونەتەدی، یەکێك دەڵێت: بۆچی بە ئەلف نووسراوە، لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**یکتب ألفا لیمتاز عن المنقلب یاء**) واتە: ئەم واوە بە ئەلف دەنووسرێت لە دوای قەلبکردنی بە ئەلف، تاکو جیا بکرێتەوە لەو ئەلفەی کە قەلبکراوی پیتی یائە (**فإنه یکتب یاء**) چونکە ئەو ئەلفەی قەلبکراوی یائی بێت هەر بە یائیش دەنووسرێت وەکو {رمی} ئەمەش بۆ فەرقکردن لە نێوانیان (**ورَمَی**) ئەمەش فعلی -ماضی ثلاثی مجرد-ە لە بابی دووەمە لامەکەی یائیە وە ئەصلیشە، ئەصلەکەشی {رَمَیَ} بووە، یائی کراوە بە ئەلف چونکە هەموو مەرجەکانی لێ هاتوونەتەجێ، وە ئەلفەکەش لێرەدا بە -یاء- نووسراوە (**وعصا ورحی**) ئەمانەی پێشەوە نمونەی فعلەکان بوو، ئەم دووانەش نمونەی ئیسمانن، -عصا- ئەصلەکەی -عَصَوٌ- بوو، وە -رحَی- ئەصلەکەی -رَحَیٌ- بوو، ئەم یائو واوە قەلبکران بە ئەلف، پاشان دوو ساکین بەیەك گەیشتن ئەلف و تەنوین ئەلفەکەمان حەزف کرد لە لەفزدا بەڵام لە نووسیندا هەر دەنووسرێت، جا ئەوەی بە ئەلف نووسراوە ئەوە واویە، وە ئەوەی بە یائیش نووسراوە ئەوە یائیە (**بخلاف غَزَوَا ورَمَیَا واخْشَیَنَّ**) گووتمان لە -غزا ورمی- واوو یائەکە کران بە ئەلف، چونکە تەواوی مەرجەکانیان تێدایە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەم سێ وشەیەو هاوێنەکانیان کە مەرجی ئیعلال کردنیان تێدا نییە، لە هی یەکەم ئەلفی -تثنیة- لە دوای لام الفعلەکە هاتووە، وە ئەم ئەلفە ڕێگا نادات واوەکە بکرێتە ئەلف، هەرچەندە خۆی حەرەکەدارەو حەرفی پێشەخۆی مەفتوحە، چونکە ئەگەر واو کرا بە ئەلف ئەوە دوو ئەلف کۆدەبنەوەو واجبە یەك لە دوو ئەلفەکان حەزف بکرێت چونکە

دوو ساکین بە یەك دەگەن، جا لەم کاتە تۆ نازانی -غزا- موفرەدە یانە -تثنیة-یە، وە رمیا بە هەمان شێوە، وە لە -تثنیة-ی دوو ئیسمەکانیش ئەگەر واو بکرێتە ئەلف، واتە {رحیان} واجبە ئەلفێك لابدرێت، جا دەبێتە رحان، جا لەکاتی ئیزافە کردن دەگووترێ {رحا زید وعصا زید} نازانی ئایا موفرەدە یانە -تثنیة-یە، بۆیە ناچارین لە هەموو -تثنیة-کان واوو یائەکان وەکو خۆیان بمێننەوە بە ساغی، جا با بێینە سەر باسی {اخْشَيَنَّ}، بەڵێ ئێمە گووتمان ئەگەر یائەکە قەلبیش بکرێت ئەوا التباس نابێت بە هیچ شتەکی، بەڵام گووتمان ئەم نونی تەوکیدە دەشووبهێتە ئەلفی -تثنیة-ی لە گێڕانەوەی مەحزوفی، کەواتە دەستکاری ئەم بێیە ناکەین، وەکو هی -تثنیة- لێرەدا هەندێك باسی دیکەش هەن بەڵام با ئەوەندە بەس بێت (**وكذالك الفعل الزائد على الثلاثة واسم المفعول منه**) واتە هەروەکو مجردەکان وایە لەم موعتەلەدا ئەو فعلانەی کە زیادن لەسەر سێ حەرفان، جا -ثلاثی- مزید بێت یانە رباعی بێت، هەروەها ئیسمی مەفعولیش لەو فعلانەی زێدەنە لەسەر سێ حەرفان، ئەم جۆرە ئیعلالەی پێشوو بۆ ئەمانەش دەکرێت وەکو لە نمونەکان دیارە (**كأعطى واشترى واستقصى**) ئەمانە نمونەی فعلە مەزیدەکانە، ئێستا -أعطى- فعلی -ماضی- یە لە بابی إفعالە، ئەصلەکەی {أعطو} بووە واو لە پلەی چوارەم کراوە بە {ی}، وە هەروەها إستقصی ئەصلەکەی إستقصو بووە لە بابی إستفعالە واوەکەی کراوەتە یائو، ئنجا لە هەموویان کراوە ئەلف (**والمعطي والمشتري والمستقصي**) ئەمانەش ئیسمی مەفعولن لە -ثلاثی مزید-ن یەکەمیان لە بابی إفعالە، دووەمیان لە بابی إفتعالە، وە سێیەمیان لە بابی إستفعالە، ئەصلەکشیان {معطو مشترى مستقصو} بووە، لە هی یەکەم و لە هی سێیەم واو کراوەتە یائو ئنجا لە هەموویانیائیش کراوە بە ئەلف، چونکە تەواوی مەرجەکانیان تێدایە. یەکێك دەڵێت: تۆ گووتت ئەو ئەلفەی قەلبکراوی واوی بێت دەبێت بە ئەلف بنووسرێت، کەچی ئێستاکە هەموویان هەر بە {ی} نووسراون؟ جا لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**كتب في الجميع ياء**) یانی ئەم یائە لە هەموویان هەر بە یێ نووسراوە لە ئیسمان

و لە فعلان (**لأن الواو التی بعد الثلاثة تقلب یاء ثم ألفا**) چونکە یاسا وایە هەر واوێك واقیع بێت لە دوای سێ پیت، واتە لە پلەی چوارەم یان زیاتر بێت،یەکەمجار دەکرێتە یێ -بەڵام پیتی پێشەوەی بۆر نەبێت- ئنجا دەکرێتە ئەلف، کەواتە ئەم ئەلفە قەلبکراوی واو نییە هەتا بە ئەلف بنووسرێت، بەڵکو قەلبکراوی یائە بۆیە بە یائیش دەنووسرێت. یەکێك دەپرسێت: کەواتە چۆن دەتوانی جیاوازی لە نێوانیان بکەیت؟ تابزانی کامەیان واویو کامەیان یائیە؟ ئەمیش لە وەڵامدا دەفەرمووێت (**والتمییز بالمجردات**) واتە: جیاوازی لە نێوان واوی‌و یائی بەهۆی موجورەدەکانە، بۆ نمونە -عطا- کە موجەرەدی -اعطی-یە بە ئەلف نووسراوە کەواتە واوییە، وە هەموومان دەشزانین کە لام الفعلەکەی واوە، هەرچەندە بە یائیش نووسراوە، بەڵام شری کە مجردی اشتری یەبە یێ مووسراوە لە مەزیدو موجەرەدی دیارە یائیە (**وکذا تقلبان إذا لم یسم الفاعل من المضارع**) واتە هەروەها واوو یێ دەکرێنە ئەلف بەم شێوەی رابردوو لە کاتێکدا کە لەم فعلە -مضارع-ە فاعیلەکە ناونەبرا بێت، کە دەکاتە فعلی -مضارع-ی بینا مەجهول، جا مەزید بێت یانە موجەرەد چونکە مەرجەکان مەوجودن (**کقولك یَعطی یَغزی ویَرمی**) هی یەکەمیان فعلی -مضارع- مەجهولە لە بابی إفعالە، دووەمیان مەجهولە لە بابی یەکەمە، ئەسلەکەیان {یَعطَو ویَغْزو} بووە، واوەکە کراوە بە یێ، چونکە لە چوارەمەو پێشی بۆری نییە. وە {یَرمی} لە بابی دووەمە وەکو {یَرمی ویَضْرب} بەڵام یائیە، جا لە هەرسێکیان لام الفعل کراوە بە ئەلف چونکە هەموو مەرجەکان مەوجودن. ئەمە -مضارع-ی مەجهول بوو. ئنجا دێتە سەر باسی -ماضی مەجهول- بۆیەش لێرەوە باسی لە -مضارع- کرد چونکە گونجاوە لەگەڵ یاساکانی ئەم باسکراوانە، ئەگینا -ماضی- لە پێشترە. جا لەوەی باسمان کرد فعل و ئیسم هەردووکیان هاوبەش بوون، ئەمجارەیان باسی فعل بە تایبەتی دەکات، فعلی -ماضی- سێ جۆری هەیە چونکە عین الفعلی یان مەفتوحە یان مەکسورە یان -مضموم-ە.

جا دەفەرمووی (**أما الماضي فتحذف منه اللام في مثال فعلوا مطلقاً**) واتە لە فعلی ماضي حەزفی لام الفعل دەکرێت لەهەر میسالێك کەلە سەر وەزنی (**فعلوا**) بێت، یانی هەر ماضیە ك کە واوی جەمعی مذکری پێوە لکابێت، بەمطلەقی لامی لادەچێ یانی ئەم فعلوا عەین الفعلی سەربێت وەکو غزوا یان ژێر وەکو رضی یان بور وەکو سروا ومجرور بێت یان مەزید واوی بێت یان یائی: هۆی لادانی ئەم لامە ئەوەیە کەخوی حەرەکە دارە لەبەر واوی جەمع: وە پیتی پێش خۆشی یان سەری هەیە جا ئەم لامە قەلب دەکرێ بەئەلفو لادەدرێ وەکو غزووا یان ژێری هەیە یان بۆری هەیە بێ گومان ژێرو بۆرگرا نن یان حەزفیان دەکەین. یان نەقل بۆ پیتی پێشو. جابە هەموو حالێك دوو ساکن دەکەین بەیەك، کەلامی قەلب کراوە یان ساکن کراوە، لەگەڵ وواوی جەمع، بەناچاری لام لادە دەبرێ.

(**وفي مثال فعَلتْ وفعلَتا إلا انفتحَ ما قبلها**) هەروەها لام الفعل حەزف دەکرێت لەم دوومسالە. یەکەم فعلتُ (تی) تەئنیس پیوە لکاوە بۆ مفردی مؤنثی غائبە. دووەم فعلتا کە بۆتەنیثەکەیانە بەڵام ئەو جارە بەمەرجە مەرجەکەش ئەوەیە لەکاتێك لام لەم دوو فعلە حەزف دەکرێت، کەپیتی پێش لامی سەری هەبێت، جائەم پیتە عەین الفعل بێت وەکو (**رَمَيَتْ**) یان ناو وەکو اسلتقَيَتْ. کەلێرە (ی) زیادە، بەڵام بەهەر حاڵ (بی) قەلب دەکرێ بە ئەلفی وحزف دەکرێ لەبەر (التقاء) لەگەڵ (تی) تەئنیث: یەك دەڵێت التقاء الساکنین لەمفردەکەی کە (فَعَلَتْ)ە دیارە، بەڵام لەتئنیثە کەی کە (فَعَلَتَا) نەبوە، چونکە (تی) حرەکەی هەیە جا لە وەڵامدا دەفەرموێ ( **ولم یعتدوا بحرکة التاء**) واتە عەرەبەکان هیچ (اعتبار)یان بەحەرەکەی (تی) نەکردووە، وەهیچ ریزیان بۆ دانەناوە( **لوضعها علی السکون**) چونکە ئەم (تی) یە لە ئەسلدا لە سەر سکون (واتە دەنەدار) داندراوە، وە بەهۆی ئەم ئەلفە حەرەکە داربووە، کەواتە وابزانە التقاء بووە لەنێوان ئەم دووساکنە کە (تی)یە لەگەڵ لامی قەلبکراو بە ئەلف: یەك دەڵێ لە ئەجوەفی باسکرا کە صونا. ئەسلەکەی صُنْ بو . کەئەلفی تەئنیە هات واوەکەی گەراوە، بۆلێرەش وانەبێت، لەوەڵامدا

بە مانا فاعل وفعولی بەمانا مفعول یان بۆ مذکرو مؤنث. لە مفعولی بەمانا مفعول. بەلاّم هی بە مانا مفعول: هیچم لی نەدیوە (جا قطف النظیف) ئەمە نەقل دەکات: بەلاّم جەلی زادە دەفەرمویٚ ئەمە فعولی بەمانا مفعولە: کەئەسلە: هەر لەبەر ئەوە جمع السلامەشی بۆ هیٚناوە پاشان سیٚ تکسیرەکانیش باس دەکات: کە گوتراون لیٚرەدا یانی غزو غزواء اغزاء پاشان دەلیٚت (**لهما**) بۆ مذکر ومؤنث: ئەوجار دیٚتە سەر هی بەمانا فاعلو دوو ووشەی تەکسیر دەلیٚت: یەکەم اغزاء: دووەم غزي. بەضمەی یەکەم وفتحەی دووەمی بەشەددە. جا برای فەقیٚ ئەگەر لەبیرت بیٚت ئەم سیٚ جەمعەی کەلیٚرە باس کراون هی فعولی بەمانا فاعل بون کە گوتی (نصر) بە دووضمە (نصراء) بەضمە ی یەکەمی وفەتحەی دووەمی: انصار: سکون لەنیٚوان دووفەتحە: بەلاّم ئەوەی راستە ئەم تەمو تۆزەی کەلەوێیا هەبوە: هاتەوە ئیٚرەش کەشوبهاندنی شتیٚك بە خودی خۆی (**والله اعلم الحقیقة والصواب**) (**وتقول في إسم المفعول من الواوي**) یانی تۆدەلیٚت لەئیسمی معفولی ثلاثی مجردی واوی( **مَغْزو**)وەکو منصور ئەسلەکەی مغزوو: بوو بە دوو واو: هی یەکەم دەغم کرا لەهی دووەم( **ومن اليائي مرمی**) تودەلیٚت لەئیسمی مفعولی ثلاثی مجرد یائي مرمی (**اصله مرموی بقلب الواو یاء**) ئەسلەکەی (مرموی) بوو. وەکو مضروب. قەلبی واوی کرا بە (ی) بوبە مرمی : جا هی یەکەم دەغم کرا لەهی دووەم: بوو بەمرمیّ. پاشان میم ژیٚر کرا لە بەر (ی)( **لأن الواو والياء إذا اجتمعتا في كلمة واحدة. واولاهما ساكنة**) واتە قەلبی واوی کرابە (ی) چونکە یاسایە. هەرکاتیٚ واو و(ی) کۆبونەوە لەیەك ووشەدا: وە هی یەکەم ساکن بوو( **قلبت الواء یاء وأدغمت الياء في الياء**) قەلبی واوی دەکری بە (ی) وە (ی) لە (ی) دەغم دەکریٚ (**وكسر ماقبلها**) جا پیتی پیٚش (ی) مەکسور دەکری. وەکو گوتمان. بەلیٚ ئەمە یاسایە بۆ هەرشویٚنیٚك بەم شیٚوە بیٚت. بەلاّم چەند مەرجیٚك بۆ ئەم یاسایە هەیە ئەیەویٚت باسیان بکات فەرموی (**بشرط ان لا يكون الأول منهما بدلا**)مەرجی یەکەم ئەوەیەنابیٚهی‌یەکەم لەم واو و (ی)یە. لە جیاتی هیچ پیت هاتبیٚ (**كوسُوِيرَ**

**ودیوان)** ئێستا سُوِیر. بینا مفعولی ماضیە کەبینا فاعلەکەش سایر)ە وەکو قاتل. واو ویێ)کۆ بوونەوە: وەهی یەکەم ساکنە. بەڵام قەلب ناکرێبە (ی) چونکە ئەم واوە لە جیاتی ئەلفی هاتیە. کە ئەلف لەبابی قاتلە)ەی دەکرێ بەواو. لەکاتێ کرا بە مجهول وە دیوان: ئەصلەکەی (دِووان)بو واوی یەکەم کرا بە(ی)کەواتە ئەم بیە بەدەلی واویە ناتوانین. ئەم ئیعلالی پێشوی بۆ بکەین چونکە سویر ئیعلال بکرێ دەبێتــە سیَر التباسی بە مجهول ماضی بابی تفعیل دەبێت ( **وان لا یکون فی افعل ولا اعلم)** مەرجی دوەم ئەوەیە. ئەم ئیسمەی کەئەم واو و(یی)یەی تێدایە، نابێت لەسەر وەزنی افعل)ەی بێت. وەنابێت (علم) واتە ناو بێت( **نحو أیومَ وحَیْوَةً)** ئێستا أیْوَم. وْحَیْوَة. لە هەر دوکیان واوو(ی) کۆبونەتەوەوەهی پێشو وەیەکەمیان ساکنە لەگەڵ ئەوەش واو ناکرێ بە (ی) چونکە هی یەکەم لەسەر وەزنی (أفعل)ەیە. ئەم (افعل)یەش. گۆڕانی تێداناکرێ: وەکو لە ئەجوەفی باسکرا: وەهی دووەمیش لەبەر ئەوەی کە (علم)ە ناوە وەکو مشتقاتەکانی نیە بۆ ئیعلال کردن **(وان لا یکون الیاء للتصغیر إذا لم یکن الواو طرفاً** )مەرجی تر ئەوەیە نابێت ئەم یّیە بۆ تصغیر بێ لەکاتێ: کەواو لە دواوە نەبێت: بەڵام ئەگەر واو کەوتە دواوە: هەرچەند بۆ تصغیریش بێت : ئیعلال دەکرێ وەکو دُلَیّە. تصغیر (دَلْو)یە. کەتصغیر کرا. دەبێتە دُلَیوة. چونکە واو لە دواوەیە ئیعلال دەکرێ. بەڵام ئەگەر واو لە دواوە نەبێت لەمە هەردوکیان: ئیعلال واجب نییە **(نحو اسیود)** ئێستا اسیود تصغیری اسود)یە: لێرە دا واو لە (طرفی)نیە دەتوانی ئیعلال بکرێ. بڵێت أُسیِّد. وە دەتوانی وەك خۆی بمێنێ **(وکثر فی الواوی مَغْزِی)** واتە زۆرە لە ئیسمی مفعول : کەواوی بێت وە عەین الفعلەکەی مفتوح بێت (مَغْرِي) کە هەر دووك واوەکانی کرا وە بە(ی) (وان خالف القیا س) هەرچەند ئەم هاتنەش بە پێچەوانەی یاسایە. کەیاسا وابوو واوەکان دەغم بکرێن **(تشبیها بنحو عُتیی)** جا کەم ئەم ئیعلالەی بۆ کرا وە چونکە شوبهاند راوە بە (عُتیَی) وهاو وێنەکانی. چونکە گوتمان عُتیِّيٌ، جمعەو گرانە.

پێویستە سوك بكرێت، ومغزيٌّ پیتەکانی زۆرنو گرانە سوکی دەکەین: ئەگینا ئیمە گوتمان تەنها لەجەمعی (اعتبار) بە مەددە ناکرێت لەمفردی دەکرێت: ئەوەمان باس کرد (بگە رێوەدواوە دە زانی) جاگوتی ئەم ئیعلالە زۆرە لەواوی بەلاّم دیارە واجب نیە. ئەمما لە ئیسمی مفعول یائی وەکو مُرْمِي کە ئەسلەکەی مَرْمُوی بوو. واجبە ئیعلال بکرێت. وە ئەوەی کەعەین الفعلەکەی مفتوح نەبێت وەکو رضي ئیعلال دەکرێت. وەکو مرضی وئەگەر هەردوکی واو بێت وەکو قووَ ئەویش ئیعلال دەکرێت وەکو مقويٌّ کە ئەسلەکەیان مرضوی وە مَقْوُوٌّ: بەسیّ واو: یەك رەخنە دەکرێتو دەلێت بۆچی (مغزوٌّ)دروستە بلێت (مغزيّ) بە ئیعلال . بۆ دروست نیە لە (عَدَوّ) بلێت (عديّ) کەچی هەردوکیان مفردن وە لە هەردوکیان مەددە هەیە لە نێوان واو وەضمە: جا دەفەرموێ (**ولم يجز في نحو عدو مفرداً عدي**) واتە رێگانەدراوە. لە (عَدُوّ) وە هاووێنەکانی کە مفردە (عَدِي) واتە دروست نیە بلێت عَدِيٌّ. بە ئیعلال کردن ( **مع صدق قاعدة وقوع الواو رابعة** ) لەگەل ئەوەش ئەم قاعدەی تێدا مەوجودە کە دەلێت واو لە پلەی چوارەم و ما قبل غەیرە مضموم. دەکرێت بە (ی) (**لعدم الاعتداد بالمدة**) چونکە هیچ گرنگی بەو مەد دەیەنەدراوە کە لە بەینی واو ودضمە هەیە. یانی حیسابی شت نە بووی بۆکراوە (**فكأن ما قبلها مضموم**) کەواتە وابزانە کە پیتی پێش لام الفعلەکەی بۆرە: وە بە سیّ پیتی دەژمێری. واوەکەی لەپلەی چوارەم نەبوو: یەك دەلێت ئەدی بۆ چی لە مغزی ریگادراوە. واو قەلب بکریّ بە (ی) بە گویرەی ئەم یاسایە، بەلاّم لە (عد وّ) رێگا نەدراوە لەوەلاّمدا دەلێت (**وإنما اجازوا في مَغْزِي لأنه اثقل** )نیە کەرێگا درابێت لە مغزی کەواوی قەلب بکریّ بە (ی) مەگەر لەبەر ئەوە کە گرانترە لە (عَدُوٌّ) لەبەر ئەوە کە پیتەکانی زۆر ترن ئەوە بەلگەی یەکەم بوو) بەلگەی دووەم دەفەرمووێ (**ولأنه قلبت في فعله المجهول**) قەلبی واوی کرا بە (ی) لەمغزی چونکە لەفعلە مجهولەکەش کراوە. وە کوو یُغْزِي. ئەسلەکەی یُغْزَوُ بوو. واوی کراوە بە (ی) پاشان بەئەلف : لەبەر یاساکان پێشتر جالیّرەدا دەرکەوت کەهەر صیغەك فعلەکەی کرابیّ خۆشی دەکریّ ئەگینا

ناکری ( **ولذا لم يأتي من نحو يُرْضى الأ مَرْضِيّ**) یانی لەبەر ئەوەکە گوتمان ئەوانە تابیع وشوین کەوتووی فعلەکەیانن لە ئیعلالدا: نەهاتووە. بە قیاس لەم فعلە کە یُرضی)یەوە وەهاو وێنەکانی. یانی فعلی مضارعی بابی چوارەم بێت واوی بێت وە واوەکەش کرابێت بە(یی) پاشان ییەکەش کرابێت بەئەلف: لەم جۆرە ووشەدا تەنها مرضیٌّ دورِستە لەئیسم مفعولەکەیان. کە ئەسلەکەی (مرضوو) بوو. بەدوو واو، جا واوی دووەم کرا بە(یی) بەپێی یاسا. پاشان واوی یەکەمەکەش کرابە(ی) بەپێی یاسای تر ئەوجا (ی) لە (ی) دەغم کرا یاسایەکان رونن ودیارن: جابو بە مَرضِیٌّ :کە هەر بەم شێوەیەش دورستە چونکە هە موفیعلەکانی ئیعلال کراون ماضی بێ یاخود مضارع وە مجهول بێت یان معلوم (**وفعل عدوّ معلوم کیعدو**) وەحال وایە ئە فعلەیکە (عدو) لێوەرگیراوە فعلەکەی معلومە، وەکو(عدا) (یعدو) وە قەلبی واوەکە نەکراوە بە (یی) کەواتە (عدو) کە (فعول)ەوە لە (یعدو) وەرگیراوە، وە بەمعنای فاعلە، واوەکەی قەلب ناکرێت بە(یی).

### پوختەی ئەم باسە

ئەوەیە گوتمان ئەم ووشانە تابیع و شوێنکەوتوی فعلەکانی خۆیانن، جا ئەم فعلە سێ جۆرە، (١)یان واجبە ئیعلال بکرێت (٢) یان قەدەغەیە (٣) یان دورستە ئیعلال کردن یان نەکردن. جا ئەگەر فعلەکە (واجب الاعلال) بوو فعول ومفعولەکەش واجب دەبن وەکو (مرضی )، وە ئەگەر قەدەغە بێت ئەوانیش قەدەغەدەبن، وەکو(مغزوّ وەمغزیّ) بەهەردووك شێوە: چونکە فعلە مجهولەکەی کرا وە، وەکو (یُغزی)، بەلام معلومەکەی نەکراوە وەکو (یغزو): ئەمەبائەوەش بزانین کە بەرێزی فەرموی (فعلی عدوّ) هەر مەعلومە ئەوە لەسەر بۆچونی هەندێ لە زانایان. چونکە ئەوان دەڵێن فعول وەکو(عدوّ) هەر بەمانا فاعیل دەبێت، کەواتە فعلەکەی هەر معلوم دەبێت، بەڵکو وادەبێت هەرمجهولیش دەبێت وەکو (یُعدی)، جا لەو کاتیدا و ئیعلال دەکرێ یەعنی واوەکە دەکرێ بە (یی) پاشان (یی) دەکرێ بەئەلف.

## تنبیه

ئەمە ئاگادارکردنەوەیە، کە ئەوەی رابردو بینەوە یاد خۆت ئامادە بکە بۆ ئەوەی دێت، .ئەم ئاگادارکردنەوەیە بۆ باسێکی گرنگە کە ئەوەیە ئێمە دو یاسامان هەیە (١) واومتطرف وما قبل مضموم (٢) واو واقع بەچوارەم و زیاتر، کە لە هەردوکیان واو دەکرێ بە(یێ) مثالی یەکەم وەکو (التمطو) وە مثالی دوەم وەکو (واعطو) کەباسکران، پاشان ڕوبەڕوی دووشە هاتین کە(عدوّ)و (مغزیّ)ە کە ئەصلەکیان (عَدُوْوٌ) و (مَغزُوْوٌ) بووە. جا ئەگەر حیساب بۆ ئەم مەددەیە نەکەین ئەوە داخیل بەیاسای یەکەم دەبن. وەئەگەر حیسابی بۆ بکەین ئەوکات داخیل بەیاسای دوەم دەبن. کە واو واقع بەچوارەمە هتد. لەگەل ئەوەش ئعلال نەکراوەن . جا دەفەرموێت (**لم یعتدوا فی عَدُوّ ومَغْزوٍ. علی ما هو القیاس بالمدة**) واتە اعتباریان نەکردوە لە وشەی (عدوّ)و (مغزو)ی بەگوێرەی یاسا بەم مەدەیە یەعنی ئەم مەددە یە لێرەدا بەپیت دانەندراوە: بەڵکو بەنەبوی دانراوە وەئعلالی بۆ نەکراوە مەگەر بەخیلافی قیاس وەکوگوتی تەشبیە کراوە (عُتیی) لەچیدا (**فی قاعدة وقوع الواو رابعة فصاعداً**) حیسابی بۆنەکرا وە لەیاسای واو وا قع بەچوارەم وزیاتر. کەواتە لە ووشەی (عدو) نە واو چوارەمە وە نەماقبلیشی غەیرە مضمومة وەلە ـهی دووەم ئەگەر چوارەم بێت بەلام ماقبلی غیرەمضموم نیە، بەڵکو مضمومة جائەم ئعلالەی (اعطو) بۆیان نەکرا. وە ئەمەشمان لەیاد نەچێت کە(عتووّ)ش هەروابوو بەلام لەبەر ئەوەی جەمعە وگرانە ئعلال نەکرا (**واعتدوا بها فی المفرد فی قاعدة عطی**) واتە اعتباریان کردوە بەم مەددەیە، لەم دوو وشە ، مفردەکە (عدوُّ وە مغزووّ) بەگوێرەی یاسا معطی کەئەوەبوو (**واومطترف ماقبل مضموم**) جا لەم دوو وشەیەدا دەڵێن واو مطرف ە بەلام ماقبل مضموم نیە، بەڵکو غەیرە مضمومة، کە ساکنە، چونکە ئەم واوە ئەمجارە بەمەوجود حیساب کرا ، بەمردوو حیساب نەکرا.وە وەکو لەیاسای پێشتر بەمردو حیساب کرابو: کەواتە ئەمجارەش ئەم دوو ووشە ئعلال نەکران ، هەروەك بەخۆ دەفەرموێت (**فامتنعوا من القلب فی کلتا القاعد تین**) واتە لایانداو خۆیان

پاراست لە قەلب کردنی ئەم واوەی کەلام الفعلە لەم (فعول ومفعول)ە لەهەردوك یاساکانی باسکراو. واتە بەگوێرە هەردوك یاسا واو نەکرا بە(ی) **(فی فعولٍ وجوباً ومفعولٍ اختیاراً)** جا کەخۆیان گرت لە م ئعلالە بەگوێرە نەگونجانی ئەو دوو یاسایە، لەفعول ی کە(عدوّ) بەواجب خۆیان گرت، هەرگیز واوەکەیان نەکرا بە(یی)بەلاّم لەمفعولی کە(مغزو)نە بەهەلبژاردن و پەسند کردن واتە پێیان باش بو کەئیعلالی نەکەن بەلام بەحمل بەسەر(عتی) یئیعلالیان دەکرد وەکو باسمان کرد**(والکل موجّة)** واتە بایەخ پێکردن پێنە کردنی ئەم مەددەیە خاوەنی پایەن وباشن ولەجێنە. وەشایەنی روتێکردنن. یەکێك رەخنە دەگرێت ودەلێت چۆن دەگونجێت ئەم مەددەیە لەیەك حالدا بەمردوو بەزیندو دابندرێت: لەولاّمدا دەفەرموێت **(ولاضیر فی اعتبارین المتضادین)** واتە هیچ زیانی نیە وە رێگا ناگرێت لە کۆبونەوەی دووشتی وا،کە هەر بە اعتبارە بەحەقیقەت نیە. وە هەردوکیشیان دژی یەك وپێچەوانەی یەکترن کەجارێك ئەم مەددیە بەهەبوی دادەنرێت وەجارێکیان بەنەبوی دادەنرێت چۆن **(بالنضر الی قاعدتین)** کە ئەم بایەخدان ونەدانەش لە روانگەدا بەگوێرەی دویاسایە کەواو متطرف هتد وە واو واقع بە هتد وەئەگەر بەگویرەی یەك یاسا بوایە قەدەغەبو بەلام کەوا کراوە لەبەر ئەوەیە. تاکو توشی دو اعلال نەبین لەیەك وشەدا بەبێ (ضرورة) **(وتقول فی فعول من الواوی عدووّ)** تۆ دەلێت لە فعولی بە مانا فاعیل بۆ مذکر وموئنث کەفعولە کەش واوی بێت (عدووّ) ئەمە مفردە ئەصلەکەو عدووّ بوو واو دەغم کراوە (عَدُ وّانِ) (عَدُوِّین) ئەمەش تەثنیە بۆ مذکر و بۆموءنث حالەتی رفع ونصب جەرر. وەزانش مان کەجەمعی تەکسیر هەیە، بەلام جەمعی سەلامە نیە: وەلەتکسیر دوو وەزنی هەیە **(اعداء عدِیّ بالضم والکسر)** یەکەم جەمع تکسری اعداء، ئەصلەکەی اعداو بووە، دووەم غدیّ، بەم فەرمودەکە دەلێت ( بالضم والکسر) یان مانا وایە بەضمە و کسرەی یەکەمی: یان بە(ضمة)ی یەکەمی کەسرەی دووەمی: ئەمە دو لۆغەت **(وهذا جمع لا نظیرلە)** واتە ئەوەی دوای کە(عدیّ ) جەمعەکەی هیچ وێنەی نیە بۆ

(فعول)ی. واتە فعول لەهیچ شوێنی تر بەم شێوەیە جەمع نەکراوەتەوە، تەنها ووشە (عدو) نەبێت بەلام جەمع لەووشە کانی تر لەسەر ئەم وزنە هاتوە وە(جثیّ)کە جەمعی (جاثٍ) یە ،یان وەکو(مضیّ)کە مفردە یەکێك رەخنەدەگرێت دەڵێت (عدوّ) فعول بەمانا فاعیلە (مذکر و موءنث)یش لەوێ یەکسانن کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەبینم عەرەب دەڵێن: (عدوة الله) واتە(تێ)ی تەئنیث زیاد کراوە، لەوەڵامدا دەڵێت (**وقالوا عدوة الله حملاً علی صديقة**) واتە عەرەب گوتویانە عدوة الله یانی(تی) زیاد کراوە بۆ تەم مفعولە کەچی گوتمان بۆ مذکر و بۆ موءنث وەك یەك وایە لەبەر ئەوە دەگوترێ عدوة الله کەحەمل کراوە بەسەر ووشەی صديقة، چونکە صديق فعيل بە مانا فاعیلە مذکر و بو موءنثی تێدا یەکسانن، بەڵکو بۆ مذکر دەگوترێ صديق، بۆ موءنث دەگوترێ صديقة جا (عدو)حەمل کراوەتە سەر صديق یجیاوازی خستراوەتە نێوان مذکر وموءنثة لەبەرچی (**لتضادهما**)، چونکە ئەم دوو وشەیە کە(عدو) کە (صديق)ە دژی ی یەکترن چونکە عدو واتە دوژمن ،صديق واتە دۆست، جا ئەمە زەرورە کە دوشتی دژ بەیەك لە یاسا کۆ ببنەوە. وەدەشتوانین بلێین (**نظير**) یەکن چونکە هەردوکیان بەمانا فاعل ن (**ومن الياء بغيّ**) تۆ دەڵێیت لەفعولی کە یائی بێت: بغيّ: ئەصلەکەی بغوی بووە (**اعلالة كمرميٍّ**) ئعلالی وەکو(مرمی )وایە واتە واو(ی)کۆ بونەتەوە ، واوکراوە بە(ی) وە دەغم کراوە وەما قە بلە کەی مکسور کراوە (**تقول بَغِيّ بغيّان بغاياً** ) واتە تۆ دەلێت لەمسالەکانی بغيّ ئەمە مفردە ،بغيان وبغيين ئەمەش تثنيەیە لە هەرسێك حالەت بغاياً ئەمەش جەمع تەکسیرە: بۆ مزکر موءنث چونکە لە فعولی بەمانا یەکسانن (**وتقول فی فعيل من الواوی صبيٌّ**) واتە تۆ دەڵێیت لە فعيل ی بەمانا فاعل لە واوی صبيٌّ ئە مە مفردی مزکرە، ئەصلە کەی (صبيوٌ)بووە ئعلالەکەی دیارە (**صبيان صبيينِ**)تەثنیە لەهەرسێك حالەت (**صبيون وصبينَ**) ئەمەش جەمعە لەهەرسیێ حالەت (**صَبِيّة صبيانِ صبيين صبيات**) ئەمەش بۆ موءنث مفرد و تثنیە و جمع السلامة (**صبايا**) ئەمەش بۆ جەمع التكسيری موءنثە وەبۆ مزکرانی باس نەکرد کە

هەندێکیان ئەمانەن (**صبية وصبيان واصبية وصبوان**) هتد (**اصلهما صبائُوٌ وبغائو فاعلاً كغزايا**) واتە ئەصلەکەی صبايا وبغايا، ی : صبايو وبغايو بووە ئیعلال کراون وەکو ئیعلالی غزایا لە پێشان باس کرا تەماشای بکە ،قەزلجی دە فەرموێت بغايا واوی نیە بەڵکو یائ یە واتە ئەصلەکەی بغائی بوە (**ومن اليائیشریّ فی سریع السیر**) تۆ دەڵێت لەفعیلی بەمانا فاعیل لە یائی: شَرِیٌّ ئەصلەکەی شریِیٌ بووەبە دوو یائ . وە یەکەم دەغم کراوە لەهی دووەم ودبەمانا فلان کەس رۆیشت بەپەلەو بەغاردان (**تقول شریّ شریان شریین شریون شریین**) تۆ دەڵێت لەمیسالەکانی (شری )مفردی مزکر شریان شریین وە تثنیە (شریون) (شرین) جمع السلامیە لەهەرسیّ حالەت (**ما سمعت مكسرة فی ایِّ صیغة هو**) واتە گویّبیست نەبومە بۆ جەمع التكسیری فعیلی بەمانا فاعل لەم وشەیەدا، لە هەر صیغەیەك کە بۆ ئەم فعیلە هاتوە لە دەصیغەکانی رابردو لەباسی فعیلی بەمانا فاعل بەلام دەشتوانی قیاسی بەسەر صحیحی بکەی بۆ جمع التکسیرەکان (**شریة شریتان شریتین شریان شرایا**) ئەمەش میثالی موءنثان، شرية مفردە شريتانِ شريتِن، تەثنیە یە لە هەرسێك حالەت شريان جمع السلامەیە وشرایا .جمع التکسرە وەئیعلالەکەی وەکو غزایا وایە (**والثلاثی المزید فیه تقلب واوه یاء**) ئەمەش عەطفە بەسەر ئەم فەرمودەی خوی کە لەسەرەتاو ناقصی فەرموی فالمجرد واتە ثلاثی مزید لە معتل الام ی قەلب دەکریّ واودکەی بە (ی) جاماضی بێت یان مضارع وەکو اعْطَوَ (**لان كل واو وهو لام لم يعقبه لام اخرى**) چونکە یاسای وایە کەهەر واوێك لام الفعل بێت وەهیچ لامی تری لەدواوە نەهێت (**ووقعت رابعة فصاعداً**) وە ئەم واوەش لەپلەی سێیەم بێت بەلکو چوارەم وەیان زیاتر (**ولم يكن ماقبلها مضموما حقيقة كيغزو اوحكما كعدوٍ**)وە حەرفی پێش ئەم واوەش مضموم نەبێت بە حەقیقی وەکو یغزو، کە ئەمەحەرفی پێش مضمومە بەحقیقی: وەهەروەها حرفی پێشی مضموم نەبێت بەحوکمیش وەکو عَدُوَ کە ئەصلەکەی عدووە لێرەدا هەرچەندە ئەم واوی ئاخیری چوارەمە بەلام واوی پێش خۆ حیسابی بۆ نەکراوە. کەواتە

حەرفی پێش خۆی پیتی دالە، وە ئەم دالەش مضمومە، وەبەر ئەم یاسایە ناکەوێت. جاهەر واوێك بەم شێوەیە بێت کە گوتمان **(قلبت یاءً ثم الفا)** قەلب ئەم واوە دەکرێت بە(ی) پاشان (ی)دەکرێت بەالف بۆ سوك کردنی ئەم ووشەیە : جاگوتمان هەر واوێك لام بێت ئەم ئیعلالەی بۆدەکرێت .کەواتە (اجتوروا) ناکرێت چونکە واوەکەی لام نیە . وەگوتمان هیچ لامی تری لەدوا نەبێت کەواتە (یرعوی) واوی ئاخیری کراوە. هی یەکەم ناکرێت. وەگوتمان سێهەم نەبێت، کەواتە (الغزو) کەمصدرە ناکرێت. وەزانیشمان کە لە (یغزو وعدوٌّ) ناکرێت چونکە حەرفی پێش واوەکەیان مضمومە (یغزُو) حقیقەوە (عدوّ) حکما با ئێستا میثالەکانی خۆمان بهێنین **(فتقول اَعْطَی یُعطی)** ئەمە میثالی چوارەمیە. اعطی ئەسلەکەی (اعطوا)بوە واو چوارەمە ولام الفعلە وەهیچ لامیتر لەدواوە نەهاتوە. وە حەرفی پێش بەهیچ شێوەیێك مضموم نیە:ئەم واوە کراوە بە(ی)پاشان (ی)کراوە بەالف. (یعطی) مضارعەکەیتی: ئەصلەکەی (یُعطِوُ) بووە، بەهەمان شێوە(واعتدی یعتدی) ئەمەش بابی افتعالە واوەکەی لەپلەی پێنج دایە ئەصلەکەی اعتدو یعتدو (واسترشی یسترشی) ئەمەش واوەکەی شەشەمە وەبابی استفعالە وەئەصلەکەی اِسْتَرْشَوَ یَسْتَرْشو بوو واوەکە یان کراوە بە ئەلف لە دوای کردنەی بە (ی) بەگوێرەی ئەم قانونە، جا ئەم میثالانە ضمیریان لەگەڵدا نەبوو **(ومع الضمیر اَعْطیتُ واعتدیتَ واسترشیتُ)** واتە تۆ دەڵێیت لەم جۆرە میثالانە لەگەڵ ضمیری مخاطب ومتکلم وحدە (اعطیت) ئەصلەکەی (اعطوت) بوو واو کراوە بە(ی) اعتدیت ئەصلەکەی اِعْتَدَوت بوو، استرشیت ئەسلەکەی استرشوت بوو واوەکە کرا بە (ی)هەرچەندە لەگەل ضمیردایە، چونکە ضمیری فاعل رێگری لەم قەلبە ناکات **(وکذ لك تَغازْ ینا و تراجینا مع ضمیر المتکلم مع الغیر )** یانی هەروەکو ضمیری مخاطب ومتکلم وەحدە وایە، بونی قەلبیٚ واویٚ بە(ی) لەگەڵ ضمیر متکلم مع الغیر وەکو تغازینا وتراجینان کە هەردوکیان ماضی بابی (تفاعلا)ن ،وە ئەصلەکەیان تغازونا وتراجونا بوە واوەکەیان کراوە بە(ی) لەبەر ئەم یاسایە.

## ئاگاداری

بۆ زیاتر سودوەرگرتن دەمانەوێت کە هەندێك لەیاسایەکانی پیتی واو باس یکەین، ئەگەر چیزۆریان باس کراون ، بەلام لێرە کۆیان دەکەینەوە: ﴿١﴾واو متحرك ماقبل مفتوح قەلب دەکرێ بەئەلف بەو مەرجەی هیچ رێك نەبێت وەکو غزا ئەصلەکەی غزو بوو ﴿٢﴾ واو ساکن ماقەبل مکسور دەکرێت بە(ی) وەکو أوجل/ ايجل وقول /قيل ﴿٣﴾ واو متطرف ماقبل مضموم دەکرێ بە (یی) وەکو التمطو /عطی ﴿٤﴾ واو چوارەم و زیاتر دەکرێ بە (ی)پاشان بەالف وەکو اعطو/اعطی ﴿٥﴾ واو متحرك ماقبل مضموم دەکری بە (ی)لە مصدری بە مەرجێك کە لە فعلەکەشی کرابێت وەکو أنقود/انقاد وەفعلەکەشی انقود انقیاد ﴿٦﴾ واو متحرك ماقبل مکسور دەکرێ بە (ی) لەجەمعی بەو مەرجەی مفرەدەکە کرابێت وەکو جواد/جیاد وەمفردەکەی جیّدە ئەصلەکەی جیود بوو ﴿٧﴾ اجتماعی واوو یّیان سابق لەوان ساکن واو دەکرێ بە(ی)وەکو (مر موی) بەچەند مەرجێك لەبەینی ئەوانە فاصل نەبێت وەکو نینوی لەیەك ووشە دەبن نەك وەکو (یغزو یوماً) هی پێش ساکن بێت نەك وەکو(ضُوَیْرب) وەهی یەکەم بەدەل نەبێت وەکو (سویر دیوان) وەلەسەر وەزنی (افعل)ی نەبێت وەکو(ایوم)وەهەم عەلەم نەبێت وەکو (حیوة)وە (ی) بۆ تصغر نەبێت وەکو (اسیود). مەگەر لەرۆخی بێت وەکو (عصیە) ئەصلەکەی عصیوە بوە. ﴿٨﴾ واو دەکرێ بە همزە لەئیسمی فاعیل لەئەجوەفی وەکو قائل ئەصلەکەی قاول بووە ﴿٩﴾ واو لەدوای ئەلفی زیاد دەکرێ بە همزە وەکو کساء ئەصلەکەی کساو. ﴿١٠﴾ واو دەکرێ بە(تی) لەبابی افتعال وەکو (اوتعد/اتّعد) ﴿١١﴾ واو متطرف ماقبل مکسور دەکرێت بە(ی)وەکو قوو/قوِی/رضِوَ رضی. ئەم بابەتە پیرۆزە بۆ تاقی کردنەوەیە: ئەم شتانەی لیّ بزانە مزید مجرد بابەکانیان وەسالم وغیرە سالم ، مفردو تە ثنیە وجمع (فانطلقا حتى اذا اتيا اهل قرية استطعما اهلها فأبوا ان يضيفوهما فوجدا فيها جداراً يريد ان ينقض فاقامه قال لو شئت لتخذت عليه اجراً) سورة الكهف.

لەکاتێك رزگاری بوو لەم وشانەی یەك حەرفی عللەیان تێدایە، هاتە سەر باس و بەیانی ئەم وشانەی کە دوو حەرفی لەوانە تێدایە فەرمووی (**الرابع المعتل العين واللام** )جۆری چوارەم لەم حەوت جۆرەمعتلانە معتل العين واللامە واتە عين الفعل واللام الفعلی پیتی علله یتێدا بێت (**ويقال له اللفيف المقرون**) بەم نەوعە دەگوترێت لفیفی مقرون ، لفیف واتە تیا پێچراو مقرون واتە لەتەك یکەوە،یانی دو حەرفی عللەی تێدابێت واتە هەردوکیان پێکەوەنە وەهیچ فاصل لەنێوانیان نیە جائەوە فعل بێت وەکو (شوی)یان ئیسم بێت وەکو(قویّ)(وشیّ) (**ولا يجئ الامن باب ضرب يضرب وعلم يعلم**) واتە دورست نابێت وناهێت ئەم نەوعە کەلفیفی مقرون)ە تەنها لەودووبابە دێت لەم شەش بابی ثلاثی **مجرد**، ئەم دوەش بابی دووەم وەکو ضرب یضرب، وەبابی چوارەم وەکو علم یعلم (**واختّص ماكلاهما واو بعلم يعلم** ) واتە تایبەت کراوە ئەم ووشەی کە عين الفعل ولام الفعلی واوبێت، بەبابی چوارەم کە(علم یعلم )وە ن وەکو (قووّ)ئەمە وادەکەین کەئەمەیان لەبابی دووەم نەهاتبێت، بەلاّم قەرەداغی دەفەرموێت ئەمە بەزۆری وایە، چونکە عوی یعوی هاتوە لەبابی دووەم : کەئەصلەکەی (عَوَوَ)بوە (**ولم يوجد ماكان عينه ياءً ولامه واو**) واتە دەست نەکەوتوە لەم لەفیفەی ووشەیەك عين الفعل (ی) بێت ولام الفعلەکەشی واوبێت. ئەگەر بلّێیت ئەدی چی دەکەیت لەوشەی حیوان، دەلّێین ئەم واوە لەئەصلی دا (ی) بوە: کراوە تەواو: جادابەش کردنی بەگوێرەی عەقل چواربەش هەلّدەگرێت، هەردووك واو وەکو قووَ هەردوك (ی) وەکو حيی عين الفعل و لام الفعل (ی)وەکو شوی : بەپێچەوانەش ئەوە گوتمان نیە. کەواتە شەش بەش مانەوە، وەکو گوتمان ئەوانەش تەنها لەبابی (ضرب و علم) دەبن جا میثالە کان بلێن (**فتقول شوى يَشوى شَيّياً كرمى يرمى رمياً**) تو دەلێیت لەمیثال لەلفیفی مقرون لەبابی دووەم: شوی .هتد واتە حوکمی ئەم لەفیفە لەبابی دووەم وەکو ناقص وایە لە بابی دووەم (شوی ) ئەصلەکەی (شویَ)بووە واو کراوە بەئەلف ، وەکو (رمی)(یشوی) ئەصلەکەی (یشوِی)بووە ضمە لەسەر (ی)لادرا وەکو(یرمی) (شیاً) ئەصلەکەی (شویاً)

بوو: واو ویاء پێکەوە کۆبونەوە واو کرا بە(ی) وە دەغم کرا (**وتقول قوِیَ یقوی قُوَةً**) تۆ دەلێیت لە میثالی ئەم لەفیفە کە هەردوك واوبێت کەتایبەتە بەبابی چوارەم (قوی) ئەصلەکەی (قَوِوَ) بوو: واوی دووەم کراوە بە(ی)چونکە متطرف ماقبل مەکسورە یقوی: ئەصلەکەی یَقْوَوَ بووە وەکو یعلم واو لەپلەی چوارەم کرا بە (ی) وە (ی) کرا بە ئەلف وە(قُوَّة) مصدرە ئەصلەکەی قوْوَة بوە بەدو واو هی یکەم دەغم کرا لەهی دووەم (**قَوِیٌّ فی الصفة**) بۆ صیفة مشبهە دەگوترێت قَوِیّ لەجیاتی ئیسمی فاعیل مفعول ئەمە بۆ مذ کر، وەبۆ موءنثان قویة دەگوترێ هەتا دوای (**والجمع اَقْوِیاء**) دەلێت بۆ جەمع التکسیری قوِیٌّ (ا قْوِیاء) سکونێك لە نێوان فەتحە وکە سرەدا (**ورَوِ یَ یَرْ وی رَ یاً**) روی کەعین الفعلی (واوە) وەلامە کەشی (ی)تایبەت نیە بەم بابە هەروەکو قوو، تایبەت بوو یروی ئەصلەکەی یروَیُ بوو(ی)کراوە بەئەلف ریّاً ئەصلەکەی رَوْیاًواو(ی)کۆبونەوە واو کراوە بە(ی)وەدەغم کراوە (**کرضِیَ یرضی رضیاً**) واتە حوکمی (قوی) وە (روی)ی کەهەردوکیان لەفیفن وەکو حوکمی (رضی) وایە کەمعتل الامە لەئیعلال دا (**والحاصل انّ هذا مثل الناقص**) پوختەو مەبەست ئەوەیە لەم شوبهاندنە لەفیفی بەبابی رمی وە رضی :کە حوکمی لام الفعل بەم لفیفەی وەکو حوکمی لام الفعلی ناقص وایە(**فلا یعل العین اصلاً**). جا کەوەك یەك وانە، لێرەدا عین الفعل ئیعلال ناکرێ تەنها لام الفعل ئیعلال دەکرێت چونکە ئەویان شوێنی گۆرانکاریە جاکە ناکرێت بە قەطعی ناکرێت واتە نە بەقەلب وە نە بەحەذف: جا فعل بێت یان ئیسم بێت، واوی بێت یان یائی: هۆیەکەش زیاتر ئەوەیە تاکو دوو ئیعلال کۆنەبنەوە لەیەك وشەدا(**فهو ریان**) ئەمە بۆ مفرەدی مذکر بەکاردێت ئەصلەکەی (رویا ن) اجتماع واو (ی)یا ن بوو هتد...(**وأمرة ریّا**) ئەمەش بۆ مفردی موءنث بەکاردێت ئەصلەکەی رویا بوە(**بأعلال مرمیّ**) واتە هەردوکیان أعلال کراون وەکو أعلالی (مرمی) کە لەپێشان باس کراوە (**مثل عطشان و عطشی**) واتە ریّان بە (ی)بەشەددە کەئەصلەکەی رویان بووە وەکو (عطشان)ی وایە بۆ مذکران (وریّا)کە ئەصلەکەی رویا بووە وەکو عطشی ئەمەش بۆ موءنث کە

(ی)مشەدەدە بەبێ نوون (**وجمعهما عطاشٌ بكسر الفاء**) واتە جمعی عطشان وعطشی یەك جەمعە کەعیطاش ە وەهیچ جیاوازی نیە لەنێوان جەمعی مذکرو موءنث دا لێرەدا کەجمعەکە عیطاش ە بەکەسرەی فاءالفعل بوو هەردوکیانە: (**وهوقیاس فعلان فعلی**)یانی ئەم جەمعە کە(فعال)ە قاعیدە ویاسا بوو هەر وشەیەك کە مذکرەکەی لەسەر وەزنی (فعلان)ی بێت وە موءنثەکەی لەسەر وەزنی (فعلی) بێت (**تقول ریّان ریّانان**)[1] تۆ دەلێیت لەمثالي صفەتی مشبهّە ریّا ن بۆ مفردی مذکر ریّا نان بوو وە تە ثنیە کەیان لە حالەتی رەفعە ریّا نیِن لە حالەتی نصبە وجرە (رواء)بەکەسرەی (رِیٰ)ئەمەش بۆ جەمعی مذکرە(ریَا) بۆمفردی موءنث(ریّیان) تەثنیە لەحالەتی رفعیٚ ئەلفەکەی کراوەتەوە (ی)وەألف ونون بۆ تەثنیە زیادکراون: ریّیْنِ لە دوحالەتی نصبە وجرە: وەئەگەر أضافەی بکەی بۆ لای (ی) متکلم، دەبێتە پێنج (ی)وەکو (ریّیی ّ)(ر واء)بۆ جەمعی موءنث هەروەکو جەمعی مذکر وایە، چونکە هەردوك لەسەر وەزنی عیطاش)ەئەصلەکەی (روای) بوو واولە دوای ئەلفیٚ قەلب کراوە بەهمزە: یەك دەلێت بۆ واو نەکراوە بە(ی)کەچی قانونە، کە واو متحرك ماقبل مکسور قەلبی دەکرێت بە(ی)لە جەمعی بەو مەرجەی لەمفرەدەکەشی قەلب کرابێت وەکو جیادوجیّد : کەئەصلەکەی جواد بووە: لە وەلامدا دەفەرموێت (**ولم تقلب الواوياءً مع كسر ماقبلها وأعلال مفرده**) واتە لەوشەی (رواء) نەکرا بە (ی) کەچی حرفی پێشی مکسورەکە رائەکەیە: وە مفرەدەکەشی ئیعلال کراوە کە، ریّان)ە (**للزوم أعلالين بلا فصل**)تاکو لازم بێت دووئیعلال لەتەك یەك بەبێ فصل کەیەکێکیان ئەوەبوو لام الفعلی کراوە بەهەمزە ئەوجاریش واوەکەی بکەین بە(ی) کەهیچ شتێکیان لەنێوان نیە. ئەمە نابێت : یەکێك دەلێت ئەدی ألفی مەددە لەنێوانیانە :لە وەلاّمدا دەفەرموێت (**أذالالف حاجزٌغير حصين** ) بەڵێ ئەلف لەنێوان هەیە، بەلاّم ئەم ئەلفە پەردەو پەنایێکی زۆر بێهێزو توانایە، وەهیچ حیسابێکی بۆ ناکرێ بە نەبوو دانراوە. کەواتە دووئیعلال کۆدەبنەوە لە یەك وشەی بێ فاصیل: ئەمەش قەدەغەیە (**قلبت الواو همزة أبتداء**) جاوتما ن ئەصلەکەی

(روای) بووە (ی) قەلب کرا بەهمزە لە ئەوەلەوە یانی پێشی ئەوەی کەقەلبی بکەین بەئەلف (**لان الواو والياء الواقيعتين طرفاً بعد ألف زائدة تقلبان همزة**) چونکە قاعیدەیە وەباسمان کرد لە کیساء ورداء کەهەر واوێك یان هەر یێك کەوتە طرف واتە لە ئاخیری وشەیێك هات وەهیچ (تێ) تأنیثی لەدواوە نەبوو، وەلەدوای ئەلفێکی زیادکراو هات بون قەلب دەکرێت بەهمزە وە لە ووشەی (روای) یاسایەکەی لێهاتۆتە جێوە (یی) قەلب کرا بەهەمزە بووبە (رواء) (**أوبعد جعله الفاً**) یان دەلێن (ی)کراوە بە ئەلف پاشان ئەلف کراوە بە هەمزە جا یەکێك دەلێت چۆن بەم (ی)یە کراوەبەئەلف کەچی ماقەبلی مەفتوح نیە بەلکو ساکینە کەئەلفی مەددەیە لەوەلاّمدا دەلێت (**لأن الالف حاجزٌ غيرُ حصينٍ فكأن ماقبلها مفتوحٌ**) واتە ئەم ئەلفی کە لەنێوان فەتحەی پیتی (و)وەپیتی (ی)هەیە پەردەیەکی بێ‌هێزە. وە بزانە کەپیتی پێش (ی) مفتوحە کە فەتحەی واوێیە جا (ی)کرا بەئەلف، ألتقاءالساکنين لەنێوان هەردوك ئەلف جاهی دووەم حەرەکەدار کراو بوو بەهمزە، بەلام بزانە ئیعلالی بکەی باشترە چونکە ئیعلالی کەمترە وەبەهەر حالێك بێت گەڕا بە (رواء) (**وارْوى كأعطى**) واتە حوکمی لەفیفی مقرون لەبابی أفعال وەکوناقیصی واویە لەم بابە .(اروى)ئەصلەکەی (أرْوَيَ)بووە وەکو أکرم)ە وە(ی)کراوە بەئەلف بووبە (أروى) .يُروى) کە مضارعە وە کو يعطى وایە ضمەی (ی)حذف کراوە خولاصە کو مجردەکان یەکسانن مەزیدەکانیش بەهەمان شێوە (**وتقول حَيِيَ كَرَضِى**) واتە تۆ دەلێیت لەفیفی مقرون لەبابی چوارەم کە عین ولامی (یی)بێت حيى کرضى، بەبێ دەغم کردنیَ (ی) لە(ی) واتە حوکمی لەگەلّ ناقص یەك حوکمە (**ويجوز حيَّ بفتح الحاء وكسرها**) واتە دورستە لە م ماضیە ،حيَّ: بەدەغمی عین الفعل لەلام الفعل وەك خۆی جا فاء الفعليش کە (ح)یە بە فەتحە و کەسرە دووستە واتە حِيَّ حَيَّ (**يحيا بقلب اللام الفا** )تۆ دەلێیت لەمضارعەکەی يَحيا بەقلبی لام الفعلەکەی کە (یی) بەئەلف چونکە یاسای خۆیەتی کە ئەصلەکەی يَحيَي بووە وەکو يعلم. یەکێك پرسیار دەکات بۆچی دەغم نەکرا تۆش لەوەلاّمدا بلێ (**ولم يدغم والا لزم ضم الياء**) واتە

(ی)ییکە دەغم نەکرا لە (ی)دووەم چونکە ئەگەر دەغم بکرایە (ضمة )لازم دەهات بۆ سەر پیتی (ی)چونکە دەبووە(يَحِيّ) ئەمە پێش ئیعلال وەلەدوای ئیعلالیش دەغم نەما (حیوە) تۆ دەڵێیت لەمصدرەکەی حیوە ئەصلەکەی حیْيَة بووە وەکو (غلبە)لام الفعل قەلب کرا بەئەلف (کتبت واواً) ئەم ئەلفە بەواو نوسراوە وەکو (صلوة وزکوة)هتد: ئەگەرچی واو گرانترە لەئەلفێ وەبەخیلافی نوسینیشە (**علی لغة من يميل الالف الی الواو**) لەسەر لۆغەت و زاراوەی ئەو عارەبانی کە لە خوێندنەوە مەیل بەئەلفێ دەکەن بۆ لای واوێ (**وان کانت الالف المنقلبة عن الياء التی قبلها ياءأخری تکتب الفاً**) بەلێ حیوە بەواو نوسراوە ئەگەرچی قانون وایە کە هەر ئەلفێك قەلب کراوی یییەکی بێت کەیێیەش یێەکی تری لەپێش بێت : قانون وایە بەئەلف بنوسرێت : وەکو (يحيا) ئێستا ئەم ئەلفەقەلب کراوەی پیتی ییە وەلەپێش ئەم یێەش (یی)ی ترهەیە کە هی عین الفعلە: جائەم قەلب کراوە بەئەلف نوسراوە بەگوێرەی یاسای خۆی بەلاّم (حیوە) وانەنوسراوە کەچی ئەم ئەلفەش قەلبکراوی یاتەکەیە: کەلە پێشی یائیتر هەیە (کصَدْ یا ورَيّا)وەکو (صدیا )و(ريّا)کەهەردوکیان صیفەتی موشەبەهەن: بۆ موءنث کە مذەکرەکەیان (صدیان وریان)ە. بەلاّم ئەمەش بزانە ئەلفی ئەوان قەلب کراو نیە وەکو هی يحيا بەلّکو هی تەئنیثە وەلەبابی فعلانَ فعلیيە بەلاّم بەهەر حال ئەم ئەلفە یائی لەپێشەوەیە بەئەلف نوسراە: وەکو يحيا کەفعلی مضارعی یە: وەئەلفەکەی قەلب کراوە بوو(**الا فی يحي وریّ علمين**) واتە لە هەموو شوێن ئەم ئەلفی کەقەلب کراوە : وەپیتی یائی لەپێشەوە هەیە :بە ئەلف دەنوسرێت : تەنهالە ووشەی (يحی)کە ناوی پیاوێکە وە(ریی) کەناوی ئافرەتێکە لەم دووشوێنە هەر بە یاء نوسراوە لەو کاتەدا کەناون بۆ مرۆڤ ئەگەرچی ئەلفەکەیان قەلب کراوە یائێکە :کە یائێکی تری لەپێشە، قانون وابو کە بەئەلف نوسرابایە بەلاّم بەئەلف نەنوسران بەلکو بەیاء نوسران تاکو جیاوازی هەبێت لەنێوان (علم) وفعل وصیفەت: چونکە ئەوان بەئەلف دەنوسرێن:چونکە گرانترن بەلاّم (علم)بەیاء نوسراوە چونکە لەوان سوکترە (**فهو حيّ**) واتە تۆ دەڵێیت لە صیفەتی مشبهە, حيّ، بە

دغمی یاء لەیاء (وحيّا) تەثنیە ی فعلیّ ماضی لە هی بەشەردا (وحييا) ئەمەش هەروەها بەلاّم بەبیّ أدغام (فهما حيان) ئەمەش تەثنیەی صیفەتی مشبهە کە (حيٌّ)بوو (وحيّوا وحييوا) ئەمەبو جەمعی مذکر لەماضی بەدەغم وبەبیّدەغم (فهم احْياءُ )ئەمەش بۆ جەمعی (حيّ)کە صیفەتی مشبهەیە (**ويجوز حيوا بالتخفيف كرضوا**) واتە دورستە لەفعلی ماضی دەغم نەکراودا حەذفی لام الفعلەکە بکەی لەجەمعی وەکو حيُ، بە سوککردنی بەحەزفی لام الفعلەکە. وەکو رضوا کە ئەصلەکەی رَضِيو بووە وەحیووا ئەصلەکەی حَيِيوا بووە: کەسری عين الفعلەکەی لادە وە ضمەی لام الفعلەکەی بدەرێوە حذفی لامەکەی بکە (**وأحْيِ كأرضَ**) تۆ دەلێیت لە ئەمری بەصیغە لە لفیفی (إحي) وەکو (إرضي) واتە حوکمی لەفیف و ناقصی وەك یەك وایە لە ئەمری دا. ئەصلەکەی تحيا بوە (تي) لادرا هەمزە وەصل هات و ئاخیرەکەی ساکین کرا بە حەزفی لام الفعلەکەی (**واحيا يحيي كأعطي يعطي** ) تۆ دەلێیت لە دورست کردنی بابی أفعال لەم لەفیفە کە هەردوکیان (ی)بن أحيا يحيي وەکو أعطي يعطي, أحيا ئەصلەکەی أحيي بوە وەکو اكرم)ە لامەکەی کراوە بەئەلف، وەکو اعطي /يحي / ئەصلەکەی يُحييُ بو وەکو يُكرم ضمەی (ی)لادرا بو بە يُحيي (**ولايدغم حال النصب حملاً على الرفع**) واتە (یێ) لە(ی) دەغم ناکرێ لە فعلی مضارع لەکاتێك عامیلی ناصیبی بەریتە سەر هەرچەندە موافیقی قاعیدەش بێت وەسوکتر دەبێت: بەلاّم حمل دەکرێت حالەتی نصبە بەسەر حالەتی رفعە کەلەم حالەتە مەرجەکانی دەغمی تێدانیە بەلاّم لەحالی نصبە مەرجەکانیش هەن بەلاّم دەغم ناکەین تاکو هەمو حالەتەکان یەکسان بن (**وحاياىحايي محاياة كناجي يناجي مناجاةً**) حوکمی بابی مفاعلەلەم لەفیفە وەکو ناقصی وایە لەم بابە (حايا) ئەصلەکەی حايیَ بو" وەکو قاتل/ە لام الفعلی قەلب کرا بەئەلف، بو بە حايا يَحايي، ئەصلەکەی يُحايِي بو وەکو يقاتل ضمە لەسەر (ی)لادرا بو بە يُحايي محاياە ئەصلەکەی مُحايَي)ەودکو مقاتلة بوو(ی)متحرك ماقبل مفتوح کرا بەئەلف بوبە محاياة (**واستحي يستحي استحياءً كاسترشي يسترشي استرشاءً**) حوکمی

بابی استفعال لەمادەی حیی لەم لەفیفە وەکو استخرج (ی) دوەم کرا بە ئەلف/یستحی/ ئەصلەکەی یستحییُ بو ضمە لە سەر(ی)گران بو لادرابو بە یستحی استحیاء ئەصلەکەی استحیایاً بوو(ی)لە دوای ئەلفی زێدە کراوە بە هەمزە بوبە استحیاء وەکو استخراجاً **(ومنهم من یحذف العین اعتباطاً)** واتە هەندێك لە عەرەبەکان حەذفی عەین الفعل دەکەن کە (ی)ییکەمە هی دوەم حەذف ناکەن کەلام الفعله ئەم حەذفەش کە دەیکەن هیچ شتێك نیە کە پێویست بەم حەذفە بکات تەنها بۆ سوك کردنی ئەم وشەیە **(فیقول إستحی یستحی اسْتح)** دەڵێت ئەوەی کە حەزفی عین الفعلەکەی دەکات لەم میثالەدا استحی ئەسلەکەی استحیی بوە بە دو یاء نەقلی حەرەکەی عین الفعل کرا بۆلای عین الفعلەکەی کە (ح)یە پاشان قەلب کرا بەئەلف حەزف کرا بو بە استحی بە یەك (ی) یستحی مضارعە ئەصلەکەی یستحیی بوە بە کەسرەی (ی)یەکەم نەقل کرا بۆ ماقبلەکەی حەزف کرا لەبەر بینای ئەمر بو بە استح لەسەر وەزنی استفِ واتە لەحەرفەکانی بەس (ف) ماوە **(فحذفت اللام فی الامر ایضاً)** واتە حەزفی لام الفعلەکەش کرا لەفعلی ئەمر لەم بابە هەروەکو حەزفی عەین الفعلەکەش کرابو بەلام ئەم لامە کەحەزف کراوە بەپێی یاسایە وەکو عەین الفعل نیە کە بەس بۆ سوکی بێت **(وکذافی الجزم)** واتە لامەکەی دەکرێت لەمضارعی لەکاتی عامیلی جەزمی بێخیتە سەر وەکو لم تستح **(وتعودالالام عندالتاکید)** ئەم لامەی کە حەزف کراوە بە هۆ عامیلی جازم و ئەمری ئەم لامە دەگەرێتەوە لەکاتی تاکید کردن بەنونی تاکید وەکو استحینّ لێرەدا ئەگەر یەکێك رەخنەبگرێت و بلێت تۆ گوتت لەم لەفیفە کەعین الفعل ئیعلال ناکرێت ئێستاش دەبینم حەزف کراوەنوسەر لە ولاّمی دادەفەرموێت(وذلك لکثرةالاستعمال)واتە حزف کردنی عین الفعل لێرەدا لەبەر هیچ هۆییێك نیەتەنها لەبەر ئەوەیە کە ئەووشەیە زۆر بەکاردێت باش وایە سوك بکرێت **(کما قالوا لا ادر فی لا ادری ولم یکن فی لم یَکُنْ)** وێنەکەی ئەوەیە کەعەرەب گوتویانە (لاادرِ)بە حەزفی (ی)ی لام الفعل لە جیاتی لاادری بە (ی)چونکە ئەم لایە جازم نیە بەڵکو بەحەزفی پیتی یاء لەبەر زۆر

بەکار هێنانە :وەهەر وەها گوتویانە (لم يك) بەحەزفی نونی لەجیاتی لم يكن بە نون، جاحەزفی ئەم نونە لەبەر بەکار هێنانی زۆرە ئەگینانونی لام الفعل بەعاملی جازم لاناچێ.

لە کاتێك باسی لفیفی مقرون تەواو بو هاتە سەر باسی لەفیفی مفروق دانەری تصریف لەوبارەوە دەفەرموێت (**الفاْ واللام**) واتە نەوعی پێنجەم لەم حەوت معتلە. (**الفاء والام**) . یانی فاء الفعلە ولام الفعلی پیتی عللە بێت (**ويقال لة اللفيف المفروق** ) بەم لەفیفە دەوترێ لەفیفی مفروف یانی حەرفی عللەی تێداپێچراوە بەلاّم پیتێکی صحیح لەنیوانیان هەیەوەکو (**وقي** ) وسوس .بۆ ثلاثي ورباعی : جادابەشی ئەمە بەگوێرەی عەقل چواربەشە چونکە .یان هەردوك واودەبن یان هەردوك (ی) دەبن یان فاء الفعل واوە وەلام الفعل (ی) دەبێت یان بەعەکس ئەوەیان : بەلام وادیارە ئەم هەموجۆرە دەست ناکەویّ جادەفەرموێ ( **ولا يكون فاؤه الاواواً الايدى**) یانی نابێت فاء الفعلی ئەم لەفیفە تەنها واو دەبێت هەرگیز (ی) نابێت مەگەر وشەی (یدی) کەبەمانای چاکە لەگەل کردن و هەندێك مانای تریش هاتووە. وە لە بابی دوەم و چوارەم دێت : لەم ووشەدا فاء الفعل واو نیە بەڵکو یێیە .( **ولامة الا ياء**) وەهەروەها لام الفعل لەم لەفبفە نابێت تەنها (ی) دەبێت . کەواتە لەم چوار بەشە یێك ماوە , کە ئەوەیە فاء الفعل واو بێ لام الفعلیش (ی) بێت . سیّ یەکانی تر دەست نەکەوتن (**ولا يجئ الا من باب ضرب يضرب وعلم وحسب**) دروست ناکرێ و بینا ناکرێ ئەم جۆرە لەفیفە تەنها لە بابی ضرب وعلم و حسب دروست دەکرێت : یانی بابی دووەم و چوارەم پێنجەم : جاتۆ دەلێیت لە میثالەکان (**وقي كرمى**) یانی حوکمی ئەم لەفبفە لە بابی دووەم . وەکو حوکمی ناقصی وایە , لەبابی دووەم : ( وقی ) ئەسڵەکەی ( وقی) بوو . (ی) کرا بەئەلف بەپێی یاسای خۆی : با میثالەکان ماضی تەواو بکەین ( **وقيا وقوا** . **وقت وقتا وقينا** , **وقيت وقيمتا وقيتم وقيت وقيتما وقن وقيت وقينا**) جا با میثالەکانی فعلی مضارع بهێنن ( يقی ) ئەسڵەکەی ( يوقی ) بووە وەکو (یوعد ) وایە لە حەذفي واوەکەی , کەلە

نێوان (ی) کەسرەیە : وەحەزفدە کرێ وەهەروەها ئاخیرەکەش وەکو (یرمی) وایە کەضمەی لێ حەزف دەکرێت. پوختە ئەوەیە: کە حوکمی ئەم مضارعە لەم لەفیفە. وەکو حوکمی میثالي وایە لەحەزفی واوی بوە وەکو حوکمی ناقص وایە. لەحەزفی ضمەی (ی) لەبەرئەمەش نەیفەرموو (یقی) (کیرمی). وەکو لە ماضیدا وایفەرموو (یقیان) ئەسلەکەی یوقیان. وەکو یضربان. واو لەنیوان (یی) وکەسرەلادراوە ( یقون ) ئەسلەکەی یقیون. بوو واو لە بەینی ( یی ) وە کەسرە لادرا: بوو بە یقیون. ضمەی (ی) نەقل بکە بۆ پێش خۆی لەدوای لادانی حەرەکەی خۆی . التقاء الساکنین بوو لەنێوان (ی)کەلام الفعله . لەگەل واوی جەمعی.(ی) حەزف کرا. بوو بە یقیون لەسەروەزنی (یفون ) یانی بەس فاء الفعلی ماوە (**تقي تقيان يقين**) ئەسلەکەیان. توقی توقیان توتقین .واو حەزف کراوە : وەزنەکەیان تعل تعلان یعلن وەکو یعدن : ئەوانە شەش میثالي غائب بوو مذکر مؤنث. ئەمانەش بۆمخاطب: (**تقی تقیان تقون**) بۆ مذکر ئەسڵەکەیان توقی توقیان توقیون: وەکو تضرب...هتد: ئیعلالەکەیان وەکو یقی....هتد: (**تقین تقیان تقین**) بۆ مؤنث مخاطبة ئەسلی (تقین)ە کە مفرەدی مخاطبە,( توقین)ە بوو بەدووی ) بەلاّم ئەسڵی (تقتین)ی جەمع توقین)ە بوو بە یێك (ی) وەئیعلالەکان دیارن (**اقی نقی**) متکلم وحده مع الغیر . ئەسڵەکەیان اوقی نوقی بوو : واو حذف کراوە , لەگەڵ ضمه ی لام الفعل : جاهاتە سەر باسی ئەمری بەصیغە : دەفەرموێ : (**والامر (ق) علی وزن ع** ) واتە تۆ دەڵێت لە بینا کردنی ئەمریلا بەصیغە لەم لەفیفە (ق)بە قافێکی ژێر و بەس : لەسەر وەزنی (ع) , چونکە ئەسڵەکەی (توقی ) بوو واوەکە لاچووە بەپێی یاسای (معتل الفاء ) وەحەرفی مضارع و لام الفعلەکەی حذف کراوە لەبەر بینای ئەمر . کەواتە لە حروفەکانی خوی و زیاد . بەس عەین الفعل ماوە . بۆیە وەزنەکەی (ع) دەبێت . چونکە گوتمان میزان و مەوزون یەکسانن : (**ویلزمة الهاء في الوقف نحوقة**) پێویستە لەکاتی وەستان لەسەری , پیتی هی پێوە بلکێنی بۆ هەناسە خواردن , وەکو دەڵێت (قە) چونکە بۆ دەست پێکردن پێویستە حەرەکەی هەبێ . وە بۆ راوەستان سکون هەبێ ئەم دووەش

دژی یەکن (جا ئەم (هی)یە زیادکرا: جا تۆ دەڵێیت لە میثالەکان بەبێ نوونی تەئکید ق قیا قوا ئەمە بۆ مذکری مخاطب ئەسڵەکەیان توقی توقیان توقیون )د قی قیا قین ئەمەش بۆ مؤنث مخاطب : ئەسڵەکەیان : توقین توقیان توقین , وەئیعلالیان ئاشکرایە : علی وزن (ع) (ق) لەسەر وەزنی (ع) تەنها عەین الفعل ماوە : علا عەین و لام ماون عوا بەس عین الفعل ماوە ئەمە میزانی سێیەکانی ئەوڵی کە مذکر بوون : عی ئەمە میزانە بۆ قی کو مفرەدەی مؤنث مخاطبە : بەس عەین الفعلی ماوە وەیائەکەشی ضمیری مؤنث المخاطبة و فاعلە : علا عەین و لامی ماوە . علن میزانە بۆ (قین)ەی جەمعی مؤنث عەین و لامی ماوە , وەنونەکەشی ضمیرە وفاعلە (**وفي التاكيد قين**) ئەمە بۆ مفرەدی موذکری مخاطبە . واتە بۆ (ق) لام الفعل گەراوە بەهۆی نونی ثە قیلە چونکە ئەم نوونە پێویستی بە فەتحەی ماقەبلە هەیە : قیان بۆ تثنیە ی مذکری مخاطب ئەسڵەکەی قیا بوو, تەئکید کراو نوونەکەی تەئکیدی مەکسور کرا :قن بۆ جمع , ئەسڵەکەی ( قوا) بووە تەئکید کرا , دوو ساکن گەیشتە یەك واو لادرا , چونکە ضمە دەلالەتی لەسەر دەکات : قن بۆ مفردی مؤنث مخاطبة . ئەسڵەکەی (قی) بوو تەئکید کرا وە (یی) حەذف کرا لەبەر (التقاء ساکنین لە نێوان (ی) و ضمیر و نوونی تەئکید چونکە کەسرە دەلالەتی لەسەر دەکات : قیاك تەئنیسەی مؤنث وە نونەکە مەکسورکرا : قینان بۆ جمعی مؤنث مخاطبة ئەسڵەکەی (قین) بوو , تەئکید کرا بەنوونی ثەقیلەوە وە ئەلفێك لە نێوانیاندا دانرا, وەنوونەکەی مەکسور کرا بوو بە قینان : (**وبالخفيفة قِيَن قُن** ) تۆ دەڵێت بە نوونە تەئکیدی سوك قِیَن بۆ مفردی مذکری مخاطب (ی) گەڕاوەتەوە . قُن بوو جەمعەکەیان واو حەذف کراوە . قِن بۆ مفرەدی مؤنث مخاطبة ئەسڵەکەی (قی) بو تەئکید کرا وە (یی) لادرا لەبەر التقاء ساکنین وە (یی) لادرا کەسەری قاف جێگیرە : وە فەرامۆش کردنی تەثنیە و جەمعی مؤنث لە نوونی خەفیە ئاشکرایە (**ووَجِی یَوجِی کرضی یرضی**) حوکمی لەفیفی مفروف لەبابی چوارەم وەکو حوکمی ناقص وایە لەم بابە : کەواتە وجی وەکو رضي وایە بەبێ جیاوازی ( **ولامر ایج كارض** ) تۆ دەڵێیت لە

ئەمری بە صیغە لەم بابە ,إیج , وەکو إرض . ئەسڵەکەی (توجی) بوو وەك (تعلم) حەرفی مضارعی حە ذف کراوە هەموو (ی) مەکسورە لە ئەوەلیدا دانرا , ئاخیرەکەی مەجزوم کرا بە حەذفی یاء بوو بە إویج , واو ساکن ماقبل مەکسورە قەلب کرا بە (ی) بوو بە إیج (**وولي يلي وليا**) تۆ دەلێیت لەم لەفیفە لە بابی پێنجەم ولی یلی ولیا , (ولی) وەکو (ورث) وایە کەبابی (حسب)ەیە یلی ئەسڵەکەی یولی بووە وەکو (یورث) واو لادراوە بە پێی یاسا نەیفەرموو ئەمەش وەکو ئەم بابە وایە لە ناقص , چونکە ناقص لەم بابە نەهاتووە , `بەلاّم قەرەداغی دەفەرموێ باش بوو بفەرمووی (کورث یرث) بەلاّم نەیگوت : چونکە ئەمە معتلە الفاء یە جا گوتمان ئەم لەفیفە لە سێ باب دروست دەبێت وە بۆ هەرسێك میثالی هێناوە : بەلاّم لە پێشان هیچ ئاماژەی نەکرد. کە ئەم لەفیفە لە رباعی دروست دەبێت جالێرەدا ویستی پێمان بلێت کە لە رزباعیش دروست دەبێت و فەرمووی .(**وقوقيت وضوضيت مقلون الواو ياءً لو قوعها رابعة من اللفيف المفروق**) یانی ئەم دوو فعلە کە (قوقین)ە وە ئەسڵەکەی (قوقوت)بوو وە ضوضیت ئەسلەکەی ضوضوت بوو کە رباعی مجردن وە واوی دووەم لە هەردوکیان کراوەیە (یی) بە پێی یاسای (واو واقیع بە رابع) ئەم دوو فعلەش لەفیفی مفروقن . بەلاّم چۆن (**بمعنى مطلق ما فرق فيه بين حرف العلة** ) یانی بەم مانایە لەفیفی مفروقن کە حەرفێکی صحیح فاصیل بێت لە نێوان دوو حەرفی عللە بە موگافی . واتە بێ ئەوەی تەماشای فاء الفعل و لام الفعل بکرێت . کە چ جۆرە حەرفێکن , کە ئەوە دەبێتە لەفیفی مفروقی لوغەوی ( **لا بالمعنى الذى قلنا** ) : بەم پێناسەی ئێمە کردمان بۆ ئەم لەفیفە کە گوتمان , ئەوەیە کە فاء الفعل و لام الفعلی حەرفی عللە بێت بەم پێناسەیە لەفیفی مفروق نین , وە ئەم پێناسەی کە بۆ ئەم لەفیفە کرا بوو (مطلق) نەبوو ئەگینا ئەم پێناسەی ئێمە هەڵ دەوەشێتەوە . بەم جۆرە فیعلانە : چونکە ئەوانە فاء الفعلە کەیان هەر حەرفی عللە نیە چ جای واو بێت . پوختەی ئەوەیە بەم پێناسەی پێشوو حیسابی لەفیفی

مفروق بۆ ئەوانە ناکرێت بەلاّم بەمانای لوغەوی کە ئەوەیە دوو حەرفی علله و حەرفێکی صحیح لە نیوانیاندا هەبێت . ئەوانەش لەگەلْ دەکەون(والله اعلم ).

﴿**السادس المعتل الفاء والعين**﴾ واتە نەوعی شەشەم لەم حەوت معتله (معتل الفاء والعين )ە کە ئەمەشیان هەر لەفیفی مقرونه . بەلاّم نەی فەرموو , چونکە ئەم جۆرە خۆی کەمیشە وەکو بۆت ڕوونە کە هەرگیز فعلی لیٚ دروست نابێت, هۆیەکەشی هەر ئەمە بوو کە نەبوو بە چوارەم کەچی فاء الفعل و عەین الفعل لە پێش ترن لە عین الفعل و لام الفعل . کە هی چوارەمە : جا ئەمەشیان بەگوێرەی عەقلْ چوار جۆری هەیە : هەردووك واو , وەهەر دووك (ی) وە بەعەکسی ئەوەش بەلاّم هەردووك واو بێت نیە . وە میثالەکانی تریش ئەوە لەبەر چاوە (لا یکون واوین) واتە هیچ وشەیەك نابێت کە فاء الفعلی وە عەین الفعلی پێکەوە واو بێت , چونکە دوو واو لە ئەوەلْیەوە گرانە : بەلاّم هەردووك (ی) دەبێت , وەکو دەفەرمووێ (**کیین اسم مکان مخصوص** (**یین**) بە فەتحەی هەردووك (ی) ناوە بۆ شوێنەکی تایبەت . دەلْێن ناوە بۆ گوندێك لە (یمن) . ئەمە فاءو عینی (ییه) (ویوم) ئەمەش فاء الفعلی(ییه) وە عەینی الفعلی (واوە ) (وویل) . پێش خۆی ( **ولایبنی منه الفعل**) واتە فعل لەم نەوعە معتله دروست نابێت , چونکە فعل گرانە . وە دوو حەرفی گران لە ئەوەلْیەوە بێت زیاتر گران دەبێت : لەبەر ئەوە فعلی لیٚ دروست نابێت , مەگەر لەکاتی زروریو ناچاری شیعری شاعیرەکان , ئەوەش نابیٚ بەبیٚ یاسا ، وە ئەم فعلەش کە گوتراوە (یاومه) یا وە (قاتله) وایە فعلی ماضي لە بابی مفاعله , دەلْێن ئەمە دروست کراوی خۆیانە , وە لە ئەسلْی لوغەت نەهاتووە ﴿ **السابع المعتل الفاء والعين واللام** ﴾ واتە حەوتەم لە معتلەکان , هی ئاخرە ئەوەیە کە هەر سێك حەرفی علله بێت, واتە فاء الفعل وعەین الفعل ولام الفعلی حەرفی علله بی (**وذلك واو و یاء لأسمي الحرفين** ) واتە ئەم نەوعی حەوتەمە تەنها ووشەی واوە لەگەلْ ووشەی (ی) کەهەردووك ناون.بۆ حەرفەکانی (ئەلف)و(ی)(**وأصل واوٍ وَ وَ وَ** ) ئەسلْی ئەم پیتەکەواوە (وَ وَ و) بووە یانی سیٚ حەرف وەهەرسێکیان حەرفی عللەنەکە

سێ واون (وقیل ویو بیی ) ئەسڵی (ی) بیی بوو بە سێ (ی) (**قلبت العین فیهما الفاً** ) قەلبی عەینی فعلەکەیان کرا بە ئەلف . جا ئەم عین الفعله واو بێت یان (ی) ( **کراهة اجتماع حرفی علة متحرکتین من جنس واحد في الاول** ) واتە عەین الفعل قەلب کرا بە ئەلف . چونکە ناپەسەندە کۆبوونەوەی دوو حەرفی علله , کە هەردووك حەرەکەداربن , وەیەك جۆر بن وە لەسەرەتای ووشە بن: جابوون بە (واو) وە (ی) بەلاّم هەردووك متحرك نەبن ناپەسەند نیە وەکو (یوم ویل) یان لەسەرەتاوە نەبن یان لە جنسێك نەبن (**ثم قلبت الیاء همزة وان لم تکن بعد الف زائدة تخفیفاً** ) گوتمان بوبە یاء پاشەوە قەلبی (یای ) ئاخری کرا بە هەمزە هەرچەند لە دوای ئەلفی زیادیش نیە , بەڵکو ئەلفەکە ئەسڵەو یاسا نایگرێتەوە , بەلاّم بۆ سووککرنی ئەم ووشەیە قەلب کرا , بوو بە یاء یەك دەڵێ بوو بەواویش قەلب نەکرا بە هەمزە . جا دەفەرمووێ (**ولم تقلب واو** ) واوی دووەم قەلب نەکرا, بە هەمزە لە دوای ئەم ئەلفە, جا دەبێتە واو (**لانها اقرب الی الالف من الیاء** )چونکە ئەم واوە نزیکتر و گونجاوترە بۆ ئەلفی لە (ی)ی یانێ واو لە دوای ئەلف بێت خۆشترە , نەوەك (ی)ی لە دوابێت (مخرجی) ئەلف و مخرجی واو لێك نزیکن بەلاّم مخرجی (ی) دوور ترە: (**فهی اخف منها بعد الالف** ) واو سوکترە لە (ی) لە کاتێك لەدوای ئەلف بێت نەوەك لە هەموو شوێنێك چونکە لە ڕاستیدا واو گرانترە لە (ی) لە غەیری ئەم شوێنە ئەمەش ئاخیری حەوت معتەلەکانە جا کاتی هات باس لە مهموز بکرێت.

دەفەرمووێ ﴿**فصل**﴾ دەست پێ دەکات بە فصل (**فصل فیبیان المهموز**): ئەم فصلە کە باس و بەیانی مهموزی دەکات : مهموز ئیسمی مفعوله : هەمزە مصدەریتی , همزە لە (لغة)ی عەرەب بەمانا وەسوەسەیە . بۆیەش بە هەمزە دەڵێن همزە , چونکە پیتەکی بەشددەتە : وە مەهموز لە زاراوەی زانایانی ئەم عیلمە ئەوەیە کە یەك لە سێ پیتەکانی هەمزە بێت . جا ئەوەش سێ جۆری هەیە , چونکە ئەگەر فاء الفعل هەمزە بێت مهموز فایە : وەکو(امل) وە ئەگەر عەین الفعلی هەمزە بێت مهموز عەینە وەکو(سئل) ئەگەر لام هەمزە بێت ئەوە مهموز لامە وەکو(قرا) .

(**حكم المهموز من حيث الهمزة في تصاريف فعله حكم صحيح** ): واتە حوكمی مەهموزی و حال و باڵەکەی لە ڕووی پیتی هەمزەوە نەك لە ڕووی حەرفەکانی عللەوە , لە گۆڕاندن و گۆڕانکاری مەصدەرەکەی بۆ لای مشتەقاتەکان : کە ماضی و مضارع و هتد حوکمی وەکو سالم وایە ,بەڵاّم ئەگەر ئەم مەهموزەش حەرفی عللەی تێدا هەبوو یان مضارع بوو : بێ گومان لەم ڕووە حیسابی ئەوانی بۆ دەکرێت . بۆ وێنە (أ ب وجا ء ) حوکمیان وەك (قال وباع) وایە و (أسّ) وەکو (مدّ) وایە کە مهموز و مضارعة (مدّ) تەنها مضاعفە . جا ئەم فەرمودە وادەکەین کە هەمزە هیچ گۆڕانی تووش نابێت جا ئەم گومانە لادەبات بەم فەرموودەیە (**لكنها قد تخفف اذا وقعت غير أول**) بەڵاّم هەندێك جار گۆڕان تووشی هەمزە دەبێت بۆ سوککردنی لە کاتێك لەسەرتای ووشە نەبێت (**بان لايكون قبلها شئ**) غەیرە ئەوەل چۆنە , بەم شێوەی کەشتێکی لە پێش هەبێت ,جا ئەم شتەی کە لەپێشی هەیە یەك پیت بێ یا زیاتر : وە لەووشەی خۆی بێت یان نا (**لانها حرف شديد من اقصى الحلق**) لەبەر ئەوە سوك دەکرێ چونکە ئەمە هەمزەیەکی گران و بەهێزە لە خوێندنەوەدا, چونکە لەلای ژووری گەرو دایە, چاکە سووك بکرێ بەم شێوانەی کە باسی دەکات (**وذلك اما بالقلب او الحذف او جعلها بين بين اى بينها وبين حرف حركتها** ) تخفیفی ئەو هەمزە بە سێ جۆرە یان قەلب دەکرێ بە واو و (ی)ی و ئەلف . یان حەذف دەکرێت یان (تسهیل ) دەکرێ کە پێی دەڵێن (بين بين)ە. وە بۆ ئەم (بين بين )ەش دوو جۆر بۆ چوون هەیە , ئەیەوێت بۆ مان دیار بکات , کە خۆی دەفەرمووێ (**أي بينها وبين حرف حرتها**) واتە (بين بين ) ئەوەیە کە ئەم هەمزە لە خوێندنەوەدا لە بەینی خۆیی وەبەینی حەرفی حەرەکەی خۆی بێ : وە بێگومان حەرەکەی هەمزە یان فتحەیە یان کەسرەیە یان ضمە یە . وەئەگەر لە بەینی هەمزەو ئەلفە, وە ئەگەر کەسرەیە لە بەینی ضمە و (یی) یە وەئەگەر ضمە یە لەبەینی هەمزەو واوە : جا ئەم هەمزە بەم شێوەی دەخوێندرێتەوە (**هذا هو المشهور** ) واتە (بين بين )ە بەم مانایەی کە گوتمان پێی دەڵێن (بين بين المشهور) (**وقيل بينهاوبين**

**حرف الحركة ما قیبلها**) ئەمەش مانای دووەمە لە مانایەکانی (بین بین) واتە گوتراوە (بین بین)ە ئەوەیە کە هەمزە لە نێوان خۆیی و نێوان حەرفی حەرەکەی حەرفی پێش خۆی بێت بووینە . ئێستا (سئل) کە مجهول ماضی‌یە. حەرەکەی هەمزەی کەسرەیە وە حەرەکەی حەرفی پێش هەمزەی ضمەیە جا ئەگەر هی مشهورە . ئەم هەمزە لە نێوان هەمزەو واوە. ئەوجار هاتە سەرمیثالەکان دەفەرمووێ (**فتقول امك یأمل کنصر ینصر**) یانی حوکمی مهموز بالفاءی لەبابی یە کەم وەکو سالمی وایە لەم بابە ( امل ) فعلی ماضیە وەکو(نصر) وایە ( یامل ) مضارعە .وەکو ( ینصر ) وایە ( **والامر اومل بقلب الهمزة واوا**) تو دەلێیت لەئەمری بە صیغە لەم بابە (اومل) قەلبی هەمزەکەی بەواو . چونکە ئەسلەکەی ( أأمل) بوو.بە دوو هەمزە .یەکەم وەصلە : دووەم فاء الفعل : هی دووەم کرابە واو بووبە اومل ( **لان الهمزتین ان التقتا فی کلیمة واحدة ثانیهما ساکینة وجب قالبها بجنس حرکة ما قبلها** ) بوبە هەمزە قەلب کرا بە واو . چونکە هەرکاتیك دوو هەمزە گەیشتنە یەك لەپێش ووشە وە دووەم لە دوو هەمزە ساکن بوو واجبە قەلبی هە مزەی دووەم بکرێ بە حەرفێك کەموناسبی حەرەکەی هەمزەی پێشو بێت یانی ئەگەر هەمزەی یەکەم حەرەکی لەسەر بێت هی دووەم دەکرێ بە ئەلف : وەئەگەر ژێر بوو دەکرێ بە(ی ) وەئەگەر بۆربوو دەکرێ بەواو ( **کـامن اومن ایمانا** ) ئیستا امن ماضي بابی ( افعال ) وەئەسلەکەی اامن بوووەکو (اکرم ) ە هەمزەی دووەم قەلب کرا بە حەرفێك کە مناسیب حەرەکەی حەرفی یەکەم کە ئەلفە وە اومن دەتوانی بلێت مجهولی ماضیە لەم بابە . مضارعي معلوم هەرلەم بابە. ئەسلەکەی أأمن بوو. هەمزەی دووەم قەلب کرا بەواو . چونکە مناسیبی حەرفی پێشو ( ایماناً) مصدەرە هەرلەم بابە . ئەسلەکەی أأماناً بو هەمزەی دووەم کرابە (ی) لەبەر مناسیبەی پیش خۆی. گوتمان ئەگەر ئەم هەمزە ساکنەهەمزەی لە پێش بوو . وەهەردوکیان لەییك ووشەی دابون قەلب واجبە ئەوجا دەفەرموی (**وان کان قبل الساکنة غیرها اوکانتا فی کلیمتین فالقلب جائز**) واتە ئەگەر لەپیش ئەو هەمزە ساکنە غەیری هەمزەی هەبوو. یانی پیتیك

هەبوو بەلاّم هەمزەنەبوو وەکو ( یوءمن )یان (بئو)یان (رئس) یان هەر لەییّك ووشە دانەبوون وە کویامرء ائت .لەم شوێنانە قەلب واجب نیە .بەڵکو جائزە .یان دروستە قەلبی هەمزەی دووەم بکەی بەئەلف یان واو یان یی ) یان دروستە بلێت بئر بەهمزەوبیر .بە (یی ) ئەوانی دیکەش بەم شێوە : پاشان فەرموی دووەمیان ساکن بێت ئەگەر نەبوو جادەفەرموێ **(وان کانت الثانیة متحرکة فلها احکام)** یان ئەگەر هەمزەی دووەم لەم دووانە : جەرەکەداربوو هەمزەی دووەم . چەند حوکمێکی بۆ هەیە کەئەوانەن **(وهی ان الاولی ان کنت ساکنة** ) یانی حوکمەکان ئەوانەن : هەمزەی یەکەم یان ساکنە یان مُتحرکە جائەگەر ساکن بوو . وەلام الفعلیش نە بوو **(کتسالّ مشددة تثبت)** وەکو سآل بە هەمزە وشەددە. لەم شوێنە همزەی دووەم لە شوێنی خۆی دەمێنێ : ئێستا سآل کە کەسیفەی موبالغەیە وەکو خرّاب . هەمزەی یەکەم دەغم کراوە لەهی دووەم .وە وەهەردووکیان ماون : **(وان تحرکت ایضا)** وەئەگەر هەمزەی یەکەم حەرەکەداربوو . وەکوهی دووەم **(قالوا وجب قلب الثانیة باء ان انکسر مع ما قبلها او انکسرت)** واتە یانی علیمی (نەحو) گوتیان واجیبە قەلبی هەمزەی دووەم بکرێ بە(ی) بەومەرجە کەپیتی پێشە خۆی مەکسوربێت. یان هەمزەی دووەم بەخۆی مەکسوربێت **(کجاء ائیمة** ) ئێستا ووشەی جاء کە ئیسمی فاعلە . ئەسلەکەی جاء بوولەسەر بۆچونی هەندێك لەزانایان) بەهەر حال لێرەدا هەردوو هەمزەکان حەرەکەدارن . هی دووەم ماقەبلی مەکسورە . وەکردمان بە(ی ) بووبە جاءی پاشان ئیعلالي قاضي مان بۆکرد .بووبە جاء : وە (أئیمة) بەهەمان شێوە هەردوك هەمزەکان حەرەکەدارن . بەلام ئەو جارە هی دووەم خۆی مەکسورە , قەلب کرابە (ی ) بووبە أیِمّة کە جمعی (امام)ە بود لەپێشتریش أامِمة بوو وەکو أسورة .بەلام کەسرەی میم یەکەم نەقل کراوە بۆ هەمزەی دووەم . وەمیم لەمیم دەغم کراوە :( واواً في غیره) زانایان گوتیانە واجبە قەلبی هەمزەی دووەم بکرێ بەواو : لەغەیری ئەم دووشوینە باسکراوە. (کأویدم ) ئیستا أویدم کە تصغیری (أآدم )ە . ئەسلەکەیّ أاَیدم بوو. وەهەمزەکان هەردوك حەرەکەدارن. بەلام

هی دووەم نەخۆی مەکسورە. وە نە ماقبلەکی مەکسورە. نەمان کرد بە(ی) : بەڵکو کردمان بەواو. بەلێ ئەوەی گوتمان ئەوە مەشهورە لەناو زانایانی (نحو) بەلام چەند وشەیەك هەیە بەم شێوە لەگەڵیان نەکراوە. وەکو دەفەرموێ **(ويُردّ عليهم انه صح التسهيل أي بين بين في نحو أئمية)** واتە دێتە سەر ئەم فەرمودەیان (گلەی) و اعتراض کە گوتیان واجبە ئەم قەلبە بەم شێوەیە : کە دروست (تسهیل) واتە بین بین)ەی باسکراوە نەمەو هاوێنەکانی کە دوو هەمزەی هەیە, یەکەمیان مفتوحە وەهی دوومیان مەکسورە وەواجب نیە ئەم قەلبەی کە گوتیان , بەلکو تسهیلیش دروستە **(والتحقيق أي اثباتهما مصرحاً)** وەهەروەها هەندێکی تر لە زانایان گوتوویانە دروستە لە أئمتوە هاووێنەکانی کە هەردوك هەمزەکان سابت بن وەهیچ گۆڕانیان تێدا نەکرێت , بەڵکو هەردووك بخوێندرێنەوە بە (صراحەت) و بە لەفظ کە لە قرآنی پیرۆز بەزۆری بەم شێوە هاتووە ( **قاتلوا أئمة الكفر** ) ئەمەی گوتمان ئەوە ڕوو لە فەرموودەی یەکەمیان دەکات : کە گوتیان هەمزە خۆی مەکسورە یان ماقبل مکسور واجبە قەلب بکرێ بە (ی) کەچی واجب نەبوو ئینجا فەرموویان لە غەیری ئەم دوو شوێنەش واجبە بکرێ بە واو وەکو (أُوَيْدِم) جا دەفەرموو ئەوەشیان تەواو نیە لەبەر مضارعی بابی افعال کە ئەوديە ( **والتزم في باب اكرم حذف الثانية**) ئەمە عەطفە بەسەر ووشەی (صح )ە واتە دێنە سەریان بە اعترض لەسەر فەرموودیان کە گوتیان لە غەیری مەکسور (جاءٍء) و ماقبل (ائمة) مەکسوری کە هەمزەی دووەم دەکرێ بە واو (أُيدم) ئەوەتە لێرە واجب کراوە حەزفی هەمزەی دووەم لە مضارعی بابی إفعال کە (اكرم) وە ئەسلەکەی (أُأَكْرِم) بوو بە پێ ی قانونی پێشوو دەبوو هەمزەی دووەم قەلب بکرێ بە واو , وەکو اويدم بە لاّم قەلب نەکراوە , بەلکو حەزف کراوە . ئەوە باسی ئەم دوو هەمزە بوو کە لە یەك ووشە دابن ئەو جارە دەفەرمووێ **(وان كانتا في كليمتين** ) یانی ئەگەر ئەم دوو هەمزە هەر یەك لە ووشە یەك بوون جا گەیشتبوون بە یەك وەکو (**جاء أحد** ) کە لێرەدا پانزە میسال دروست دەبن , چونکە هەمزەی دووەم لەسەر ، وەهی پێشی چوار, هی دووەم بۆر, هی پێش چوار,

هی دووەم ژێر, هی پێشی چوار ئەمە دوازدە, هی دووەم ساکن, وەهی پێشی سێ : ئەمە پانزە (**فیجوز تحقیقهما او تخفیف احداهما**) لەو کاتە دروستە هەردووکیان بهێشترێنەوە بەبێ گۆڕانکاری , وە دروستە هەردووکیان سووك بکرێن , وەدروستە یەك لە دووەکان سووك بکرێ , یان هی یەکەم یان هی دووەم . ئەوە بوون بە چوار (مامەڵە ) لەگەڵ ئەم دوو هەمزەی کە هەر یەکی لە ووشەیەکدانە (**علی حسب ما یقتضیه تخفیف کل واحدة** ) جا کە سووك کردنی هەردووکیان یان یێك لە دووەکان بەگوێرەو ئەندازەی سوککردنیان کە قانونو یاسایێکە لێیانی دەویست . واتە ئەم هەمزە ئەگەر تەنهابایە یان لەگەڵ هەمزەیەکی تر لەیەك ووشەبایە چۆن سووك دەکرا ئیستاش بەهەمان شێوە. حیسابیان بۆ بکە: پوختەی ئەمە ئەوەیە: کە هەرکاتێك دوو هەمزەگەیشتن بەیەکتر. وەهەریەکی لە ووشەیەك بوون: تۆدەتەوێت هەردوکیان سوك بکەی. یان هەریەکی بەتەنها. جائەگەر هەردوکیان سوك بکەی بەم شێوە بیکە: ئەگەر هی یەکەم تەنها بوایە چۆن سوك دەکرا ئێستاش ئەو هابیکە. وەهی دووەم ئەگەر لەیەك ووشە کۆبو بایەوە. چون سوك دەکرا. ئەم جارەش بەم ڕێگایە بیکە: بۆ وێنە (**قَارِءُ أَبِيك**) دووهەمزە گەیشتن بەیەك تر. لە دوو وشەدا: هی یەکەم ماقبلی ژێرد بیکە بە (ی) چونکە ئەگەر تەنهاش بایە. دەکرا بە (ی) وەکو (**مأة**). وەهی دووەم، وەکو (**أوَيدم**) وە دەشتوانی بیهێلیەوە بەساغی. چونکە دروستە لە (**أئمة**) هی دووەم ثابت بێ وەکو دەشتوانی (بین بین)ەی مەشهورزەو غەیرە مەشهور بکەی بەگوێرە حەرەکەی هەمزەو ماقبلەکەی:- وە ئەم جارە ئەگەر بتەوێ یەکی لەم دووە سوك بکەی. بێ گومان یان لە حەرەکە یەکسانن. یان نا جائەگەر لە حەرکە یەکسان نەبوون. وە ویستت کامیان سوك بکەی سوکی بکە. بەپێی یاسای پێشو، لەکاتێك تەنها بوایە، وە ئەگەر لە حەرەکە وەك یەك بون. بەخۆی دەفەرموێ: (**وجاء في المتفقين حركة حذف احداهما أو قلب الثانية كالساكنة**). دروستە لەم دوو هەمزەی کە لە حەرەکەدا یەکسانن. واتە هەردوك لەسەریان هەردوك ژیر، یان هەردوك بۆڕ: حەزفی یەکی لەم دووە بکە، یان هی یەکەم

یان هی دووەم: وە هەروەها دروستیشە قەلبی هەمزەی دووەم بکەی. وەکو هەمزەی ساکنە. کەباسکرا. گوتمان قەلب دەکرێ بەحەرفێك کە موناسبی حەرەکەی هەمزەی پێش خۆیەتی وەکو (**أمن: فتقلب في جاء احد ألفاً. وفي من تلقاء إبله ياءً. وفي يدرءُ أولئك واواً**): واتە قەلبی هەمزەی دووەم دەکرێ لەمیثالی (جاءً أحد) کە هەردوك لە سەرن بەالف وەکو (آمن) وە قەلب دەکری لە میسالی (من تلقاءِ إبله) کە هەروەك ژێرن. بە(ی) وەکو إیمان. وە قەلب دەکرێ لەمیسالی سێیەم (یدرء أولئك) کە هەردوك بۆرن، بەواو . وەکو (أومن). بەڵام گوتمان ئەم شوێنە پانزدە میسالی دەوێت. جائەمانەوێت بەتەواوی بنوسین[٤].

پوختەی ئەم باسە ئەوەیە: دروستە لەم دووهەمزە: کە لە دوو ووشەدانە وە لەحە رەکە یەکسانن. یەکی لە دوەکان حەزف بکەی. بڵێت جاءَ حد. وە دەشتوانی قەلبی دووەمەکەی بکەی. بەئەلف یان بە واو یان بە (ی) وەکو ئەو هەمزە ساکننەی کەباسکرا بڵێت جاءَ أحدَ... هتد. ئەمەی باسکراو هەمزیەك بوو لە حەرەکە داربێت وە لەپشتی هەمزەکەی تر هەبێت: ئەم جارە دەفەرمووێ: (**وأما المتحركة اللتي قبلها حرف غير همزة:**) تەنها ئەم هەمزەی کە حەرەکەدارە. وە حەرکەی غەیری هەمزەی لەپێشە. ئەمەش دەبێتە دووبەش. یان ساکنە یان حەرەکەدارە: وە ئەم ساکنەش کە لەپێش هەمزەیە: یان لە (کلمە)ی هەمزەی دایە: یان نا: جا ئەگەر لە

---

٤ هی دووەم مفتوح: هی یەکەم هەرچوار حاڵەت:

جاءَ أحمد: يقرءُ أحمد، من تلقاءِ أحمد، لم يقرء أحمد

(دووەم ژێر: یەکەم هەرچوار)

جاءَ إبراهيم: يقرءُ إبراهيم: من تلقاءِ إبراهيم، لم يقرء إبراهيم.

دووەم بور یەکەم هەرچوار

جاءَ أوميد يقرءُ أؤميد من تلقاءِ أميد لم يقرءْ أوميد

دووەم ساکن یەکەم هەرسێیەك

القارءُ اءْذن القارءَ . القارءِ أؤْذن

(کلمە)ی هەمزەی بوو یان حەرفەکی صحیحە. یان حەرفی عللەیە: وە ئەگەر حەرفی عللە بوو یان واوە یان بییە یانَ ئەلفە: وە ئەگەر واو بێ یان (یی)بی ئەمەش (یان زیادن یان ئەسلن: وە ئەگەر زیادن) یان بۆ إلحاق زیادکراون یان نا. جا لێرە ئێمە پانزدە میسالمان دەوێت: جا دەفەرموی (**فأن کان ساکناً وهو واو أو یاء زائدتان لغیر اللحاق:**) واتە ئەگەر ئەم حەرفەی کە لەپیش هەمزەیە ساکن بوو: جا واو بوو یان (یی): وە هەردوکیان زیادبونو بۆ الحاقیش نەبوون.( **قلبت الهمزة إلية جوازاً وادغم.**) لەوکاتە قەلبی هەمزەکەی دەکرێ بەم حەرفە ساکنەی پێشە خۆی. جائەم حەرفە ساکنە دەغم دەکرێ لەم حەرفەی کە قەلب کراوی هەمزەیە: بەلاّم ئەم ئیعلالە واجب نیە. بەڵکو دورستە(جائزە) واتە قەلبەکە جائزە. بەلاّم دەغم کردن واجبە چونکە (إجتماع المثلین) روودەدات (**کخطیئة في خطیئةٍ**). ئەسلەکەی خطیئة بوو بەهەمزەی لەسەر وەزنی فعیلە)ی: هەمزەك کرا بە (ی) زیاد بوو غەیرە الحاق: (**ومقروؤة في مقروءة**). مقرؤة بەشەددە ئەسلەکەی مقرؤءة بوو. وەکو مفعولە: وە هەمزەکرا بەواو واوی یەکەمی تێدا دەغم کرا ئەمەش میثالی واوی زیادە بوو غەیری الحاق؟ (**وکثر في نبي وبرية**) واتە زورە ئەم جۆرە ئیعلالە. کە قەلبو دەغم)ە لەم ووشانەی وەکو نبی وبریّە). ئێستا نبی. فعیل)ی بەمانا فاعلە. مصدرەکەی (نباءً)ە واتە مهموز الامە: لە (نبوە) نیە: جا ئەسلەکەی نبیءَ بوو. وەکو (فعیل) هەمزەکەی کرا بە (ی) پاشان (إدغام کرا) وە بریّە. ئەسلەکەی لەسەروە وەزنی فعیلە) بەمانا مفعولە) واتە (مخلوق) هەمزەکەی کرا بە (ی) پاشان دەغم کرا. هی ئەوەل لە دووەم( **وان کان الفاً فبین المشهور** ) واتە ئەگەر ئەم ساکنەی کە لەپێش هەمزەیە ئەلف بوو. ویستت سوکی بکەی (بین بین)ەی مەشهوری بۆ بکە: جا ئەم هەمزەی کەئەلفی لەپێشە: یان مفتوحە. وەکو سائل. یان مەضمومە. وەکو (تسائُلاً) یان مەکسورە. وەکو سائِل. لەم سێیە یەکەم بەردو ئەلف دەچێ: لە هی دووەم بەرەو لای واو. لەهی سێیەم بۆ لای (ی) دەچی: کە ئەوە هی مەشهورەکەیە (**وإن کان غیر الالف والواو والیاء المذکورتین**): یانی ئەگەر ئەم ساکنەی کە لە پێش هەمزەیە: ئەلف نەبوو.

وە ئەم واوویە ی ناوبراویش نەبوو: کە زیادبونو بۆ الحاقیش نەبون: وە لەووشەی هەمزەکەدا بون. کە ئەمەش چەند میسالێکی لیّ دروست دەبێت: یەکەم هەر واو ی ویائی) نەبێ یان ئەوان بن بەلاّم ئەصلی بن: یان زیاد بن بەلاّم بۆ الحاق بن. یان هەر لەیەك ووشە دانەبن. وەکو میسالی هەمویان دێت لەم هەمو شوینانە ( **نقلت حركتها إليه وحذفت.**) واتە نەقلی حەرەکەی هەمزەکەی کراوە. بۆ ئەم ساکنەی کەلە پێش خۆیەتی. جا حذفی هەمزەکەی دەکرێت. نحو( مسلة) بە فەتحی سین. ئەسلەکەی (مسئلة) بوو. نەقلی فەتحەی هەمزەکە کراوە بۆ لای سینی وە حەذفی هەمزەکە کرا. و (خبِ) ئەسلەکەیخَبَئا. بەهەمان شێوە. ئەم دوو میسالە. ئەوەیە کەلە پێش هەمزە ئەلف وواوی) نیە بە لّکو حەرفی صحیح هەیە (وشیِو سَوٍ)ئەسلەکە یان . شيءٍ وسَوْءٍ) بوو: حەرەکەی هەمزە نەقل کرا بۆ حەرفی پێش خۆی. کەواوە وەییەو حذف کرا. بوو بە شَيٍ وسَوٍ) ئەم دووەش میسالی واو و ییی)ی ئەسلە زیاد نیە وجَیَل وَ جَوَب. ئەمە ئەسلەکەیان جَیْئَل وجَوْئَب) بوو. وە کو جعفر نەقلی حەرەکەی هەمزەمان کرد بۆ ما قبلی. وە حەزفی هەمزەمان کرد. بۆ جَیَل وجَوَب: ئەمەش میسالی واو ویێ) زیادە بۆ الحاق بە جعفر)ی. (وأبو یّوبَ). ئەسلەکەی أبو أیوب)بوو. فەتحەی هەمزە نەقل کرا بۆ واوی. وحزف کرا: ئەمەش میسالە بۆ ئەم هەمزەی کەساکنی لەپێش هەیە کە واوە. بەلاّم لەووشەی خۆی دانیە: وە ساکنەکەش حەرفی عللەیە ومَنَ بوك. ئەسلەکەی مَنْ أبوكَ)ە بوو. بەهەمان شێوە تەنها ساکنەکە حەرفی صحیحە: (**في مسْئلة وخَبْئاً وشيِءٍ وَسَوْءٍ وابو أَیّوبَ.**) ئەسلی ئەم میسالانەی باسکراوە بەم شێوە بوو. لەهەموویان نەقلی حەرەکەی هەمزە کراوە بۆ حەرفی پێش خۆیيو وە حەزفی هەمزەکە کراوە (بو زیادە ئاسانی بروانە ئەم خشتەیە):

| ت | ئەسلەکان | ئیعلالکراو | |
|---|---|---|---|
| ١ | خطیئة | خطیّة | زیاد بۆ غەیری الحاق دەغم کراوە |
| ٢ | مقرؤة | مقرؤة | واو زیاد بۆ غەیری الحاق دەغم کراوە |

| ت | ئەسلەکان | ئیعلالکراو | |
|---|---|---|---|
| ٣ | سائل | سائل | بين بين المشهور ئەلفی زیاد |
| ٤ | مَسْئلة | مَسَلة | حەرفی صحیح حزف |
| ٥ | خَبْاء | خب | = = = = |
| ٦ | شيء | شي | (ی) ئەسلی = = |
| ٧ | سَوْءٍ | سو | = = = |
| ٨ | جَيْئل | جَيَل | (ی) زیاد بوو الحاق = |
| ٩ | جَوْئَب | جَوَب | واو = = = |
| ١٠ | أبو أيوب | أبو يوب | ساكن لە پیش هەمزە لەووشەی خۆی نیە وە غیرە صحیح |
| ١١ | مَنْ أبوك | من بوك | ساكن لە پێش هەمزد لەوشەی خری نیە وصحیحە |

وادیارە ئەم دوو میسالە. واتە مسئلة وخبأ یەکسانن دووی بۆ چیە.

(**وقد يُدغم في باب شيء وسَوْءٍ كالواو والياء الزائدتين**.) واتە کەم جار وادەبێت کە قەلبی هەمزەی دەکرێت لەم ووشانەی کەوەکو شيء وسوء. واتە: کەواوەکەو ییەکەیان ئەسلە.

قەلبی هەمزەی دەکرێت. بەم حەرفە ساکنەی پێش خۆی. کەواوە یان ییە. جادەغم دەکریت. بەوێنەی ئەم واو وێیەی کەزیاد کراون واتە کو لە خطيئة ومقرؤة).ەی هەمزەکراوە بەییو واو. وە دەغم کراود: لەبابی شَيء وسَوْء) یش بە هەمان شێوە. کە چی ئەوانە لێرە زیادیش نین. جا دەبێتە شيّ وسوّ: بەشەددەی واو یا) (**والتزم النقل والحذف في يَرى**) واجب کراوە نەقلی حەرکەی هەمزە بۆ ما قبلەکەی وپاشان حەزف بکرێ لەم مضارعە کە (یری)یە. ثلاثي مجرده لەبابی سێیەم چونکە ئەسلەکەی (يَرْأَيُ) بوو: وەکو یسئل: نەقلی فەتحەی هەمزە کرا بوو پێش خۆی وحزف کرا: وآری یُری. هەروەها واجبە حەزفی هەمزە لە ماضي ومضارعة. کە لەبابی إفعال)ن. ئەسلەکەیان ( **أَرْءَیَ يُرْأيُ**). وەکو أکرم یکرم، نەقلی حەرەکەی

هەمزە کرا بوو ما قبلەکەیان وەلە هەردوکیان حەزف کرا ( لە پێشان گوتمان ئەم هەمزەی کە غەیری هەمزدی لەپێشە دوو بەشە. یان ساکنە یان حەرکەدارە. جا ئەوەی ساکن ئەوە بوو کە باسکرا : ئەو جارە دەڵێت ( **وان كان ماقبلها متحركاً**) واتە ئەگەر ئەو حەرفەی کەلە پێش هەمزەیە حەرکەی داربوو. وە کو هەمزە بەخۆی حەرەکەدارە. (**فالهمزة إما مفتوحة أومكسورة أو مضمومة:**) ئەو هەمزەیەیان لەسەرە یان لە ژێرە یان بۆرە( **وعلى كل تقدير ما قبلها كذلك** ) بەپێ هەرییکی لەم سێ فەرزکراوە:- حەرفی پێش هەمزەش یان لەسەر یان ژێرە یان بۆرە سێ جار سێ. دەکات نۆ حاڵەت : بەم شێوە هەمزە سەر: ماقبل سەرو ژێرو بۆر: سَئَل مِأة: مُؤَجل: هەمزە ژێر: ماقبل هەرسێك: سَئِم. مستهزِئِين. سُئِل: هەمزە بۆر. ماقبل هەرسێك: رَئُوف مستهزِئُون رُئُوس: (**فالمفتوحة إن كان ما قبلها مضموماً تقلب واواً كموجل**) یەکەم ئەم هەمزەی کەلەسەرە وەحەرفی پێش خۆی بۆرە. ئەم هەمزە قەلب دەکرێ بەواو. وەکو مُوَجل. ئەسلەکە موءجل بوو. هەمزەکراوە بەواو چونکە ماقبلی بۆرە (**أومكسوراً فياء كمية**) ئەو هەمزەی کە خۆی لەسەرە وەحەرفی پیشە خۆی ژێرە. ئەم هەمزە دەکرێت بە (ی) وەکو مِيَة فی مُؤَجل ومأة. ئەسلی مؤجل)ی مؤجل بوو بەهەمزە وە ئەسلی مِيةَ مِأة بوو: ئەمە یەکەمو دووەم. (**والباقي بين المشهور**). ئەم حاڵەتانەی کەماون. کە حەوت حاڵەتە. لەهەموان (بين بين)ەی مەشهورە: وە میسالەکان دیارن ورۆنن.

(**وقيل في مضمومة ما قبلها مكسورة وفي مكسورة ما قبلها مضموم بين بين البعيد**) هەندێك گوتیانە لەم هەمزەی کە بۆرە حەرفی پێشی ژێرە. وە لەم هەمزەی کە ژێرەو حەرفی پیشی بۆرە لەم دوو میسالە بين بين)ەی (بعيد)ە واتە غەیری مەشهور کە زانین بچون بوو: کەواتە ( مستهزِئون) و سُئِل)ە جیابون لە حەوتەکان: چونکە هی مەشهور لەمستهزئون مەیلی هەمزە دەکات بۆ واو. وە لەسُئِل لەهەمزە بۆ (ی) هی غەیری مەشهور بە عەکسەوەیە (**وجاء مِنْساةٌ وسَالَ.**) هاتووە لەهەندیك زاراوەی (عربی) لەم دوو ووشەیە. کە هەمزە قەلب کراوە بەئەلف.

وە یاساوابوو کە (بین بین)ەی مەشهوریان تێدا بکرێت، جا منساە ئەسلەکەی مَنْسَأَة بوو وسَالَ (سَأَلَ) بوو: هەمزەیان کراوە بەئەلف. بەپێچەوانەی یاسای خۆی: کە(بین بین)دیە.

لەپێشان باسکرا. ئەگەر هەمزە ساکن لەپێش بو . نەقلی حەرکەی هەمزە دەکرێ بۆ ئەم ساکنەی کەلە پێش هەیە وەکو مسئلة: وە لێرەش باسی ئەوە دەکات : کەهەرکاتی ئەلف و لامی (تعریف) بخینە سەر ئیسمێك کە هەمزەی لە ئەوەلیە وە هەیە. وە کو (أَحْمد) بی گومان دروستە نەقلی حەرەکەی ئەم هەمزەی دووەم بکرێت. بۆ لای لامی تعریف: جائەم لامە حەرەکەدار دەبێت: بەڵام ئایا ئەم حەرەکەی کەبۆی نەقل کراوە: بایەخی پێ دەدرێت و(أعتبار)ی پێ دەکرێت یان نا: جائەگەر اعتباری پێ بکرێت لەم کاتە دروستە هەمزە وەصلەکەش حەزف بکرێت چونکە ساکن لێرە نەما. وە ئەگەر (إعتبار) بەم حەرەکەی ئەم لامە نەکرێت ( لەبەر ئەوە لەو لاوە بوی نەقل کراوە) دروست نیە هەمزەو وەصلەکە حەزف بکرێت. چونك (إبتداء) بەساکن دەبێت. لەبەر ئەوە ئەم لامە هەریە ساکن دەژمری: جالەم باسەو بابەتە دەفەرموی (**وإذاخففت همزة باب اَلْأَحْمر**) واتە هەرکاتێك سوك بکرێ ئەم هەمزەی أَلْأَحمر وهاووێنەکانی: کە مەبەست ئەوانەنە کەلە دوای لامی (تعریف) هەمزەك هەبێت: وەکو الْأَحمرو الإستغفار هتد: وە ئەم سوك کردنەش بەوە دەبێ کەنەقلی حەرەکەی هەمزەی (أحمد)بکەی بۆ لامی وەحەزفی بکەی ( **فبقاء همزة اللام أكثر من حذفها**) وەلەم کاتەیکەهەمزەی أحمدی لادرا لە دوای نەقل کردنی حەرەکەکەی بولای لامی: وە ئەم لامە (تعریف)ە حەرکەی بۆ پەیدا بوو: جا لەم کاتە مانەوەی هەمزەی وەصلی کە هەمزەی لامێ (تعریف) یە. زیاترە لەحەزف کردنەکەی: بەڵام دروستیشە حەزف بکرێت. وەکو هەمزەی (أحمد): فیقال اَلحمر. ئەسلەکەی (أَلْأَحْمر) بوو نەقلی حەرەکەی هەمزەی دووم کرا بۆ لای لامی وەحەزف کرا. ئێستا ئەم لامە حەرەکەدارە بەڵام چونکە ئەم حەرەکەلەلاوە هاتووە لام هەر بەساکن حیسابە. وە هەمزە وەصلەکە هەرماوە. تاکو (إبتداء) بەساکن نەبێت ئەمە بەزۆرترین لام

حیسابی ساکنی بۆ دەکرێت کەواتە هەر لەسەر ئەم زۆرترە واجبە بگوترێ مِنَ لَحمر بەفەتحی نونی (مِن) ی کە حەرفی (جره) کەئەسلەکەی (مِنْ اَلْأَحمر) بوو. بەڵام کەهەمزەکان حەزف کران وە ئەم لامەش هەبەساکن حیسابە. التقاء الساکنین بوو لەنێوان (نونو لام) جانون حەردکە دار کرابە فەتحە: بووبە مِنَ لَحْمر. وفِلَحْمر. هەر لەسەرحیاسبی زۆرترەکەی: دەگوترێ (فِلَحمر). ئەسلەکەی (في اَلْأَحمر): بوو هەروەك هەمزەکان لادران وەکو گوتمان. پاشان التقاء الساکنین بوو لەو نێوان (ی) ی فی ) کە حەرفی (جره): لەگەڵ لامی تعرف. کەگوتمان بەساکن حیسابە: بە ناچاری حەزفی (ی) کرا (لەفی)ی حەرفی جەری: بوو بە فِلحمر: وە ئەگەر لە سەر. یاسای کەمەکەش بێت. دەڵێت مِنْ لَحمر وفي لَحمر. بەسکونی نونی (مِن) ومانەوەی (ی)ی (فی): چونکە لەم کاتە ئەم لامە حیسابی ساکنی بۆ ناکرێ. وە هیچ التقاء الساکنین نەبو (**وهذا كله مما نقلناه من الشافية أوضح وأخصر**) ئەوەی کەباسمان کرد لەم شوێنەی کە دەفەرموێ (**لأن الهمزتين إذا التقتا في كلمة ألخ**) تاکو ئەم شوێنە. هەموی ئەم بابەتانە لەکتێبی (شافیه)مان نەقل کردووە. کەناوی کیتابی عیلمی (صرفه) دانراوی شێخ إبن الحاجب)ی کوردیە رحمه الله تعالی. جاکە لەویوە نقلّم کردوە زۆرئاشکراترو کورت ترم هێناوە چونکە زۆر شوێنی واهەیە پاشو پێشم پێکردووە. ووشەی نابیستەم بەکار هێناوە (**وهو كثير الأحتياج في القرائة**) وە ئەوەی نەقلم کردود زۆر پێویست دەبێت لەکاتی خوێندنی قورئانی پیرۆز وغەیری ئەویش (**فليحفضة المبتدى إن لم تأخذه السامة**) جا کە پێویست دەبێ: دەبا گرنگی پێ بدات ئەم قوتابیەی کە لە سەرەتای دەست پێکردنە. وە ئەم باسەو بابەتانە باش دەرخ بکاتو خۆی پیوە ماندوبکات بەو مەرجە توشی وەرسو سەر ئێشە نەبێت: وە نەڵێت چۆن ئەم هەمو میسالە تاوتوێ دەکرێت، بەڵام قورانی پیرۆز دەفەرموێ ﴿**وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى**﴾ (النجم:٣٩). ( **فأن كانت الأولى همزة وصل تعود الثانية همزة عند الوصل**) بزانە برای فەقێ لەپێشان گوتمان هەرکاتێك دووهەمزە گەیشتن بەیەك. لەیەك ووشەدا وە دووەمیان ساکن بوو واجبە قەلبی دووەمەکە

بکرێت بەحەرفێك لە موناسبی حەرەکەی هەمزەی پێشو بێت. وەکو أمن هتد: جالەوێندەر تەنها میسالی بۆ هەمزەی (قطع) هێنا. جالێرە ئاگادارمان دەکاتەوە. کەئەم یاسایە وەکو بۆ هەمزەی قطع دەبێت. هەروەها بۆ هەمزەی وەصلیش دەبێت: تەنها ئەوەندە هەیە. ئەگەر هەمزەی یەکەم هەمزەی وەصل بوو. حوکمی همزەی یەکەم جیاوازە لەگەڵ هەمزەی دووەم. وەکو مصنف رەحمەتی خودای لێ بێ ئەفەرموێ: (**فإن كانت الأولى الخ**) واتە ئەگەر هەمزەی یەکەم لەم دوو هەمزەیە هەمزەی وەصل بوو: ئەم هەمزەی دوەمی کە قەلب کراوە بە واو یان بە (ی) ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەسلی خۆی کە هەمزە بووە. لەکاتی کە ئەم ووشەیە لەگەڵ ووشەیەکی تر لێکدرا. وە هەمزە وەصلەکە لە بەیندا نەما ، وەهیچ جیاوازی نیە ما قبلی هەمزەی دووەم مفتوح بێت یان مضموم یان مەکسور (**نحو ومنهم من يقول أءْذن**) وەکو ئەم ئایەتە پیرۆزە: ئێستا لەکاتی خۆی هەمزەی دووەم کرا بوو بە (ی) چونکە ماقبلی مەکسور بوو: وەکو لە کاتی لامی (یقول) کەوتە پێشی: هەمزە وەصل لا چو: وەما قبلەکەش مضموم کەلامی (یقولُ)یە. ئەم هەمزەی کەکرابوو بە (ی) بووە بەهەمزە، (**ويازيد أءمل**). هەمزەی دوەم کراوە بە واو: چونکە هەمزەی لەپێش بووە. بەڵام کە (زید) هات: هەمزەی وەصل لە لەفزدا هەلات. وە ئیعلالیان بکە. وە حەزفی فاء الفعلەکەیان بکە. جاودزنەکەیان (عُلْ)ە (**وقد يجيء أ أمر على الأصل عند الوصل** ) واتە هەندیك جار أُأْمر دەخوێندرێـەوە. بەگوێرەی یاسا خۆی لە پێشان باسکرا: لەکاتی وەصلی بکەی لەگەڵ شتێ: وەهەمزەی وەصلەکە لا بچێ لەبەینا کقوله تعالى ﴿**وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاةِ**﴾ بەڵی گوتمان ئەسلەکەی تأمر بوو. حەرفی مضارعی لادرا. وە ئاخرەکەی ساکن کرا. وەهەمزەی وەصل زیاد کرا. بوو بە أُ أْمُرْ: هەمزەی دووەم کرا بە واو بەگوێرەی یاسا بوو بە (أومر) کەواو کەوتە پێش هەمزەی وەصل: هەمزەی لە بەینا نەما. ئەم هەمزەی کرا بوو بەواو. کەڕاوە بەهەمزە. بووبە (وَأْمر) (**وَأَزَرَ يأْزِر. وَهَنَأَ بَهْنأُ كضرب يَضْرِب** )واتە حوکمی مهموز الفاء. وەکو أزر یأزر. حوکمی اللامی وەکو هَنَئَ یَهْنِأُ لە بابی دووەم، وەکو

حوکمی سالمی وایە، لەم بابە (والأمر أيزر) ئەمری بە صیغە لەم ماددیە (إيزر) وەکو أضرب. ئەسلەکەی لە نزیك إأْزر بوو: هەمزەی دووەم کرا بە (ی) بەپێی یاسای پێشو **(وأَدُبَ يأدُب ككرُمَ يكرُم)** حوکمی بابی شەشەم لە مهموز الفاء: وەکو حوکمی بابی شەشەم وایە لەسالمی **(والأمر أودُب)** ئەمرەکەی (أُودُبْ) ئەسلەکەی لە نێزیکەوە أُأْدب. هەمزەی دووەم کرا بە واو. بەپێی یاسای پێشو **(وسَئَل يَسْئَل كمنَعَ يَمْنَعُ)** حوکمی بابی بەشەرت واتە سێهەم. لە **مهموز العين**/ ی وەکو بابی بەشەرت وایە. بەبێ هەمزەی( إِسْئَلْ) وە ئەمری بەصیغە لەم بابە اسئل. وەکو (إمنع) **(ويجوز على خلاف القياس سالَ يسأل سَلْ)** دروستە لەم بابە قەلبی هەمزەکەی بکەی بە ئەلف لە ماضیء لە مضارعی: لە جیاتی سئل یسئُل بلێیت سال یسال بەلاّم ئەمە خیلافی یاسایە، چونکەیاسا وابوو کەلێرەدا (بین بین)ەی مەشهور بێت: وە (سَلْ) کەفعلی ئەمرە. ئەسلەکەی سئل) بوو : یان هەر لەنیزیکەوە. ئەسلەکەی سَأل)بوو. حەرفی مضارعی لادە. وە ئاخرەکەی ساکن بکە دەبێتە سَألْ، التقاء الساکنین بوو لەنێوان ئەلفو لامی: حزفی ئەلفی کرا. بوو بە سَلْ، **(وقيل هو أجوف عينه واو أوياءٌ)** گوتراوە سال یسال (أجوف) مهموزنیە. وە عین الفعلەکەی: یان واوە سال یسال وەکو خاف یخاف. یان (ییە) وەکو هاب یهاب. بەلاّم ئەمەباسی ئێمە نیە. چونکە ئێمە باس لە مهموز دەکەین:

**(وأبَ يَؤُبُ وساءَ يسُوءُ كصان يصون)** واتە حوکمی بابی یەکەم لەمهموز الفاء ی ئەجوف. کە أب یؤب)وە: وە حوکمی بابی یەکەم لەمهموز اللامی ئەجوف کە ساء یسوء)وە هەردوکیان حوکمیان وەکو بابی یەکەم وایە لە ئەجوفی) کە هەمزەی نەبێت: کە (صان یصون) وە. وە بابیێیەکەم:**(وجاء يجيء ككال يكيل)** حوکمی بابی دووەم لە مەهموز اللامی ئەجوف. وەکو ئەجوفی بەبێ هەمزە وایە لەم بابە( **فهو ساءٍ وجاءٍ)** واتە ئیسمی فاعل لەم دوو فعلە: کە ساءَ. وجاءَیە(سَاءٍ وَجَأءٍ) **(أصلهما سَاوِءٌ وجَايِيء.)** ئەسلی ساءٍ (ساوءٌ) بوو: وە ئەسلی جاءٍ جایء بوو( **قلبت العين همزة كما في صائن وبائع)** قەلبی عەین الفعلە کەیان کرا بە

هەمزە. وەکو لە صائن‌و بائع / ی عەین الفعل کراوە بەهەمزە. کەلە (أجوف)ی باسکرا: واتە ساوء وەکو صاون: جایىء وەکو بایع: ئەوجا دووهەمزە کۆبونەوە چونکە دەبێتە ساءءٌ وجاءءٌ (**ثم قلبت الأخيرة، ياءً لأنكسار ما قبلها**) پاشان هەمزەی دووەم قەلب کرابە(یی) چونکە لە دوا ودیە وە ما قبل مەکسورە. جا بووبە جائیٌ وسائیٌ (**ثم أُعِّلاَّ إعلال غازٍ**) پاشان ئیعلال کران وەکو ئیعلالی غازٍ ورامٍ بەم شێوە. ضمە لەسەر (ی) گران بوو لاماندا وە التقاء الساکنین بو لە بەین (ی)ی (وتنوین) وە حەزفی (ی) کرا. بون بە ساءٍ وجاءٍ: ئەم ئیعلالە لەسەر بۆچونی سێبویهیە( رحمه الله) (**أو نقلت الهمزة الى موضوع العين ثم اعَلاً إعلال غازٍ**) بەڵام خەلیل. دەفەرموێ ئێمە قەلب عەینی ناکەین بەهەمزە بەڵکوقەلب المکانیان پێ دەکەین. واتە (ساوء)فاعل دەکەین (سائو)فالع. وە جایء (فاعل) دەکەین جائی.(فالع) نەقلی هەمزەکەی دەکەین بۆ شوێنی عەین الفعل: وە واو ویی دەچنە ئاخری، پاشان ئیعلالی غازیان بۆ دەکرێ: وەك باسمان کرد: (**والوزن على الأول فاع وعلى الثاني فال**) ئەوجا میزانی ئەو دوئیسمە فاعلە لە دوای ئیعلال کردنیان. لەسەر فەرموودەی سێبویەی کە ئەوەیە لە (فاعٍ) میزانەکەیانە چونکە لامیان حەزف کراوە. وەکو غازٍ . ورامٍ وە ئەگەر قەلب المکانیان بۆ کرا بێت وەکو خەلیل فەرموی. میوانەکەیان فالٍ). چونکە عەین الفعل نەقل کرا بۆ دوای وەحەزف کرا: کەواتە وەزنەکەیان فالٍ دەبێت (**وَأسايَأسُو كَدعايَدْعُو**) حوکمی بابی یەکەم لە مهموز الفای ناقص. وەکو حوکمی بابی یەکەم وایە لەناقص بەبێ هەمزە (أوسُ )ئەمرەکەی أوْس. وەکو أُغْزُ ئەسلەکەی تأسو. بوو. حەرفی مضارعي لابرا. هەمزەی وەصلی مفهموم داندرا وەحەزفی حەرفی ئاخری کرا، بوو أُوْس. هەمزە ساکن ما قبل مضموم کرا بو واو ( **وأتى يَأتي كرَمى يَرْمي**) حوکمی بابی دووەم لە مەهموز الفای ناقص. وەکو حوکمیبابی دووەم وایە لەناقص بەبی هەمزە( أیت )هەمزەکەی (إیتِ)یە ئەسلەکەی لەنزیکە وە (إْأب) بوو: هەمزەی دووەم کرا بە (ی) چونکە ساکن ما قبل مەکسورە(**ومنهم مَنْ يقول (تِ) تشبيها له بخذ**) واتە هەندیك لە عەرەبان: هەمزە قەلب ناکن بە(ی)

بەڵکوحەزفی دەکەن وە پیویستیش بەهەمزەی وەصل نابین دەبێتە (تِ) لەسەر وەزنی (ع) وەکو (ق) ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەشوبهاندراوە (ت) بەم فعلە ئەمرەکە (خذ) بوو. کەلەویشاهەمزەی ئەسلی حەزف کرا وە پێویست بەهەمزەی وەصل نەما لەبەر ئەوەکە زۆربکاردێن پێویستە سوك بکرێن(**وَوَأي يئ –إِ– كَوقى ويقي –ق**) حوکمی بابی دووەم لەمهموز العینی لە فیفی مفروق دا وەکو حوکمی بابی دووەم وایە لەم لەفیق مفروق بەبێ هەمزە و (أی) ئەسلەکەی و (أيَ)بوو. (ی) کراوە بە ئەلف (ییئ) ئەسلەکەی یَوْئي بوو. وەکو یَوْقي واو لە نیوان (یی) وە کەسرە حەزف کرا. پاشان ضمة لەسەر (ی) ثقیل بوو حەزف کرا. بوو بە (ییئ) وە ئەمری بەصیغە لەم ماددیە (إ) بەیەك حەرفی وەکو (ق) ئەسلەکەی لەنیز کەوە (تئی) بوو: تی لادرا پێوست بەهەمزە ناکات، وە ئاخیرەکەش مجزوم کرا بە حەزفی (ی) لام الفعل ، بوو بە -إ- لەسەر وەزنی (ع) (**وأَوي يأوي أَيَّا كُشواي يشوي شيًّا**) واتە حوکمی بابی دوهەمی مهموز الفای لە حوکمی بابی دووەمدایە لەم لەفیفەی بەبی هەمزە: أَیّا کەمەصدَرەوە ئەسلەکەی (وأياً) بوو: واو قەلب کراوە بە (ی) بەپێی یاسا. بوو بە أییاً. پاشان دەغم کرا. بوو بە أیَّا، بەشە ددی(یی) (متن) تو دەڵێت لە ئەمری بەصیغە (أیوِ) وەکو إشوِ. ئەسلەکەی لە نیزکەوە (إئْوِ) بوو هەمزە ساکن ماقبل مەکسور کرا بە (ی) بوو بە (أیوِ) (**ونأي ينأى كرعى يرعى**) حوکمی مهموز العین ناقص لە بابی سێیەم وەکو حوکمی ناقص وایە لەم بابە بەبێ هەمزە (**وكذا قياس رأى يَرئى**) وەکو نأى ينأى وایە حوکمی روی یری کەباش وابوو هەمزە بمێنێتەوە( **لكن العرب قد إجتمعت على حزف الهمزة من مضارعه**) بەڵام عرب یەکیان گرتووە لەسەر ئەوە کە حەزفی هەمزەکەی بکەن لە عەین الفعلە. لە مضارعەکەی. بۆسوك کردنی (**بعد نقل حركتها كما هو قياس حذفها**) بەڵام کەحزفی هەمزەکەی دەکەن. .پاشان نەقلی حەرەکەی ئەم هەمزە. بۆ ماقبلەکەی. هەروەکو دستور وایە کە نەقلی حەرەکەی بکەی ئەوجار حەزف دەکرێ (**فقالوا**) واتە عەرب گوتیانە لەحەزفی هەمزەی ئەم مضارعە.بەڵام هەمزە لە ماضیەکەی حەزف

نەکراوە (**يَرى يَرَيانِ يَرونَ**) ئەم سێیە بۆ مذکری غائب: ئەسلەکەیان يَرْئيُ يَرئَيان يَرئُونَ. وەکو يعلم يعلمان ألخ (**تَرى تَريانِ يَرَين**) ئەمەش بۆ مؤنثی غائبە (**ترى تريان تَرَوْن تَرون تَرَيْن تَرَيانِ تَرون أرى نَرى**) ئەمەش شەش مخاطب: سیێ مذکر وسیێ مؤنث لەگەڵ هەردوك متکلم. واتە وەحدە ومع الغير: لەم چواردە صيغە هەمزەی عەين الفعل حەزف کراوە وە لە هەردوك جەمعی مذکر (يَرَوْنَ وتَرَوْنَ)ەیە لام الفعليش حەزف کراوە: لەگەڵ مفردو مؤنث مخاطبە. چونکە ئەسلی يَرَوْن: کە جەمعی مذکری غائبة يرئيون وەکو يمنعون بوو: نەقلی حەرەکی هەمزە کراوە بۆ ماقبلەکەی وحزف کرا. بوو بە يَرَيُون. (ی) متحرك ماقبل مفتوح قەلب کرا بە ئەلف. وەالتقاء الساکنين بوو لەنیوان ئەم ئەلفە لەگەڵ واوی جمعی وە حەزفی ئەلفەکەی کرا بوو بە (يَروْن) لەسەر وەزنی يَفَوْن تەنها فاء الفعلی ماوە: و(يَرون)ەش بەهەمان شێوە: بەڵام تَرينَ تَرْئَينَـ:ە بوبەدو(ی) وەکو تَعْلَمينَ. نەقلی حەرکەی هەمزەمان کرد وحزف کرا بوو بە تَريين (يی) يەکەم لام الفعلە هی دووەم ضميرە وفاعلە بۆ مفردی مؤنثە. جا هی يەکەم متحرکە وماقبلی مفتوحە. وەقلب کرا بە ئەلف وە التقاء بوو حەزف کرا: بوو بە تَرَيْنَ لەسەر وەزنی (تفين)ە (**واتفق في خطاب المؤنث لفظ الواحدة والجمع**) وا هەڵکەوتووە لەم بابە کە صيغەی مفردی مؤنث وجەمعی مؤنث وەك يەك بن لەکاتی (خطاب) لەگەڵ کردنيان: بەڵام لەصورە وەك يەکە وان. لەتەقدير ليك جيان وەکو خۆی دەفەرموی (**لكنَّ وزنَ الواحدة تَفَينَ ووزنَ الجمع تَفلْنَ**) بەڵام لەفەرزدا وەزنی مفردی مؤنث مخاطبة تفين\يە چونکە عەين الفعل ولام الفعلی نەماوە. بەڵام وزنی جمعەکەی تَفْلْنَ/ يە چونکە عەين الفعل ولام الفعلی نەماوە بەڵام وەزنی جمعەکەی تَفَلْنَ)ەیە: چونکە تەنها عەين الفعلە کەی حەزف کراوە کەهەمزەیە: کە ئەسلەکە تَرْئَيْنَ بووبەيەك ياء ئەمەشيان لام الفعلە بەڵام هی مفرەدەکەی فاعلەو ضمير ماوە لام الفعلەکەی حەزف کراوە (**وإذا امَرْتَ منه**) هەرکاتی ويستت ئەمری بە صيغەی دروست بکەی لەم صيغەيە : (رأی يرای)يە: ( **قُلتَ على الأصل إرْءَ كَإرعَ**). بوو دەڵێت لەسەر ياسـای

فعله مضارعه کەی ئەسل: کە تەرك کراوە (إرعَ) چونکە ئەسلەکەی ترعي بوو. (تی) حەرفی مضارعە حەزفی بکەوە هەمزە وەصلەکەی زیاد بکە وئاخرەکەی مجزوم بکە بەحەزفی ییەکەی: دەبێتە إرْعَ وەکو إرْعَ کەئەسلەکەی (تَرعی) بووە.( **وعلی الحذف** **رَ**) علی وزن (فَ) وە تۆ دەڵێیت بۆ دروست کردنی ئەمری مخاطب لەم فعلە: لەسەر ئەساسی حەزفی هەمزە: دەڵێت (رَ) بەیەك حەرف لەسەر وەزنی (فَ) یە. چونکە ئەسلەکەی بکار هێندراوی تَری بووە. حەرفی مضارعی حەزف بکە لەگەڵ (ی) لەدواوە. دەبێتە (ر) لەسەر وەزنی (ف) واتەبەس فاء الفعلی ماوە ( ویلزمه الهاء في الوقف نحو(رە) جا لەبەر ئەوە یەك حەرف ماوەتەوە: واجبە (هی) ی سکتەی بوزیادبکەی لەکاتی لەسەر وەستانی. وەکو (رە) چونکە **(إبتداء ووقف)** لەسەر یەك پیت ناخۆشە: ( **تقول في الوصل بلا هاء (ر)** ) واتە تۆ دەڵێیت لەئەمری مخاطب لەکاتی وەصل کردنی بەووشەیەکی تر بەبێ هێ دەڵێت (ر) بەیەك حەرف بۆ مفردی مذکري مخاطب. ئەسلەکەی لە نیزیك (تری) بوو حەرفی مضارعي لادە لەگەڵ (ی) لەئاخری (ریا) بووتە تثنیه ی مذکر ئەسلەکەی تریان . (تی) لە ئەوەلیەوە لەگەڵ نونی ئاخری لادە. (رَوْا) بۆ جەمعیمذکری مخاطب . ئەسلەکەی (تَرَوْن) بوو (ی) لەگەڵ نونی لادە. دەبێتە (رَوْا) وەزنەکەی (فوْا )(رَيْ) بۆ مفردی مؤنث مخاطبة ئەسلەکەی ترین بوو (تی) ونون لادە. دەبێتە (رَيْ) لەسەروە زنی (فَيْ) ریا تە ثنیه ی مؤنثە وەکو هێ وایە (رَیْنَ) بۆ جەمعی مؤنث مخاطبة ئەسلەکەی تَرَیْنَ. (تی) لادە. دەبێتە رَین. ئەم نونە لا ناچێ. چونکە ضمیرە وفاعلە وەکو ئەوانی تر ئیعراب نیە ( **وبالتأكيد رَيَنّ**) تۆ دەڵێیت لەکاتی تەئکیدکردن ئەم ئەمرە بە نونی ثقیلە . رَیَن ئەسلەکەی (رَ) بوو بەیەك پیت کەتەئکید کرا لام الفعل گە راوە بەمفتوحی . بوو بە رینّ ( رَیان) ئەسلەکەی (رَیا) بوو تەئکید کرا بەنونی ثەقیلە. وەنونەکە مەکسور کرا ( رَوُنّ) بۆ جەمعی مذکری مخاطب. ئەسلەکەی (رَوْا) بوو . تەئکید کرا بەم نونە ثە قیلە التقاء الساکنین رویدا. لەنێوان نونی تەئکید و واوی جەمع. وە دروست نیە هیچیان حەزف بکەی لەبەر ئەمە لەپیشان زانیمان . واو (تحریك) کرا. بەحەرکەی مناسبەی خۆی کە

ضمەیە. بووبە (رَوُنّ) رَیِنَّ بۆ مفردی مؤنث مخاطبة. ئەسلەکەی رَيْ بوو. تەئکید کرا بەنونی ثەقیلە. وە التقاء پەیدا بوو لەنێوان نونی تەئکیدو (یی) ی مخاطبة: وە دروست نیە یەك حەزف بکرێت بەناچاری (بێ) حەرەکەدار کرا. بەحەرەکەی مناسبی خۆی کەکەسرەیە بوو بە رَیِنَّ ( رَیانِّ) بۆ تەثنیەی مؤنث . وەکو هی مزکروایە ( رَیْنانِّ) بۆجەمعی مؤنثی مخاطبة. ئەسلەکەی (رَینَ) بوو. تەئکید کرا. بوو بە رَیْنَنَّ ئەلفیکمان خەستە نێوان نونەکان: وەنونی تەئکید مەکسور کرا بوو بە رَیْنانِّ( **وبالخفيفة رَیَنْ** ) ئەسلەکەی (رَ) بوو نونی خەفیفە هات لام الفعلی هێناوە (رَوُن) جەمعی مذکرە ئەصلەکەی رَوا بو کەنونی خەفیفە هات واوی جەمعی مذکر مضموم کرا لەبەر التقاء الساکنین( رَیِنْ) بۆ مفردی مؤنث مخاطبە. ئە سلەکەی (رَيْ) بۆ تەئکید کرا بە نونی خەفیفە. التقاء الساکنین رویدا لەبەینی (ی) ونون (ی) مەکسور کرا. بو بە رَیِنْ:

میسالی دوو تەثنیە لەگەڵ جەمعی مؤنث لەنونی خەفیفەدا نابێت. وەکو خۆت دەزانیت. هاتەسەر ئیسمی فاعل( فهو راءٍ) واتە ئیسمی فاعل لەم بابەوە لەم ماددە. هەمزەی حەزف ناکرێت. راءِ ئەسلەکەی رائی بوو وەکو عالم: ئیعلالی وەکو رامٍ وایە (رائیان)بۆ تەثنیەی مذکرە جائەگەر لەمفردەکەی دروست بکەی. بەم شێوەیە: ئەسلەکەی راءِ بو. ئەلفو نونی تەثنیە زیاد کران. وەلاّم الفعل گەراوە بەمفتوحی: بوو بە (رائیان) لەحاڵەتی رەفع دا وە لەحاڵەتی نەصب وجەرە رراِئِیَیْنِ (رائون) وەزنەکەی فاعون بۆ جەمعی مذکرە: ئەسلەکەی (راءِ) بۆ نیشانەی جەمع لەحاڵەتی رەفع دا واوو نونە. زیادمان کرد. بوو بە رائون. واتە نیزك تر و لە پێشتریش (رائیون) بو : ضمەی (ی) نەقل بکە بۆ هەمزە. لە پاش حەزفی حەرکەی خۆی. جا التقاء رویدا لەنێوان (ی)و واوی جەمع : حزفی (ی) کرا. بوو بە رائون: لەحاڵی رەفع داوە لە دووحاڵەتی تر (رائین) وە بومؤنث رائیة رائیتان رائیات (**کراع راعیان راعون**) یانی حوکمی مهموز العین معتل اللام لەم بابە وەکو حوکمی معتل اللامی وایە: کەبە بێ هەمزە بێـ لەم بابە : کەبابی سێیەمە کە ئەسلەکەی (**راعيٌ راعیان راعیون**)ە

بووە، (**وذاك مَرْئِيٌ كمَرْعِيٍّ**) واتە ئیسمی مفعول لەم ماددەیە کەمهموز العین/د وناقصە: هەمزەی دەمینی. وە ئیعلالی وەکو (مرعی) وایە کە معتل اللامی بەبێ هەمزەیە ئەسلەکەیان مَرْئوي ومرعوی بو: وە ئیعلالە کەیان وە کو مَرْئي وایە کەئەسلەکەی (مَرْمُوي) بوو. لەپێشان باسکراوە:

زانیت کە (يَري) مخالفی مضارعە کانی تربوو لەحەزفی هەمزەی لیرەش باس دەکات. کەبابی إفعالیش لەم ماددیە مخالیفی شوینەکانی ترە: بەلاّم لە مجردەکەیەتی تەنها مضارع مخالف بوو : بەلاّم لەبابی إفعال لەهەمو صیغەکان موخالیفە. جادەفەرموێ (**وبناء أفعل منه مخالف لأخواته أيضاً**) واتە بینای بابی إفعال لە ماددەی (رئي يرى) مخالف وپێچەوانەی هەموو صیغەکان بابی إفعالە: لەغەیری ئەم ماددەیە: هەروەکو (رءی یَری) مخالفی وێنەکانی بوو: بۆ وێنە حەزفی هەمزەی دەکرێ لەم مضارعە کە (رَاي) ئەسلەکەی (يَرْأَيُ) بوو. بەلاّم بناءی حەزفی لێ ناکریت کەهەمان بابە: جا مەزیدەکەشی لە بابی (إفعال)د بەهەمان شێوە: مخالفی بابەکانیترە لەماددەکانی تر( **لكن في جميع تصاريفه هنا**) بەلاّم وامەزانە کەئمەش هەر لەمضارعي مخالیفە. بەلّکو لەهەمووصیغەکان مخالفە لێرەدا. یانی لە ماضی و لە مضارعي لە ئەمریش هتد جابامیسالی بهێنین (**فتقول أري اصله أَرْءَي**) یانی تۆ دەلّێیت لە دروست کردنی بابی (إفعال) لەم مادەیە (أرى) ئەسلەکەی أَرْءَ ی. بوو وەکو (أَعْطی أکرم). (**نقلت حركة الهمزة إلى الراء فحذفت فصار أري**) نەقلی حەرەکەی هەمزەی کرا. بۆ حەرفی پێش خۆی وە حەزف کرا بۆ سوکی: وە (یی) لام لافعلیش قەلب کرا بە ئەلف. بوو بە (أری) لەسەر وەزنی (أَفَلَ) ( **يَرى أصله يُرْئي نقلت حركتها فحذفت فصار يُرى**) ئەسلەکەی يُرْئِيُ بوو. وەکو یعطي یکرم. نەقلی حەرکەی هەمزەمان کرد بۆ حەرفی پێش خۆی. وەحذفمان کرد لەبەر سوکی پاشان ضمە لەسەر (ی) گران بوو لادرا. بوو بە (يُرِی) لەسەر وەزنی يُفِل: (يُرِيان) ئەمەش تەثنیەیە ئەسلەکەی يُرْئِيان بوو. نەقلی حەرەکەی هەمزەکراو وەحەزف کرا( يُرُوْن ) بۆ جەمعی مزکرە. بەضمەی (ی) لەگەلّ (ری) وسکونی واوی

جەمعی (**أصله يُرْئِيِيُونَ حذفت بعد نقل حركتها فصار يُرِيُونَ**) (يُرُونَ) ئەسلەکەی (يُرْئِيونَ) بوو. وەکو (یکرمون) حەزفی هەمزەکەی کرا لە دوای نەقل کردنی حەزەکەی بۆ حەرفی پێش خۆی. جابوو بە یُرِیُون(**فنقلت ضمة الياء إلى الراء فحذفت للساكنين فصار يُرُونَ على وزن يُفُونَ**) يُرِيُون نەقلی ضمه ی (ی) کرا بولای (ری) پاشان (ی) حەزف کرا لەبەر التقاء الساکنین لە نێوان (ی) واوی جەمعی: بوو بەیُرُونَ لەسەر وەزنی یُفُون. بەضمەی (ی) و (فی) کەواتە لەپیتەکانی ئەسلی تەنها (ف) ماوە( إراءَ ةً) ئەمەش مەصدرە بۆ (أَری) (**الأصل إرآياً كافْعالاً**) ئەسلی (إراءة)ی (إرْاياً) بوو وەکو إفعالاً وإکراماً (**قلبت الياء همزة لوقوعها بعد الف زائدة طرفا**) واتە قەلب (ی) کرا بە هەمزە لەووشەی (إرْايًا) چونکە ئەم یێیە کەوتە پاش ئەلفی زیاد. لەدواوە. بوو بە إرْءءً (**وحذفت الأولى بعد نقل حركتها إلى ما قبلها**) پاشان حەزفی هەمزەی ئەوەلی کرا (کەعەین الفعله) لە دوای نەقل کردنی حەرەکەکەی بۆ ماقبلی (**وعُوِّضَ عنها التاء فصار إرائةً**) پاشان لەجیاتی هەمزەی حەزف کراو (تی) ی مەصدر مان هێنا لە ئاخرمان دانا بوو بە (إرائةً) (**وإراءً بلا تعويض**) وە دروستە إراءً بخوێندریتەوە: بەبێ دانانی (ة) لەجیاتی هەمزە واجب نەبوو لێرەدا: یەك پرسیار دەکات. بۆ دانانی (ة) لە (إقامةً) واجبە بەڵام لێرە واجب نیە کە هەردووکیان مصدەری یەك بابن: لەوەڵامدا دەفەرموێ: (**ولما حذفت الهمزة من فعله ايضا لم يلزم التعويض** ) واتە لەکاتێك کە حەزفی هەمزەی کرا لە فعلەکەش کە (أَری یُری) بوو. هەروەکو لە مەصدەرەکەی کرا کە (اراءً) پێویست نەبوو لەجیاتی هەمزەی (ی) دابندرێ کما فی إقامه. وەکو واجبە لەم مصدەرە کە إقامة (ی) لەجیاتی عەین الفعلەکەی دابندرێ. کە ئەسلەکەی (إقواماً) بوو. وەکو اکراماً (**التزموا الحذف والتعويض في تعزية وإجازةٍ واستجازةٍ** ) واتە زانایانی عیلمی (صرف) بەواجبی دەزانن حەزف کردنی حەرفی علله وەدانانی (تی) لەجیاتی ئەم حەزف کراوە: لەم سێ مصدرە : یەکەم تعزیة کە مەصدەری بابی تفعیل)ە ناقیصە: وە دووەم (إجازة)مەصدر ی بابی افعالە. وسێیەم

(إستجازة)کە مصدرێ بابی (إستفعال)ە وە هەردوکیان (أجوف) ن (تعزیة) ئەسلەکەی تَعْزِيّ بوو: فعلەکەی عزّی وەکو (فرّح) یەك لەم دوو ییە حەزف بکە: یان هی لام الفعل هەندێکیان دە لێن ئەمە حەزف ناکرێ یان هی مەصدرە. ئەوجار (تی) لەجیاتی دابنێ: دەبێتە(تعزّیة). وەهەم دوانی تر. ئەسلەکەیان إجوازاً واستجوازاً. وەکو اکراماً واستخراجاً. نەقلی فەتحەی واوە کەمان کرد بۆ ماقبلەکەیان. وەقەلب کران بە ئەلف. التقاء الساکنین رویدا لەنێوان هەردو ئەلف: یەکەمان حەزف کرد. پاشان (تی) لە جیاتی داندرا: بەواجبی( **وقد جاءفهی تُنزی دلوها تنزیّاً)** واتە کەم جار هاتووە کە (ی) حەزف نەکراوە وەتی زیادنەکراوە وەکو ووشەی تنزیّاً. وەکو تفریحاً. بەلاّم ئەمە کەمە( **وإراية بالياء نظراً إلى انّ التاء اخرجتها عن الطرفية)** واتە دروستەلەم مصدر (إراية) بخوێندرێتەوە. بە تەعویزی (تی) وە قەلب ئەم ییەش نەکراوە بەئەلف. چونکە وا تەماشادەکرێ کە ئەم (تیە) وای کردووە کە (ی) بەکەوێتە ناوەراستی ئەم ووشەیە: وە دەری کردووە لەوەکە لە دوایی بێت. وە شتێکی دیارە. ئەگەر (ی) لە (طرفي) نەبێ: قەلب ناکرێ بەئەلف لێرەدا: وە ئەوەی کە قەلبی دەکات . هیچ حیساب بۆ (تی)ی ناکات. چونکە ووشەیەکی سەربەخۆیە جیاوازە ( **فهو مُرٍ)** ئیسمی فاعل لەماددەی (رأی) لەبابی أفعال (مُرٍ) دەبێ **(أصله مُرْئِيٌ)** ئەسلەکەی مُرْئِيٌ. وەکو مکرم، نەقلی حەرەکەی هەمزەمان کرد بوو ماقبلەکەی وەحزفمان کرد بۆ سوکی. وە ضمە لەسەر (ی) کرا بوو بە (مُرٍ) لەسەر وەزنی {مُفٍ} **(مُريان)** بۆ جەمعی مزکرە ئەسلەکەی مُرئیان بوو **(مُرُوْن)** بوو جەمعی مزکرە ئەسلەکەی مُرْئِيُوْن بوو وەکو مکرمون: نەقلی حەرەکەی هەمزەمان کرد بۆ پێشیو حەزف کرا جا لە دوای لادانی حەرەکی (ی) بۆ پێش ئەویش حەزف کرا لەبەر التقاء الساکنین بوو بە مُرُوْن)ە **(مُرِيَة مُرِيتان مُرِيات)** ئەمەش بۆ مؤنثە ئەسلەکەیان مُرئیة مُرْئیان مُرْئیات. لەهەموان نەقلی حەرەکەی هەمزەکراوە. وە حزف کراوە **(وذاك مُري أصله مُرْئَيٌ)** تۆ دەلێیت لە دروست کردنی ئیسمی مفعول لەماددەی (رأی). لەبابی إفعال مُرىً. ئەسلەکەی مُرْئَيٌ بوو. وەکو مکرَم بەفەتحەی

پیتی پێش ئاخرەکەی. نەقلی حەرەکەی هەمزەمان کرد بۆ پێش خۆی، وە حەزف کرا لەبەر سوك کردنی ووشە: بو بە مُرَيٌّ (یی) متحرك ماقبل مفتوح قەلب کرا بە ئەلف. التقاء الساکنین بوو لەنێوان ئەلف وتنوین حەزفی ئەلفەکمان کرد. بو بە مُرىً لەسەر وەزنی مفىً (مُرَيان) تەثنیەیە ئەسلەکەی مُرْئیان بوو. هەمزە لا دراوە (مُرَوْن) جەمعە، ئەسلەکەی مُرْئیون بوو وەکو (مکرَمون) هەمزەکەی حەزف بکەو (یی) بکە بەئەلف وحەزفی بکە لەبەر التقاء الساکنین. بوو بە مُرَوْن لەسەر وەزنی مُفَوْن: (مُراة) ئەمەش بۆ مؤنثە. ئەسلەکەی مُرئیة حەزفی هەمزەکەی کراوە (یی) قەلب کرا بە ئەلف: بوو بە مُراة (مُراتان) ئەسلەکەی مُرئیتان بوو وەکو مکرمتان. حەزفی هەمزەی کرا وە (یی) قەلب کرا بە ئەلف(مُرَیات)بۆ جەمعی مؤنثە. ئەسلەکەی مُرئیات. وەکو (مکرمات) نەقلی حەرکەی هەمزە بکەو حەزفی بکە (أرِ أصلە تأری ) تۆدەڵێیت لە ئەمری مخاطب لەم مادديە لەبابی إفعال (أرِ) بەفەتحەی هەمزەو کەسرەی (ری). ئەسلەکەی تُأری بو . (تی) لادە وئاخرەکەی مجزوم بکە بە حەزفی (ی) دەبێتە (أرِ) لەسەر وەزنی (أفِ) (أرِیا) ئەسلەکەی تُأریان. (تی)ی مضارعي لادە لەگەڵ نونی ئیعراب دەبێتە (أرِیا) (أرُوا) ئەسلەکەی تَرْئیون) بو وەکو (تکرمون) هەمزکەی حەزف بکە دەبێـە تُرِیون. ضمە ی (ی) نەقل بکە بۆ ماقبلی. دەبێتە تُرُون. تی لادە لەگەڵ نونی جەمعی. وە هەمزە قطعەکەی بگێرەوە. دەبێتە أرُو لەسەر وەزنی أفوا (أری) بۆمفردی مؤنث مخاطبە ئەسلەکەی لە دوورەوە (تُأرْئیین) بوو. وەکو تأکرمین. هەمزەی الفعل لادە. دەبێتە تُأریین. پاشان (ی)ی لام الفعل لادەکە هی ییەکەم: دەبێتە تُأمرِینَ. ئەوجار تی مضارعي ونون لەئاخری لادە (دەبێتە) ( أري) لەسەر وەزنی (أفي) (أرِیا) ئەسلەکەی تأرئین بوو( أرِینَ) بۆ جەمعی مؤنثی مخاطبە. ئەسلەکەی تُأرْئینَ بوو وەکو تُأکرِمْنَ هەمزە عەین الفعل حزف کرا. دەبێتە تأرین (تی) مضارعي لادە دەبێتە اَرینَ علی وزن أفِلْنَ أرِین لەسەر وەزنی أفْلَنَ یە چونکە تەنها عەین الفعلی حەزفِ کراوە( **وبالتأکید أرِینّ** ) تۆ دەڵێیت لەکاتی تەئکیدکردنی ئەم ئەمرە بەنونی ثە قیلە اَرِینّ. ئەسلەکەی (أرِ) بوو کەنونی تەئکید

هات لام الفعلی گێراوە (أَريانّ) بۆ تثنيە (أُرُنَّ) بوو جەمع ئەسلەکەی (اروا) بوو : کە تەئکید کرا ألتقاء الساکنین روی دا لەنێوان واوی جەمعو نونی تەئکید. ئەم نونە حەزف ناکرێ، واوەکەمان حەزف کرد. چونکە ضمە دەلالەتی لەسەر دەکات: بو بە أرُنّ. لەسەر وەزنی أَفُنَّ ( اُرِنّ) بۆ مفردی مؤنث مخاطبة ئەسلەکەی (اَري) بوو تەئکید کرا. بەم نونە. وە یی لاچو چونکە کەسرەی (ری) ماوە دەلالەتی لەسەردەکات (أَرِيانِّ) بۆ تەثنیە(أَرِينانِّ) بۆ جەمعی مؤنث ئەسلەکەی ارينَ بو تەئکید کرا بە نونی گران بوو بە ارِينَنَّ. وە ئەلفەك زیاد کرا لەنێوان ئەم نونانە. وەهی تەئکید مەکسور کرا(**وبالخفيفة اَرِيَنْ**)بۆ مفردی مذکرە (ی) گەراوەتەوە (أُرُنْ) بۆ جمعە: واوی جەمع لاچو لەبەر التقاء الساکنین. ومیسالی تەثنیە وجەمعی مؤنث لە خفیفەی نابێت (**وتقول في النهي لا تُرِ**) تۆ دەلێیت لەکاتی (لا)ی نەهی بخیتەسەر ئەم مضارعە لەبابی إفعال (لا تَرِ) هەمزەی عەین الفعل لەپێشتر حەزف کراوە. وئەم جارە (لا) ێنەهی لام الفعلیحەزف کرد (**لا تُرِيا لا تروا الخ**) لەوانەش نونی حەزف کردوە (**لاترى لاتريا لاترين**) بۆ موءنثە ئەمە نونی جمعی موءنثە لاناچێ (**وبالتأكيد لاترينّ لاتُريانّ لاتُرينّ**) ئەم سێ میثالە بۆمذکرن .لەکاتی (لا)نەهیلە گەل نونی تەئکید بخەیتە سەریان وادیارە لام الفعل هاتوتەوە بەهۆی نونی تەئکیدەوە لەمفردی وەلە جەمعی مذکر واو نەگەرایەوە چونکە ضمە دلالەت دەکات (**لاترنّ لاتريانّ لاترينانّ**) ئەمەش میثالی موئنثانە لەمفرددەکەیان (ی)حەزف کراوە کەسرە لەسەر (ێ) شاهیدە بۆیە لەکۆتای فصلی مهموزی باسی بابی أفتعال دەکات ودەفەرموێت (**وتقول فی افتعل من مهموزالفاء أيتال كأختار**) واتە تۆ دەلێیت لەبینای بابی أفتعال لە مهموز الفای (اجوف) أیتال وەکو أختار واتەحوکمی مهموز الفای اجوف لەم بابە وەکو حوکمی ئەجوفی بێهەمزە وایە لەم بابە (ایتال)مجرددەکەی (أوَل)یە نیشانەی بابی افتعال زیاد بکە دەبێتە أءتَول وەکو اجتمع واختار واو قەلب کرا بەئەلف بو بە(اتال)هەمزەی دوەم بکە بە(ی)وەکو أيماناًبو بە (أيتال)ە (**وأيتلى كأقتضى**) تۆ دەلێیت لە دورست کردنی بابی افتعال لە مهموز الفای ناقص

ایتَلی وەکو اقْتضی. واتە مهموز وغەیرە مهموز حوکمیان بکە لە معتل اللامی ئەم بابە : إیتلی. ئەسلە مجردەکەی (اَلَوَ)یە هەمزەو (تی)ی بو زیاد بکە دەبێتە اِئْتَلَوَ وەکو اجتمع واقتضی. واو لە پلەی پێنجەم بیکە بە (ی) پاشان بیکە بە ئەلف دەبێتە إئْتَلَی. وەهەمزە ساکن وما قبل مەکسور بیکەی بە (ی) دەبێتە ایتلی: یەك پرسیار دەکات بۆچی مصنف رحمە اللە) لەم دوایەدا باس لەم دوو صیغەیە دەکات لەوەلاّمدا دەفەرموی (**وخصَّ هذا الباب بالذكر**) واتە مصنف رحمەتی خوای لیّ بێت تایبەتی کرد ئەم بابە کەبابی افتعال/ە بەباس کردن لەم دوایەدا( **اشارةً إلى أن الياء المبدلة من الهمزة لا تقلب تاءً**) تاکو ئاماژە بێت وبزاندری کەلێرەدا دوو جورە (ی) هەیە. یەکەم ئەوەیە کە (مبدل/ە لەهەمزەی. واتە هەمزەیە کراوە بە (ی) جائەم جۆرە ییە ناکریّ بەتی وەکو ئەم دوومیسالەکانی باسکراو کە (إیتالی وإیتَلی) بون. کە هەمزەکەیان کراوە بە (ی). وە ئەم ییە ناکریت بە (تی) ودەغم بکرێت: وەییی دووەم ئەوەی کە قەلب دەکریّ بە (تی) وە دەغم دەکریّ کە دەفەرموی( **كما في إتَّسَرَ** مجردەکەی (یسر)ە بوو نیشانەی بابی أفتعال زیادکران. بوو بە أیتَسَرَ)ە. پاشان (یی) کرا بە (تی) وە دەغم کرا لەتی)ی دووەم بوو بە اِتَّسَرَ. بەلاّم لەمیسالەکانی ئێمە دا دروست نیە(یی) بکریّ بە (تی) وە دەغم بکریّ چونکە لەپێشان باسکرا. ئەم ییەی کە (مبدل)ە لەهەمزە ناکریّ بە (تی) چونکە هەمزە بەخۆی ناکریّ بە (تی) کەواتە بەدەلەکەش ناکریّ بە (تی) بەلاّم ئی ئەوەی کە ئەسلە وەکو یسر) وەیان مبدل)ە لەواوی ئەوان دەکرێن بەتیّ (**واتّزَرَ في أيتزَرَ خطأ**) واتە ئەوەی دەلێیت اتّزَر. ئەسلەکەی ایتزر)ە بوو وە (یی)ی مبدل/ە لەهەمزەکە ئەسلەکەی (إاتَزر)ە بوو بیّ کراوە بە اتّزر ئەمە هەڵەیە: قانون وایە. هەر ایتزر بێت وە ئەم ییّ نەکریّ بە (تی): یەك دەڵێت ئەدی بۆ (اتَّخَذَ)ە هەمزەی کراوە بەتیّ وەدەغم کراوە جا دەفەرمویّ (**واتَّخَذَ مِن تَخَذ بمعنى اَخَذَ**) واتە اتَخذ کەبابی افتعال/ە مجردەکەی (تخذ)یە: نیشانەی بابی افتعال زیاد بکە. دەبێتە اِتْتَخَذَ: جا (تی) لە (تی) دەغم بکە دەبێت اتَّخَذَ) وە بەمانای اَخَذ)یە بەلاّم حەرفی یەکەمیان جیایە. واتە لەمەی (تێبە) هەمزە

نیە(**ویقال منه ایتَخَذَ**) یانی هەرکاتی بابی افتعال دروست بکەی لە (أخذ)ی دەگوترێ ایتخذ: چونکە کە هەمزەوتیێ زیاد کران. دەبێتە اِتّخذ)ە جا هەمزکەی بکە بە (ی) دەبێتە ایتخذ. دروست نیە (ی) بکرێ بەتی وە دەغم بکرێ.

لەکاتێك (مصنف رحمه الله) باسی مەهموزی تەواو کرد. هاتە سەرباسی ئیسمی زمان ومەکان. فەرموی (**فصل في بيان اسمي الزمان والمكان**) ئەمە فەصلێ کە باسو بەیانی ئیسمی زەمانو مەکان دەکات( **وهو موضوع لزمان أومكان بأعتبار وقوع الفعل فيه مطلقاً**) ئیسمی زەمان ومەکان دروست دەکرێن لە فعل داندراون بۆ ئەوە دەلالەت بکن لەسەرکاتو شوێنی ئەم روداوە. بەبێ بەستنەوە بەهیچ شت وەکو خۆی دەفەرموێ (**من غير تقييد بزمان أومكان معينين**) واتە بەبێ ئەوەی ببەسترێ ئەم روداوە. بەکات وشوێنی دیارکراو( وفاعل ومفعول )وە هەروەها بەبێ ئەوەی ببەسترێ بە فاعل ومفعولی دیارکراو جافەرموی لەبەر ڕودانی ئەم فعلە ناوبراوە بەم ناوەناو دەبری: کەواتە (**یومك طيب و مكانك حسن**) دەرچون. چونکە بونیان بە زمان ومکان لەبەر هیچ روداو نیە. وەهەروەها (محشر) دەرچوو. چونکەبەکاتو شوێنی دیارکراو دەڵێن. وە ئەمەش بزانە ئەم ئیسمەی زمانو مەکان مشترەکە لەنێوان هەردوکیان. بۆ وێنە (مجلس) بەکاتو شوێنی دانیشتن دەڵێن وەهەروەها (مقتل الحسين) ﷺ دەگونجێ بەروژی عاشوراء بڵێن وەبەشاری کربلا بڵێن: ئینجا کە پێناسەی بۆ کردن. وە دەیەوێت باسی چۆنیەتی دروست کردنیان بکات. چونکە بێگومان ئەم دوانەش وەکو باقی مشتەقاکانی تر لە مصدەری وەردەگیرێن. بەڵام هەندێك راستەوخۆ وەکو ما وە ئەوانی تر بەواستە: جا ئەمانەش کەلە مەصدەری وەردەگیرێن بەهۆی مضارعیەوەدیەوە شتێکی رونە کەعین الفعل لەمضارع سێ جۆرە. یان سەرداره یان بۆرەیان ژێر. جا دەفەرموێ (**وهو من يَفْعِلُ بكسر العين على مَفْعِلٍ بكسره**) واتە هەریەك لەم ئیسمی زەمانو مەکانە. ئەگەر دروست بکرێن لەفعلە مضارعەکی. کەلەسەر وەزنی يَفْعِلُ) بێت. وەکو یضرب. بەکەسرەی عەین الفعلەکەی. بێگومان ئیسمی زمانو مەکان لەسەر وەزنی مَفْعِل/ی

دەبێت. جائەم مضارعە صحیح بی( **کالمجلس**) وەکو المجلس. ئێستا ئەم ووشەیە لە (یجلس) وەرگیراوە بەکەسرەی عەین الفعلەکەی کەپیتی لامە: (یی) حەرفی مضارعی لادە وە میمێکی مفتوحی لەشوێن دابنێ دەبێت المجلس بۆ کات‌و شوێنی دانیشتن وەیا ئەم مضارعە (أجوف) بی وەکو دەڵێ (**والمبیت**) ئەسلەکە مبیت وەکو مضرب لەیبیت وەرگیراوە کەمعتل العین/ە. وەیا مضاعف بی یان مهموز بێت. وەکو (مفرّ) لە (نَفرّ) وەرگیراوە. وە (مَأْزِرْ) لە (یَأْزِر) وەرگیراوە کەمضارعی هەموان: لەسەر وەزنی یضرب)یە. وە حەرفی مضارعي لادراوە. ومیمێکی مفتوح لەشوێنی داندراوە: وە عەین الفعلەکەش هەروەکو خۆی بەمەکسوری ماوەتەوە (**ومِن یفعَل ویَفْعُل بفتح العین وضمها علی مَفْعَل بفتحه**) واتە هەرکاتێك ئیسمی زەمان ومەکان دروست بکرێن لە فعلە مضارعەکی کە لەسەر وەزنی یفعَل)یٚ بێت بەفەتحی عەین الفعل کەی: یان لەسەر وەزنی یفعُل)ی بێت ضمەی عەین الفعلەکەی. لەم دوشوێنە لەسەر وەزنی مَفْعل)ی دەبێت. بە فەتحەی عەین الفعل کەی (**للتوافق في مفتوح**) لەبەر موافقەی ئەم ئیسمە زەمان‌و مەکانە لەگەڵ ئەم فعلە مضارعەی : کە حەرەکەی عەین الفعلی مضارعی مفتوحە. واتە ئیسمەکەو فعلە مضارعەکە وەك یەك بن لەفەتحەی عەین الفعلدا( **وتعذره في مضمومه** ) وە موافقەش قەدەغیە لەم مضارعەی کە مضموم العین/ واتە نەگونجا کە ئیسمی زەمان‌و مەکان موافقی مضارعەکە بێ لە مضارعی مە ضموم العین. وەکو لە دوەکانی تر گونجا( **لرفضهم مَفْعُلاً** )چونکە ئەگەر ئەمەش وەکو مضارعەکەی مضموم العین بێت دەبێتە (مَفْعُل) وە عەرەبەکانیش فەرمۆشیان کردووە لەزاراوەی خۆیان هەر ئیسمێك لەسەر وەزنی (مَفْعُل)ی بێ (**إلا مَعُوناً ومَکْرُمًا**) مەگەر ئەم ئیسمە کە معون ومکرم)ن کەهەردوکیان لەسەر وەزنی مَفْعُل)ی هاتون ئەم دوانەش یان جەمعن. وەکو (فرّاء) دەفەرموێ یان مصدرن بەمانا إعانة وإکرام/ن. جاهەر چونێك بێ کەمە: وەکەم وەکو نەبوو وایە یەك ڕەخنە دەگرێت وە دەڵێت. بۆ چی لێرە مفتوح کرا. بۆ مەکسور نەکرا. دەفەرموی (**ولم یکسر لأن الفتح أخف**) یانی ئیسمی زمان و مەکان

مەکسورنەکرا. لەم مضارعەی کە عەین الفعلی مضمومە. وەکو ینصر یقتل) نەمان کرد بە منصر ومقتل. چونکە فەتحە سوك ترە لەکەسرەی. ئینجا هاتەسەر میسالەکان( **کالمذهَب**) ئێستا مەزهەب لە یزهەب وەرگیراوە. مضارعە کە مفتوحە وەئیسمی زەمان ومکانیش مفتوحە ( **والمتقل** ) لەیقتُل وەرگیراوە مضارعەکە مضمومە بەڵام ئیسمەکان مفتوح کراون( **والمشرب**) لەیشرب. وەرگیراوە ماضیەکەی مەکسورە ومضارعەکەی مفتوحە وئیسمە زەمانو مەکانیش مفتوحن. وە ئەمانە هەمویان صحیحن (والمقام) ئەمەش لە بابی یەکەمە وەکو یقتل. بەڵام (ئەجوف)ە ئەسلەکەی (مَقْوَم)بوو دوای کراوە بە ئەلف. وەکو (اقام)ەی کەلەپێشان باسکرا: یەك رەخنە دەگرێتو دەڵێت: تۆ گوتت هەرکاتێك مضارعەکە بە ضمە یان فەتحەیی عەین الفعل بوو ئیسمی زەمانو مەکان لەسەر وەزنی مفعل)ی دەبن بەفەتحەی عەین الفعلی. وەئێستائەم هەموو شتانە مضارعەکەیان بەضمە و فەتحەیە. وەئیسمی زەمانو مەکانیشیان لەسەر وەزنی مفعل)یّ بەکسرەی عەین الفعل هاتووە لەوەڵامدا دەفەرموێت: (**وشَذ المسجِد والمشرق والمغرِب والمطلِع والمجزِر والمرفِق والمسکین والمنسِك والمنبت والمسقِط بالکسر**) واتە ریزپەڕە. ئەم هەمووشتانە کە بەکەسرەی عەین الفعل هاتون لە ئیسمی زەمان و مەکان چونکە دەستور وایە کە بەفەتحەی عەین الفعل بوانە (**إذا المجزر من مفتوح العین وما سواها من مضمومة**) چونکە مجزر مضارعەکەی مفتوح العین لەبابەبی چوارمە: وە باقیەکانیتر مضارعەکەیان مەضموومە لەبابی یەکەمن: یاسا وابوو لەسەر وەزنی مفعل بوانە. بەفەتحەی عەین الفعل: وە ئێستا بەکەسرەی عەین الفعل هاتون هەمویان شازن واتە ریزپەڕن (**وحکي في المسجد والمطلع والمسکن الفتح**) نەقل کراوە لە هەندێك عەرەبەکان لەم سێ ووشەیە کە المسجد المطلع المسکن کە بەفەتحەی عەین الفعل خویندراو نەتەوە. لەم کاتە بەکارهێنا نیان بەپێ یاسای خۆیانە ( **واجیز في کلها**) وەئەم فەتحە دروست کراوە ورێی پێدراوە لەهەر هەموو ئەم ووشانە کەیانزدە ووشەیە: ئەمەی کە دروست دەکات مامۆستا (فراء)یە رحمە الله

(**هذا إذا كان الفعل صحيح الفاء واللام**) واتە ئەوەی کە گوتمان کە ئیسمی زەمان وەمەکان لەم شوێنانە مفتوحەو وە لەم شوێنانە مەکسورە: لەکاتێك بەم شێوەیە: کەئەم فعلە مضارعەی ئەم ئیسمە زەمانومەکان لی دەروست کراوە: فاء الفعل ولام الفعل حەرفی صحیح بێت. وەحەرفی عللەنە بی وەکو میسالمان بۆ هێنا لە أجوف ومضاعف ومهموزیش لەگەڵدابو (**فمن المعتل الهاء مكسور عينه ابداً**) واتە ئەم فعلەی کە معتل الفایە بەلاّم واویە. واوەکەش حەزف کراوە. ئیسمی زمان ومکان لەم جۆرە فعلە مەکسور العین/ە بەدەوام (**كالموضوع والموعد**) ئیستا (موضع) ئەسلەکەی یوضع بوو بە کەسرەی عەین الفعلی. بەلاّم کەواو حەزف کرا. ضاد مفتوح کرا. لەبەرگرانی حەرفی حەلقیّ: (موعِد) ئەسلەکەی (یوعِد) بوو: واوحەزف کرا بەلاّم عەین وەکوخۆی بەمەکسوری مایەوە.ئینجا لەهەردووکیان حەرفی مضارعي لادراوە: ومیمێکی مفتوح لە ئەوەلیەوە داندراوە بەلاّم معتل الفاي يائی. وەکو (مبقَظ) هەندیك دەڵێن مفتوح العین/ە ئیسمی زمان ومکان(**وشذ مْوجَل بالفتح**) ریزپەڕە (موجَل) کەبەفتحەی عەین الفعل هاتووە.چونکە موجل معتل الفایە واویە. یاساوا بوو بەکەسرەی جیم بوایە(**ومن المعتل اللام مفتوح عينه أبداً**) واتە ئەم ئیسمە زەمانەی ومەکانەی کە دروست دەکریّ لە فعلە مضارعەکی کە معتل اللام/ە عەین الفعلەکەی مفتوحە بە دەوام: جا فعلە مضارعەکەی هەرچۆنی هەبێت: واوی بێت یان یائی (**كالمأوى والمرمى**) ئێستا مأوای مضارعەکەی یأوی بوو بەکەسرەی عەین الفعل. حەرفی مضارعی لادەوە میمێکی مفتوح لە شوێنی دانی وعەین الفعلەکەی مفتوح بکە لامەکەی بکە بەئەلف.دەبێتە مأوی: ئەمە ئەگەرچی لفیفی مقرونە. بەلاّم لەپیشان فەرموی.حوکمی ئەم لەفیفە وەکو ناقص وایە: (المرمی) ئەسلەکەی یَرْمي بوو. (یی) لادراوە میمەکی مفتوح لەشوێنی زیاد کرا. وە عەین الفعل مفتوح کرا وەلامەکەی قەلب کرا بە ئەلف. بوو بە (مَرْمی) ئەمە حوکمی معتل الفاء ومعتل اللامی بوو( **ومعتلهما كمعتل اللام**) واتە ئەم زەمانەی کە دروست دەکرێت لە فعلێك کەمعتل الفاء و لامە. واتە لە فیفی

**(مفروضه)** حوکمی وەکو حوکمی معتل اللامی وایە کەعەین الفعلی مفتوحە. وەلام الفعلی قەلب دەکرێ بەئەلف. وەکو (مَوْقی) ئەسلەکەی (یوقی) بوو **(وقد تدخل علی بعضها تاء التأنیث)** واتە هەندێك جار دەچیتەسەر هەندێك لەئیسمی زەمانو مەکان (تی)ی تەئنیس **(إما للمبالغة)** یانی داخیل بونی ئەم تێیە بەسەر ئەم جۆرە ئیسمانە: یان بۆ دەرخستنی موبالەغەیە لەهەبونی ئەم فعلە لەم شوێنانە **(أو لأرادة البقعة)** یان لەبەر ئەوەیە کەئیرادە شوێنەکە کراوە بۆ تایبەت. کەواتە لەم کاتەدا بەئیسمی زمانو مەکانی اصطلاحي حسیب نین چونکە لەیاسا لایانداوە ( **کالمَظَنَّة**) بۆ کاتو شوێنی گومان بەبونی شت. ئەسلەکەی یظُن بوو بەضمە ی عەین الفعل: میمێکی مفتوح لەشوێنی حەرفی مضارعي داندراو وعەین الفعل مفتوح کرابەقیاس . وە (تێ)ی تەئنیس زیادکرا: بەلآم بەخیلافی قیاس (والمقبرة) بۆ شوێنی شاردنەوەی مردوو واتە قەبر. مضارعەکەی یقبُر بوو (ی) لادرا ومیم داندرا وەعەین الفعل مفتوح کرا بەقیاس. (تێ) زیادکرا بە غەیری قیاس **(والمشرقة)** بۆ شوێنی دەرکەوتن ورۆژهەلآت دەگوترێ ئیعلالی وەکو هی پێش وایە **(وشذ المظِنّة بالكسر)** واتە شازەو لەرێز دەرچووە. مظِنة. بەکەسرەی (ظ) چونکە مضارعەکەی مضمومە. بەپێی یاسا لەئیسمی زەمان ومەکان مفتوح دەبێت **(والمقبرة والمشرقة بالضم)** وەهەروەها ئەم دووەش شازن بەضمە ی عەین الفعلي چونکە ئەمانە لەبابي یەکەمن ئیسمي زەمان ومەکان لەوێدا مفتوح دەبێت **(والقیاس في الكل الفتح أیضاً)** دەستورو یاسا لەم سێ ووشەیە فەتحەی عەین الفعلە( **لضمها** ) چونکە عەین الفعلەکەیان مضمومە لەمضارعي. وە هەر فعلێك عەین الفعلي مضموم بێ ئیسمي زەمان ومکان لەوێدا مفتوح دەبێت: لێرە دەرکەوت کەئەم ووشانە دوجار شازن. یەکەم لەبەر (تێ)ی تەئنیس. دووەم کەمفتوح نینە: ئێمە گوتمان ئیسمي زەمانو مەکان نابێ تایبەت بکرێن: وە لێرەدا ئەم جۆرە ئیسمانە ئەگەر تایبەت نین وە بەضمە ش بخوێندرێنەوە شازن. وەکو باسمان کرد. بەلآم ئەگەر (مقبُرە) ومشرُقە بەقەبرستانو رۆژهەلآتي بلێین. ئەوە شاز نین، چونکە لەوکاتی

هەر ئیسمی زەمان ومکان اصطلاحي نین. جا مصنیف دەفەرمویت **(وإن أريد بهما المكان المخصوص)** واتە ئەگەر ئیرادە بکرێت بەم دوو ئیسمەت کەمقبُرە ومشرُقە)یە شوێنەکی تایبەتو دیارکراو (کالقارورة) هەروەکو قارورە. لەئەسڵدا بەهەموو (ظرفێکی) دەگوترا پاشان تایبەت کرا بەشوشەی شتی تێ دەکەین **(لا مفهوم المكان الذي يُقبَر فيه ويُشرَق فيه)** ئیرادە نەکرێ بەم دوو ئیسمە مانای ئەم شوێنە کە مردووی تێ ئەشاردرێتەوە. وە رۆژو روناکی تێدا هەڵدێت بەبێ تایبەت کردن. **(فلا شذوذ)** یانی لەم کاتەکە تایبەت کراون. وە بەهەمو شوێن ئەگوترێت. بەضمەش شاذنین وە بەڵکو قیاسە چونکە لەم کاتەکە تایبەتن بەقەبرستان وروژهەلات: ئیسمي مکانی اصطلاحي نین. وە پێیان ناگوترێ لە یاسا لایانداوە: وەکو لەپێشان باسکرا. کە (المسجد) بەکەسرەی جیم شازە. بەم مەرجە کە بەشوێنی سوجدە بگوترێ. بەڵام ئەگەر تایبەت بێت بەم خانوەی کەپێی دەگوترێ مزگەوت. بەهیچ شێوەیەك شازنیە چونکە لەم کاتە تایبەت کراوە: گوتمان ئیسمي زەمان ومەکان لەمضارعي مەکسور العين مەکسور دەبێ. وە لەمفتوح العين ومضموم العين مفتوح دەبێ. وە ئەمانە ثلاثي مجرد بون ئەم جارە دێتە سەر غەیری ثلاثي مجرد کە دەکات ثلاثي مەزید روباعي هەردوك: وە فەرموی **(ومما زاد على الثلاثة كأسم المفعول)** ئەمە عطفە بەسەر **(وهومن يفعل)** کەواتە ئیسمي زەمان ومکان. لەم فعلانەی کەزیادن لەسەر سێ حەرف. جاثلاثي مەزیدی یاروباعي مەزیدو مجرد بێت. لەسەر وەزنی ئیسمي مفعولي بابی خۆی دەبێت. **(كالمُدْخَل والمُقَام)** ئێستا مدخل ومقام ثلاثي مزیدن ولەبابی افعال)ن. فعلەکەیان. ادخل یدخل وە اقام یُقیم) بوو. وە حەرفی مضارعەکەی لادەوە میمیکی بور لەشوێنی دابنێ: وە حەرفی پێش ئاخري مفتوح بکە. ومقام مفتوح) بوو واوي کراوە بەئەلف وەکو ماضیەکەی: ئەمەش بزانە ئەم صیغە (إحتمال)ی چوار شتی هەیە: ئیسمي زەمانو مکان وە مصدرەي میمیي وئیسمي مفعول. وە بە قەرینە لێك جیادەکرێن لێرەدا باسي ئیسمي زەمانو مەکان گۆتابوو. بەڵام ئەم باسەش مناسبە لەگەڵ ئیسمي زەمانو مەکان:

لەبەر ئەمە بۆمان باس دەکات دەڵێ (**واذا كثر الشيء بالمكان قيل فيه مَفْعَلَةٌ من الثلاثي المجرد**) یانی هەرکاتێك شتێك زۆر بوو لە شوێنێك بۆ بەیانی زۆری ئەم شتە لەم شوێنە صیغەی (مفعله) دروست دەکرێ. بەسکونی (فی) وسێ فەتحە لەگەڵ (تێ)ی تەئنیس. کە ئەم صیغەیە ثلاثی مجرد وە ئەگەر ثلاثي مزید زیادەکان حەزف بکە. ئینجا میمیکی بۆ زیادبکە لەگەڵ (تی)ی تەئنیس(**كأرض مسبعة ومأسدة ومذئبة من الثلاثي المجرد**) واتە دەڵێت لەم جۆرە میسالانە أرض مسبعة) ئەرزێکە دروندەی زۆریتیدایە: (ومأسدة) ئەرزێکە شێری زۆر تێدایە. وە (مذئبة) گورگی زۆر تێدایە، ئەم سێ میسالە ثلاثی مجردن. چونکە بەم شێوەنە (**سبع اسد ذئب**) میمێك لە ئەوەلیەوە زیاد کراوە. وەتێ لە ئاخری زیادکراوە: (**مبطخة ومقثأة من مزيده**) ومبطخة ومقتأة مثالي ثلاثی مزیدن. ( **بحذف احدى الطائين والتائين والياء والألف** )واتە بەحەزفی یەك لەدوو (تێ)یەکانی (بطیخ)و یەك لە دوو (ثاء)ەکانی (قثاء)ی و(ی) لەبطیخ وئەلف لە قثاء)ی ئەمانە حەزف بکە. دەبێتە ثلاثی مجرد ئینجا میمێکی مفتوح لەگەڵ (تی) زیاد بکە، دەبێتە مَبْطَخَةَ ومَقْثَأة) یانی ئەم ئەرزە کالەك (گندورە)ی زۆرە وتەرۆزی وخیاری زۆرە. بەڵێ گوتمان ئەگەر ئەم ئیسمە ثلاثی مجرد بێت. میمێك وەتێ تەئنیسی بۆ زیاد بکە. وە ئەگەر ثلاثی مەزید بێ زیادەکان حەزف بکەو میمەکە و (تێ)یەکەی بۆ زیاد بکە: دەبێتە وەزنی مفعله. ماوە باسی ئەم ئیسمەی بکات. کە رباعی وخماسی وسداسیە. ئەم جۆرە ئیسمە بەهیچ شێوەك ناهێنە سەر وەزنی (مفعله) مەگەر بەحەرفی ئەسلی. ئەمەش ناکرێ. بەناچاری ووشەی بۆ زیاد دەکەین. کەبەیانی زۆری شتەکە بکاتو دەستکاری ئەمی ئێمەش نەکرێت، جا دەفەرموی (**ويقال في غيره**) دەگوترێ لەم ئیسمەی کە غەیری ثلاثی مجردو مەزیدە. جا روباعی بێ یان خماسی بێ یان زیاتر. ومەزید بێ یان مجرد (**كثير الثعلب**) ئەرزێکە زۆرمام رێوی تێدایە: ئێستا ثعلب رباعی مجردە، ناتوانین بیکەین بە مفعله) بەناچاری ووشەی (کثیر)مان بۆ زیاد کرد (**وكثير الجَحْمَرِش**) ئەرزە کە پیرەژنی زۆرە ئەمەش میسالی خماسی مجردە (**وكذا**

**مزیدهما**) وەکو رباعی مجردو خماسی مجرد وایە. مەزیدەکانیان یانی بۆ رباعی مەزید وخماسی مەزید. ووشەی (کثیر) زیاد بکە (واضافەی) بکە بۆ ئەم ئیسمە: وەکو بڵێت کثیر العصفور ئێستا (عصفور) رباعی مەزیدە بە واوێك. ووشەی (کثیر)ی بو اضافة بکە. وە هەروەها کثیر العضرفوت ئەم ووشەیە خماسی مەزیدە بە واویٚ ووشەی (کثیر) لە ئەوەلیەوە داینیٚ. لەجیاتی (مفعلە) مانایەکەی دەدات:

﴿**وأما إسم الألة: وهو مايعلاج به الفاعل المفعول**﴾ واتە ئیسمی ئالەت. ئامێرێکە وشتێکە. کەبەم شتە فاعل واتە کارکەر خەریکی کارێك ئەبێت لەشوێنێك کە مفعولە (**لوصول الأثر اليه**) بۆ ئەوی ئەم فاعلە بتوانیٚ نیشانەو ئەسەری کارەکەی بەم مفعولە بگەین بەهۆی ئەم ئامێرە (**كمِحْلَبٍ**) وەکو مِحْلَب. بەکەسرەی میمو سکونی حی وفەتحەی لام. کەئەمە یێکە لەمیزانەکانی ئیسمی ئالەت. ئەگینا لە راستیدا ئەمە ئیسمی ئالەت نیە. چونکە ئەم. بەم (ظرف) دەوتریٚ واتە بەم شتە دەگوتریٚ کە حیوانی تێدا دەدۆشرێت، بەڵام چونکە ئەمەش جۆرە یارمەتی دانێکە: پیٚ دەڵێن ئاڵەت (**ومِكْسَحَة بفتحتين**) با ئەمەش بزانین. کەئیسمی ئالاٚت دوو جۆرە. مشتق وجامد مشتق ئەوانەن کە لە فعلی ثلاثیمجرد متصرف دروست دەکرێت کە ئەم (قبل التاء) بەکەسرەی میمو سکونی کافو دوو فەتحە لەپێش (تیٚ) ئێستا مکسحە بەگەسکی دەڵێت کە ئامێرێکە بە هۆی ئەم ئامێرە فاعل کار دەکات لەم مفعولە کە شوێنی کارەکەیە، بۆ پاك کردنەوەی ئەم شوێنە (**ومفتاحٍ**) بەکەسرەی میمو سکونی (فی) وفتحەی (تیٚ) لەگەڵ ئەلفی زیاد . ئێستا مفتاح ئامێرێکە کە دەرگەی داخراوی پیٚ دەبێتەوە. بەهۆی خەریك بونی فاعیلێك: ئەم کارە: مفتاح واتە کلیلە ئامێری کردنەوە (**ومِصْفاة**) ئامێری پالاٚوتن. وەکو شیر پالیو وچاپارزن هتد (**أصلها مِصْفَية**) مصفاة. وەکو مفتاح نیە. چونکە ئەسلەکەی مصفیة بوو وەکو مکسحة (یێ) ی قەلب کراوە بەئەلف بو بە مصفاة: هەر ئەمەش بوو هۆی باس کردنی لێرەدا لەکاتێك ووشەی مرقات دەگونجا بۆ ئیسمی مکانو ئیسمی ئالەت ویستی رونی بکاتەوە. دەفەرموی (**وقالوا مرقات علي هذا**) واتە عەرب

